# بنەماکانی هەواڵنووسین

نووسینی: پرۆفیسۆر کورتیس ماکدۆگاڵ
وەرگێڕانی: هەندرێن شێرزاد سلێمان
پێشەکی و پێداچوونەوە و داڕشتنەوەی
م. هەڤاڵ ئەبوبەکر

ناوی کتێب : بنەماکانی هەواڵنووسین Interpreative Reporting
نوسین : پرۆفیسۆر کورتیس ماکدۆگاڵ
وەرگێرانی بۆ زمانی عەرەبی : پ.د.ئەدیب خەزوور
وەرگێرانی بۆ زمانی کوردی : هەندرێن شێرزاد سلێمان
پێشەکی و پێداچوونەوەی : م.مەڤاڵ ئەبوبەکر
چاپی یەکەم
دەرهێنەری بەرگ : ساسان
تایپ : لەیلا عومەر . سۆران عەبدوڵڵا
مونتاژ : سۆران عەبدوڵڵا
هەڵەچن : ئاواز ئیبراهیم . مونیرە نوری
تیراژ : ١٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن : ٧٧١
نرخی: ٤٠٠٠ دینار

لە بڵاوکراوەکانی بەشی چاپ و بڵاوکردنەوەی رادیۆ نەوا

NAWA PUBLISHER
e-mail:nawartv@yahoo.com
asiacell: 07702138962
sanatel :07311139387
media.t :0532107074

## پەیڤێکی کورت

کتێبی بنەماکانی هەواڵنووسین لەلایەن پرۆفیسۆر کۆرتیس ماکدۆگاڵ، مامۆستای ڕۆژنامەوانیی لەزانکۆی نۆرس وێستێرن ـی ئەمەریکا، لەژێر ناونیشانی (Interpretative Reporting)دا نووسراوە و لەبەربایەخی ناوەڕۆکەکەی بۆ جاری پێنجەم هەر لەئەمەریکادا چاپکراوەتەوە، دواتر لەساڵی ٢٠٠٠دا دکتۆر ئەدیب خەززور مامۆستاو سەرۆکی بەشی ڕۆژنامەوانیی لەزانکۆی دیمەشق، وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی. پاش دەستکەوتنی چاپە ئەمریکاییەکەی بەپێویستمان زانی سود لە هەردوو چاپە ئەمریکیی و عەرەبییەکەش وەربگرین، تا پرۆسەی وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی کوردیی شیاوتر گەڵاڵە ببێت، بۆیە بەپێویستمان زانی پێشەکییە عەرەبیەکەی پ.د. ئەدیب خەززوریش وەك ئەمانەتێکی زانستیی پەیوەست بەباتەکە دابنێینەوە، بەتایبەتیش کە پرۆسەی نووسینی هەواڵ لەمیدیای کوردیشدا زۆر لەمیدیای عەرەبیی پێشکەوتووتر نییە و بەدەست هەمان ئەو گرفتانەوە دەناڵێنێت کەلەوێدا ئاماژەیان بۆ کراوە.

هەڤاڵ ئەبوبەکر

## سەرەتایەك

لەگەڵ فراوانبوونی پانتایی زانیارییەکان و بچوکبوونەوەی زەوییدا، هەواڵەکان زیاتر دەبن .. پەیوەندیی و وابەستەیتی لە نێوان مرۆڤەکانی سەر زەمیندا زۆرتر دەبێت، رۆژنامەگەریی کاراتر دەبێت و رۆژنامەوانان زەمینەیەکی زیاتری روماڵکردنی رووداوەکانیان لەبەردەمدا دەکرێتەوە، سیستمە تۆتالیتاریی و تاکرەوییەکان بەرەو لەناوچوون دەچن و سیستمی دیموکراسیی و ژیانی مەدەنیی شوێنیان دەگرنەوە، هەر ئەمانیش دواجار روبەرەکانی ئازادیی رۆژنامەگەریی کراوەتر دەکەن تا ئاستی ئەوەی چیدی بستێك زەویی، چەکمەجەیەکی زانیاریی، دەرگایەك، پەنجەرەو دەلاقەیەك، نامێنن رۆژنامەوانان چاوی تیژو بیری کراوەو سەرنجی وردیانی نەخەنە سەر ... روداوێك نامێنێ بابەتییانە بۆ خەڵك نەگوێزرێتەوەو شتێکی پشتی پەردە تاریکەکان نامێنێتەوە تا لەپێناوی بەرژەوەندی گشتییدا بەهاوڵاتیانی رادەگەیەنن.

لەم سەردەمی تەکنیکی زانیاریی و ئاڵوگۆڕە خێرایانەدا، هەواڵەکان ئاشنایەتیمان لەگەڵ خۆمان و دەوروبەرو دنیادا بۆ زیاتر دەکەن، ئاگایمان بالاترو هۆشیارییمان هەستیارانەتر دەکەن .. ئاخۆ ئەم ژانرە گرنگە چۆن دەتوانێ بە چەند دێڕێك یان بە دێڕێك بێت و بیابانێك لەتاریکیمان بۆ رۆشنبکاتەوە؟ چی بکرێت بۆ ئەوەی هەواڵێکی مۆدێرنی شیاوی پشت بەستو بە زانستی نوێی رۆژنامەگەریی و ئاوێزانکراو بە ئەزموونیی رۆژنامەوانیی تۆمار بکەین و بنووسین و دابرێژین و پەخشبکەین تا ئەوەی ئامانجی بنەرەتیی میدیاکان کە خۆی لە دروستکردنی کاریگەرییدا دەبینێتەوە، بێتە کایەوە..

ئەم کتێبە هەوڵێکی شێلگیرانەیە بۆ خستنەڕوی ئەو میتۆدو شێوازە نوێیانەی هاتوونەتە کایەی نووسین‌و داڕشتنی هەواڵەکانەوە بەهەردوو شێوەی تیۆریی‌و پراکتیکیی کار لەسەر هەواڵەکان دەکات.

هەژاریی میدیاکانی ئێمەو زۆری ڕوداوەکان‌و فرەیی کەناڵەکان‌و کەم ئەزموونیی و کەم زانیاریمان لەم بوارانەداو دەوڵەمەندیی‌و ئاست باڵایی ئەم جۆرە کتێبانەش وا دەکەن، کە بۆشاییەکی گەورەی کاری ڕۆژنامەوانیی‌و پرۆسەی ڕۆژنامەگەریی‌و تەکنیکی وەرگرتن‌و نووسین‌و بڵاوکردنەوەی نوێی هەواڵەکان پڕ بکەنەوە.

دەخوازین توانیبێتمان مەبەست‌و ئامانجی سەرەکیی ئەم کاری وەرگێڕانەمان بە ئەمانەتەوە بۆ خوێنەرو خوێندکارو ڕۆژنامەوان‌و نووسەرانی کورد گواستبێتەوە..

م. هەڤاڵ ئەبوبەکر
مامۆستای ڕۆژنامەگەریی
لە زانکۆی سلێمانی

# پێشەکی

گرنگیی هەواڵ لەڕاگەیاندنی هاوچەرخدا زیاتر دەبێت و پێگەکەشی پتەوتر دەبێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە یەکەمین بەیەککەیشتنە لەگەڵ واقیعی بابەتییانەی ناجێگیر و گۆڕاودا و ئەو بناغەیەشە کەجۆرەکانی دیکەی ڕۆژنامەگەریی لێیەوە سەر هەڵدەدەن و چالاکترین جۆری ڕۆژنامەوانیشە بۆ پێکهێنانی ڕیزبەندیی مەعریفی بۆ خوێنەر و گوێگر و بینەر ، یان (وەرگر بەگشتیی).

لەبوارە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی – ئابوری و ڕۆشنبیرییەکاندا گۆڕانکاریی بنەڕەتیی گرنگ ڕوویانداوە، هەر ئەو گۆڕانکارییانەش بوونەتە مایەی گۆڕانکاریی بونیاتگەرانە و ئەرکدارانە لەبواری ڕاگەیاندندا، لەسەرووشیانەوە زیادبوونی گرنگیی پرۆسەی هەواڵیی (العملیة الأخباریة) و وەرچەرخانی هەواڵە بەرەو ئاڕاستەی بنەڕەتیی ڕۆژنامەوانیی.

هەواڵ لەخۆڕا بوونی نییە و لەبۆشاییشدا نانووسرێ، بەڵکو دەرەنجامی کۆنتێکست و دەوروبەرێکە. تەنگژەی نووسینی هەواڵیی ڕۆژنامەوانیی عەرەبی بەگوێرەی بۆچوونێك بریتیە لەتەنگژەی ئەو ڕاگەیاندنە عەرەبییەی کەتێکەڵاوی سیستمە سیاسییە عەرەبییەکان بووە و چۆتە ناویانەوە.

لەڕاگەیاندنی عەرەبیدا، نووسینی هەواڵ بەدەستی چەند شتێکی وەك کەمیی و درێغی و لاوازییەکی کوشندەوە دەناڵێنێ، هەواڵیی ڕۆژنامەوانیی عەرەبی ناسنامەی خۆی لەدەستداوە و لەگەڵ خودی خۆی و یاسا و ڕێساکانیشیدا کەوتۆتە پێچەوانەییەوە و لەواقیع و خوێنەریش دوورکەوتۆتەوە و دەسبەرداری داهێنان بووە، لێرەشەوە – لەشانشینی ڕاگەیاندنەوە – چۆتە شانشینی پەیوەندییە گشتیەکانەوە. تەنگژەی نووسینی هەواڵ لەڕاگەیاندنی عەرەبیدا، (سەرەڕای گرنگیی بواری سیاسیی لە قەیرانەکەدا) دۆزێکی سیاسییە نەك پیشەیی بەڵام ئەمانە نابێ ببێتە هۆی شاردنەوەی حەقیقەتی لاوازیی پیشەیی کەنووسینی هەواڵ لەڕاگەیاندنی عەرەبیدا بەدەستییەوە دەناڵێنێ. ئەو لاوازییەی کە بۆ چەند هۆکارێکی جیاواز دەگەڕێتەوە و بەرچاوترینیان بریتین لە :

کەمیی و لاوازیی کادری ڕۆژنامەوان کە لەبواری نووسینی هەواڵدا کاردەکات و لێنەکۆڵینەوە و تێنەگەیشتن و وەرنەگرتنی پرەنسیپە بنەڕەتیەکانی نووسینی هەواڵ، هەوڵ نەدان بۆ تێگەیشتنی مانا و مەغزای ڕووداو و دانەنانی هەواڵ لە چێوەی خۆیدا، بگرە ئاڕاستەکردنی بەرە و چەند ئیعتیبارێکی فەرمی بەرتەسك و نابەجێ.

ئیعتبارە سیاسییە فەرمییەکان، نەوەیەکیان لەنووسەرانی هەواڵ پێگەیاندووە کەڕقیان لەپرەنسیپە بنەڕەتیەکانی نووسینی هەواڵە. بەڕای من یەکێك لەئەرکە بەپەلەکان بۆ پێگەیاندن و ئامادەکردنی ئەو کادرانەی کەلە بواری نووسینی هەواڵدا کاردەکەن بریتیە لە دیراسە و تێگەیشتنی پرەنسیپە بنەڕەتیەکان (کلاسیکیەکان)ی نووسینی هەواڵ و هەرسکردنیان ، دواتر جێبەجێ کردنیان بەشێوەیەکی گونجاوو داهێنەرانە لەژێر ڕۆشنایی واقیعی هەست پێکراودا، چونکە دوورنییە ئەمە ببێتە مایەی کردنەوەی ئاسۆی پێشکەوتنی ئەوبوارە و دواتر جێهێشتنیان.

ئەم کتێبە نوێیەی کە لە (کتێبخانەی ڕاگەیاندنەوە) پێشکەشی خوێنەری دەکەین، تەنیاو نوێترین کتێب نییە لەبواری نووسینی هەواڵدا، بەڵام پێمان وایە

لەزۆربەیان جدی و گونجاوتر و پەیڕەو بەندتر بێ، بەو پێیەی کە ڕۆژنامەوانە ئەمەریکیی‌ەکان نەوە لەدوای نەوە سوودیان لێ وەرگرتووە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکە لەسەر بەپێزی ئەم بەرهەمە کەلەچاپی جاری پێنجەمی تێکستە بنەڕەتییەکەیەوە وەرگێراوە.

ئومێدەوارین ئەم کتێبە بەشدار بێ لەگێڕانەوەی ئیعتیبار بۆ گرنگیی بواری پیشەیی لەپرۆسەی نووسینی هەواڵ و بۆ پرەنسیپە ڕەسەنەکان کەئەم نووسینە لێیانەوە سەردەگرێ.

لەگەڵ سەرلەنوێ دووپاتکردنەوەی حەقیقەتی ئەوەی کەنووسینی هەواڵ لە بنەڕەتدا پرۆسەیەکی سیاسیی - فیکرییە، بەڵام ئەو پرۆسەیە پێویستی بە ئاستێکی پیشەیی هەیە کەلەبواری نووسینی هەواڵدا پشت بەشێوازە زانستیەکان ببەستێ، ئەو شێوازانەش لەبواری ڕۆژنامەگەرییدا ئەوانەن کەلە شارەزایی و پسپۆریی و ئەزموونی مرۆییەوە سەرچاوەیان گرتووە هیوادەخوازین ئەم کتێبە بۆ ئەوانەش سوودمەند بێ کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوە و مومارەسەکردنی ڕۆژنامەگەریین و هەوڵێکیش بێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هەواڵنووسین لە ڕاگەیاندنەکاندا.

د. ئەدیب خەززور

دیمەشق - کانونی دووەم

٢٠٠٠زاینی

## باوەڕی ڕۆژنامەوان

بەپێنووسی: ماکس لیرنەر

١- باوەڕم بەپاکیی ڕۆژنامەوان هەیە بەرامبەر بەواقیع و ئەو ڕووداوانەی چارەسەریان دەکات. ڕۆژنامەوان دەبێ ڕووداو وەکو خۆی بخاتە ڕوو، بەرزترین ئاستی توانای وەسف و ڕوونکردنەوەی خۆشی تیایدا بەکاربهێنێ پابەندبوونی ڕۆژنامەوان بەرامبەر بەوەی کەڕوویداوە تەواو وەکو پابەندبوونی مێژوونووس وایە، هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بایەخدان بەدابینکردنی شایەت و بەڵگەکان دەبێ یەکسان بێت لەگەڵ ئەو بایەخەی مێژوونووسان بەهەمان بواری دەدەن.

٢- کاتێك ڕووداوەکان شاراوەو نادیاربن، ئەو کاتە ڕۆژنامەوان دەبێ پابەند بێ بە بەخشین یان دروستکردنی چوارچێوەیەکی گشتیی بۆ ئەو ڕووداوانە، چونکە ئەمە مانایان دەردەخات. دووریش نییە ئەو چوارچێوەیە مێژوویی یاخود شرۆڤەکردنێکی بەرفراوانی ڕووداوەکە بێت. کەڕۆژنامەوان ئەمە جێبەجێ دەکات دەبێ سنوورێکی یەکلاکەرەوە و ئاشکرا لەنێوان ڕووداوو بۆچوون و لێکدانەوەی خۆیدا دیاربکات و دابنێ.

٣- ڕۆژنامەوان تا بتوانێ ئەوە دیاربکات کەلە هەواڵدا بەکاری دێنێ و ئەوەش کەدەبێ نەیهێڵێ و دووری بخاتەوە، دەبێت تا بەرزترین ئاست سوود لەتوانای خۆی وەربگرێ لەهەستکردن بەو گرنگییە هەواڵییەی کەلەمێشکی خوێنەراندا بایەخیان پێ دەدرێ هەروەها دەرککردن بەوەی کەلە چێوە و هەڵڕژانی ڕووداوەکاندا گرنگە.

ڕۆژنامەوان دەبێ بەرەنگاری هەر ئیغراکردنێك ببێتەوە لەوەی چی زیاد دەکات یان چی لادەبات لەسەر بنەمای ئەوەی کە لەوانەیە یارمەتیدەر بێ یاخود زیانبەخش بێت بۆ گروپێك، بانەو تیم و گرووپانە هەر لایەکیش بن کەڕۆژنامەوان ئینتمایی بۆیان هەبێ یاخود لایەنگرییان بکات.

٤- ئەمە مانای ئەوەیکە ڕۆژنامەوان دەبێ تەنانەت گوێ لەو هۆکارانەش بگرێ کەبڵاونەبوونەتەوە، یان ئەوانەی کەلەوانەیە خودی خۆی ڕقی بەرامبەر یان هەبێ. ڕۆژنامەوان پابەندە بەوەی کەهەموو کەناڵە ڕۆژنامەوانییەکان بەکراوەیی جێ بهێڵێ لەپێناوی هێنانەکایەی پێشبڕکێ لەنێوان هزر و بیرۆکەکاندا، بەو پێیەی کەتەنیا لەمیانەی ئەو پێشبڕکێیەدا میللەت دەتوانێ بگاتە بڕیارە تایبەتییەکانی خۆی و دیاریکردنی ئەوانەی هەڵەن و ئەوانەی ڕاست و دروستن.

٥- لەهەر پێشبڕکێیەکدا لەنێوان بۆچوونەکاندا، دەبێ ڕۆژنامەوان پابەند بێ بەخستنە ڕوو و پێشکەشکردنی بۆچوونە پێچەوانەکان، وێرای بەکارهێنانی زیاترین شێواز و ڕێگای دادپەروەرانە و هاوسەنگانە کەدەیانزانێ. لەهەمان کاتدا ئەگەر بۆچوونێکی لەسەروتار یان لەستوونێکی ڕۆژنامەوانییدا خستە ڕوو، ڕۆژنامەوان لەسەریەتی بەشێوەیەکی ئاشکرا و ڕاستگۆیانە و وەکو بۆچوونێکی تایبەت بەخۆی هەڵوێست پیشان بدات، بەبێ ڕەچاوکردنی دەرەنجام و ئاسەوارەکان.

٦- سەبارەت بەوانەش کەبەدوای بەرژەوەندیی تایبەتیدا دەگەڕێن یان ڕۆژنامەوانیی داردەستن یاخود پیاوانی پەیوەندییە گشتییەکانن و لەبەرامبەر هەموو جۆرە پرۆسەیەکی لەو جۆرەشدا، دەبێ ڕۆژنامەوان زۆر بەوردیی و بە هێزەوە سەربەخۆیی خۆی بەرامبەر بەو بەرژەوەندیی و فشارانە بپارێزێ. بەمانای ئەوەی کە ڕۆژنامەوان دەبێ ئەوەندە بەهێز بێ تاڕادەی ئەوەی لەلایەن ئەو جۆرە کەسانەوە قبووڵ نەکرێ یان خۆشەویست نەبێ کەتوانای واڵاکردنی ڕێگا و خۆشکردنی ژیانی ئەو ڕۆژنامەوانەشیان هەیە، واتە بێباك بێت لەوەی ڕوودەدات.

٧- ڕۆژنامەوان لەسەریەتی ڕووبەڕووی هەموو فشارە دەرەکییەکان ببێتەوە، ئینجا ئەگەر سەرچاوە ئاشکراکانیان کارمەندانی حکومەت، خاوەن سەرمایە، ڕێکخراوە کرێکارییەکان، کەنیسە، گرووپە ئەتنیکییەکان، یاخود هەر سەرچاوەیەکی دیکە بێ کەدەتوانن کاربکەنە سەر دابەشکردنی ڕۆژنامە یاخود داهاتەکەی. ئەمەش ئەرکی هەموو کەسێکی ڕۆژنامەوانە چ لەبواری بڵاوکردنەوە یاخود نووسین و یان هەواڵدان و ستوونووسیندا کاربکات. بەو پێیەش لە زۆربەی حاڵەتەکاندا مەترسی لەوەدایە کە ڕۆژنامەوان بەر لە پیادەکردن پێشبینی ئەو فشارانە دەکات و دەست دەکات بەچاودێریکردنی هەواڵێك یاخود پێداچوونەوەیەکی ڕەخنەیی یان بۆچوونێك کەلەوانەیە زیان بەدابەشکردن یان داهات بگەیەنێ، لێرەوە ڕۆژنامەوان دەبێ ڕووبەڕووی ئەو دەنگە ببێتەوە کەلەناخیەوە بەرزدەبێتەوە و داوای گرتنە بەری ڕێگەی ئاشتیانە و ملکەچکردنی بۆ ئەو فشارانە لێ دەکات.

٨- ڕۆژنامەوان بەرپرسە بەرامبەر پیشەکەی و ڕاست و دروستیی و خاوێن ڕاگرتنی عەقڵ و بیرکردنەوەی.

# پەیامنێر – هەواڵکۆکەرەوە – ی هاوچەرخ
# The Modern News gatherer

یەکەم: ڕۆژنامەگەریی: ئیمڕۆ و سبەی.

دووەم: سروشتی کاری پەیامنێر.

سێیەم: توانستەکانی نووسین.

١- تایبەتمەندییە بەنرخەکان.

٢- بۆنکردنی هەواڵ.

٣- هەواڵ چییە؟

٤- پێویست بوون بەشرۆڤەکردن.

٥- پێشکەوتنی شرۆڤەکردن.

چوارەم: چۆن خۆت ئامادەدەکەیت؟

١- پێشینەی هەواڵیی.

٢- (شیان)ی ئەکادیمی.

٣- کەلوپەلە یارمەتیدەرەکان.

پێنجەم: ئیتیکی ڕۆژنامەوانیی.

١- ماف و ئیمتیازاتی ڕۆژنامەوان.

٢- سیاسەتی ڕۆژنامەکە.

٣- پێشێلکردنی تایبەتمەندیی.

٤- ئازادیی ڕۆژنامەگەریی.

## یەكەم: ڕۆژنامەگەریی – ئیمڕۆ و سبەی

گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییەكان (كەلە ئایندەدا ڕوودەدەن) هەر چۆنێكیش بن، بەڵام چاوەڕێی ئەوەناكرێت كەسەردەمێك بێتە پێشەوە و كەسانێك نەبن كەكاتیان بۆ زانینی ئەوەی ڕوودەدات تەرخان نەكەن و زانیاریی‌ەكانیش نەگوازنەوە بۆ ئەوانی تر و ڕوونكردنەوەی گونجاویش بۆ ماناو مەغزای ئەو زانیاریی‌انە پێشكەش نەكەن.

لەكاتێكدا ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە زیادبووندایە و واشی لێهاتووە مرۆڤ دەتوانێ لەماوەی چەند سەعاتێكدا سەردانی هەموو بەشەكانی گەردوون بكات( لەوانەیە لەچەند دەقیقە یەكیشدا ئەمە بكرێ)، لەهەمان كاتیشدا ئەو كێشە و ناوچانەش كەمایەی سەرنجن و دەبێ ڕۆژنامەوانیی ئایندە بایەخیان پێ بدات بۆ چەند جارێك زیاد دەكەن.

بەردەوامبوونی ئاستی ئاڵۆزیی و پێكداچوونی زۆربەی لایەنەكانی ژیانی مرۆڤایەتیش دەبنە مایەی زیادبوون و بەرفراوانبوونی هەریەك لەدەرفەت و بەرپرسیاریەتییەكانی پەیامنێر و هەواڵهێنەرەكان، لەئایندەشدا هیچ ناكۆكیەك ئەو ڕێگایە دروست ناكات كەلە دابەشكردنی هەواڵەكاندا بەكاردەهێنرێ: ڕاكەرە كۆیلەكان، بانگدەرانی شارو نامەنووسە هەواڵییەكان، كۆتری نامەبەر، برووسكە، تەلەفۆن، چاپەمەنی، وێنەجووڵاوەكان، ڕادیۆ یاخود تەلەفزیۆن و .. تاد.

هەروەها گومان نامێنێ لەوەی کەلە ئایندەدا (زیاتر لە پێویستی جاران) پێویستی بە پیاو و ئافرەتی شیاو تر دەبێ بۆ گواستنەوە و نووسینی هەواڵ لەجیهاندا، بەمەش ئەوانەی دەچنە بواری کاری ڕۆژنامەوانییەوە دەبێ توانای زۆر تریان تێداهەبێ، دروست وەك بارودۆخی چارەکی ڕابردووی ئەو سەدەیە.

خوێندەواری زۆرتر و باشتر پێویست دەبێ، دوای ڕاهێنانیشیان بەشێوەیەکی گونجاو وەکو موممارسی گشتیی، پێویستیەکی بەرچاو بەوانە دەبێ کەتواناداربن بۆئەوەی ببن بەپسپۆر لەیەکێك لەبەش و بوارە جۆراو جۆرەکاندا.

مەسەلەی پێشخستن و باشکردنی جۆری ئامێری کارکەر لە ڕۆژنامەگەریدا بەردەوام دەبێ، بەو پێیەی زەرورەتی کارکردن کێشەیەکی بنەڕەتییە بۆ ئایندەی بوونی کۆمەڵگەی دیموکراسی، ڕۆژنامەگەریی چالاك و خاوەن توانا و بەرپرس، بەتەنیا ئەو ڕۆژنامەگەرییە کە،دەتوانێ زانست و تێگەیشتن پێشکەش بکات کەجەماوەری مرۆڤایەتی دەیانخوازێ و پێویستی پێیان هەیە بۆئەوەی بتوانێ بەهۆی گەل و لە پێناوی گەلدا حکومەتی گەل بپارێزێ. ئەمەش بەبۆچوونی لاوێك کەئەوپیشەیە هەڵدەبژێرێ مانای وایە هیچ دەرفەتێکی دیکە بۆ کۆشش و کار و هەوڵدان نەماوە کەبتوانێ ئەو بڕە لەڕووبەڕووبوونەوە و دەرفەت و فاکتەری پێشخستنی ئامێری کارکەر و خزمەتکردنی مرۆڤایەتی پێشکەش بکات و ببەخشێ.

ئەم کتێبە ئاڕاستەی ئەو کەسانە دەکرێ کەخۆیان ئامادە دەکەن بۆئەوەی لەئایندەدا ببن بەڕۆژنامەوان یان سەرنووسەری گۆڤار یاخود بێژەر لەڕادیۆ و تەلەفزیۆن، یان پەیامنێر لە دەرەوە یان سەروتار و ستوونووس یان ڕۆژنامەوانیی پسپۆر لەوانەی خاوەن شارەزایی و ئەزموونن لەبابەتی تایبەت لەهەموو شێوازەکانی پەیوەندیکردندا یان لەهەر یەکێك لەو شێوازانەدا.

ئەو شێوازە ئەلکترۆنیانەش هەر چییەك بن کە پێش دەخرێن بۆئەوەی کەسی پەیوەندیکەر بەکاریان بهێنێ، بەڵام هێشتا پێویتسیەکی زۆر بە تۆمارکردنی هەمیشەیی دەمێنێ، ئەمەش مانای وایە کەهەموو کاتێك شتێك دەمێنێ لەڕۆژنامە

بچێ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە خەرجییە زۆرەکان بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە بۆتە مایەی دابەزینی ژمارەی ڕۆژنامە ڕۆژانەکان لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ٢٦٠٠ بۆ ١٧٥٠ ڕۆژنامە لەماوەی نیو سەدەدا کەتیایدا ژمارەی دانیشتوان زیادی کردووە، بەڵام سەرەڕای دابەزینی ژمارەی ڕۆژنامە کۆی دابەشکردنی ئەو ڕۆژنامانە خۆی گەیاندۆتە ئاستێکی بێ وێنە خۆی لە ٦٠ ملیۆن دانە دەدات لەکۆتایی هەمان ئەو ماوەیەی ئاماژەی پێ کراوە. ڕۆژانە ١٥٠ ملیۆن کەسی ئەمریکی ڕۆژنامەی ڕۆژانە دەخوێننەوە.

بەهەرحاڵ و بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کەئایندە هەڵیدەگرێ، ڕۆژنامەی ڕۆژانە تا ئێستاش وەکو بواری ڕاهێنانی سەرەکیی وایە بۆ ڕۆژنامە نووسانی لاو، ئینجا هەریەکەیان چ جۆرە ویست و خواستێکی ئایندەیان هەبێ، هیچ شێوازێکی دیکەی پەیوەندیکردنیش نییە کەلە پرۆسەی خێرایی و وردبینی و ئامادەکردنی هەواڵەکانی جیهاندا کۆششی لەوجۆرە بنوێنێ، بۆیە دەستەبەرکردنی زیرەکیی و شارەزایی پێویست بۆ سەرکەوتن وەکو پەیامنێرێکی ڕۆژنامەوانیی بە (هەنگاوی یەکەم) دادەنرێ و لە بواری ڕۆژنامەوانیشدا لەهەر هەنگاوێکی دیکە گرنگترە. لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕاستییەشدا دەکرێ تێبگەین کە گۆڤارە هەواڵییەکان و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان و هی تریش بەکارهێنانی ئەو ڕۆژنامەوانانە بەباشتر دەزانن کەخاوەنی شارەزاییەکی لەوجۆرەن.

ئاشکرایە ئەو لاوەی خۆی بۆ پیشەی پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی ( News paper Reporter) ئامادەدەکات دەبێ لەخۆی بپرسێ: -

أ - چۆن گومانم لەوە نەبێ و بزانم ئەو پیشەیەم خۆشدەوێ؟

ب - چۆن دڵنیابم لەوەی کەمن شیاوم بۆ جێبەجێکردنی؟

پ - چۆن خۆم بۆ ئەو پیشەیە ئامادەبکەم؟

ت - چی دەربارەی بنەماو ئیتیکی ڕۆژنامەوانیی دەزانم؟

## دووەم: سروشتی کارکردن لەڕۆژنامەدا

سەرەڕای ئەو دیمەنانەی کەفیلمە سینەماییەکۆنەکان پێشکەشیان دەکەن، بەڵام دەبێ بزانین کەپەیامنێری ڕۆژنامەکان، لەئاشکراکردنی تاوان و ڕووداوی ڕفاندن و وێرانکارییدا هەمیشە ململانێ لەگەڵ پۆلیسی نهێنیدا ناکەن و، هاواریش ناکەن ((چاپخانە بووەستێنن و پاشان لەڕێگای تەلەفۆنەوە ئەدرەسەکان وەربگرن، بەڵکو لەڕاستیدا ئەوان ڕۆژانە بۆ ماوەی (٨) سەعات لەناوەوە و دەرەوەی ژوورە بێدەنگ و ڕێکوپێکەکانی نووسینی هەواڵدا کاردەکەن.

لەشارەگەورەکاندا، هەندێك پەیامنێر تەواوی ڕۆژانی کارکردنیان بە بەدواداچوون و ڕاوەدوونانی چەندین بابەت لەنووسینگە ڕۆژنامەگەرییەکانی سەربەسەرکردایەتی پۆلیس، یاخود ئەنجومەنی شار، یان دەسەڵاتدارانی فیدراڵی یان ناوخۆیی، یاخود لەشوێنی دیکە دەگوزەرێنن، بەو پێیەی کەلەو جۆرە شوێنانەدا هەواڵیی گرنگ دەست دەخرێن کاتێکیش ئەو هەواڵانە وەردەگرن ڕاستەوخۆ و لەڕێگەی تەلەفۆنەوە دەیانگەیەننە ڕۆژنامەکانیان و زانیارییە وەرگیراوەکانیش، دروست وەکو خۆیان و بەبێ هیچ جۆرە دڕاشتن و ڕێکخستنێك دەگوازنەوە، بەڵام لەڕۆژنامە بچوکترەکاندا، پەیامنێران ڕۆژانە جارێك یان دووجار سەردانی سەرچاوەکانیان دەکەن و پاشان دەگەڕێنەوە نووسینگەکانیان، لەوێ دەست بەداڕشتن و ئامادەکردنی ڕاپۆرتە هەواڵەکانیان دەکەن. لەهەموو حاڵەتەکانیشدا ئەو پەیامنێرانە لەژێر سەرپەرشتی

نووسەری كاروباری ناوخۆییدا (The City Editor) كاردەكەن، ئەویش لەلایەن خۆیەوە بەرپرس دەبێ لەبەرامبەر بەڕێوەبەری نووسیندا (Manging Editor)، كە سەرپەرشتی تەواوی پرۆسە هەواڵییەكان دەكات.

دابەشكردنی كاریش لەڕۆژنامەدا دەوەستێتە سەر قەبارەكەی، بەڵام تەنانەت لەڕۆژنامە بچووكەكانیشدا، بەشەكانی وەرزش و كۆمەڵگا و (ئافرەت) بەزۆریی سەر بەخۆ دەبن.

یەكێك لەنووسەرانیش دەبێتە بەرپرسی چارەسەركردن و ئامادەكردنی ئەو هەواڵانەی كەلەڕێگەی ئەو ئامێرانەی كەبەئامێری بەیەك گەیاندن لەدوورەوە (Telety pesetters) ناو دەبرێن یاخود بەهۆی هێڵە بەكرێگیراوەكانی گەیاندن و وەرگرتنی برووسكە یان ئاژانسە ڕۆژنامەوانییەكانی وەك (ئەسۆشێد پرێس و یونایتد پرێس ئەنتەرناشناڵ )ەوە دەگەنە ڕۆژنامەكە، بەمەش دەكرێ لەهەموو ئەو سەرچاوانە دەستەیەك بۆنووسینی هەواڵە هاتووەكان پێك بهێنرێت. هەروەها ڕۆژنامەگەورەكان خاوەنی دەستەیەكی نووسینی ناوەندین كە تایبەت دەبێت بەچارەسەروو ڕێكخستنەوە سەرەتاییەكانی هەواڵ، ئەركی ئەو دەستەیە بریتی دەبێت لەپێداچوونەوەو پشكنینی شێوازوو وردبینی هەموو ئەو هەواڵانەی كە لەسەرچاوەكانەوە بەڕۆژنامەكە گەیشتوون و دانانی ناونیشان بۆیان، پرۆسەی جودا كردنەوەی بابەتەكانیش (بەمانای دیاریكردنی هەواڵ و بابەتەكان، بەتایبەتیش ئەوانەی وێنەدارن و بلاّودەكرێنەوە)، لەلایەن نووسەرێكی دیكە ، یان لەلایەن نووسەرێكی بەشی هەواڵ، یاخود كەسێكی دیكە كەچەند كارێك رابپەڕێنێت، جێبەجێ دەكرێن بێگومان هیچ كاتێك دووڕۆژنامە خاوەنی یەك ڕێكخستن نین، بەڵام پرۆسەكانی دەركردنی ڕۆژنامە بەیەك پرۆسە دادەنرێت، بەبێ ڕەچاوكردنی دابەشكردنی كاری كارپێكراو لەڕۆژنامە هەمەجۆرەكاندا. تەنها لەڕێگەی كاری ڕۆتینی و بەپێی خشتەیەكی كاری پێشوو ئامادەكراوەوە دەكرێ لەیەك سەعاتدا چەند ڕۆژنامەیەكی ڕۆژانە دەربكرێن.

بەڵام دەربارەی پەیامنێر، ئەگەرچی لەڕاستیدا لەوانەیە بەبەردەوامی لەلایەن دوا ساتەکانەوە (دوا دەقیقە بۆناردنی هەواڵ) ڕاوەدووبنرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوەیەکی گشتیی مەترسی کەمترە لەچوونە ناو ڕۆتینی کاری ڕۆژنامەوانییەوە، ئەمەش کارێکە و دەکرێ ڕۆژنامەوانیی ئەمڕۆ لەهەموو شتێکی دیکە زیاتر جێبەجێی بکات، ئەمەیە سەردەمی کەسی بەرنامەدار، کەتیایدا کرێکارانی یەخە سپی یان شین تاڕادەیەك دەبنە تەنها چەند دانێکی بچوکترو بچوکتر لەدانەکانی ئامێرە پیشەسازییە گەورەکان و لەکۆی پرۆسەکان و تەنانەت لەئامانجەکانیشدا، کە ئاستەمە ئەمانە تێی بگەن. بەم دواییانە زۆر لەلێکۆڵەرەوان توێژینەوەیان سەبارەت بەو سنوورە کردووە، کەکاریگەریی ئابووریی تازە پێی گەیشتووە و بۆتە مایەی زیادبوونی وێکچوون و ملکەچی و سستبوونی لێکدانەوە و کوژاندنەوەی خەیاڵ و ڕەسەنایەتی، دواتر ئەو ئابوورییە چۆن بۆتە هۆی وێرانکردنی دەستپێشخەریی و ڕێزگرتنی خودی .

گومان نییە لەوەی کەڕۆژ لەدوای ڕۆژ برە وێکچوونێك لەو هەواڵانەدا بەدیدەکرێن کەلەهەمان سەرچاوەوە دەگەن ،سەرەڕای ئەوەش دوو چیرۆکی هەواڵیی نین کە بەتەواوی وەکو یەك وابن. ئەنجامدەران، بەلای کەم، جیاوازن، بۆیە دەبێ کاردانەوەکانیشان جیاواز بێ بەرامبەر بەوەی ڕووبەڕویان دەبێتەوە: دەسگیرکردن، ڕووداو، خەڵاتکردن .... تاد. سەرەڕای هەموو ئەمانە هێشتا موچڕکێك ماوە، یاخود بەلای کەم هەستکردنێك بەڕازیبوون، بەتایبەتی دوای سەرکەوتن لەجێبەجێکردنی هەموو ئەرکێکدا. هەروەها جۆرە هەستکردنێك بەشانازیی و زیرەکیی و ئەنجامدانی ئەرك لەئارادایە، ئەو جۆرە هەستەش لەوانەیە بەهێزتر بێ لەوەی کەلە زۆربەی کایە پیشەسازی و فەرمانگەکانی دیکەدا لەسەدەی بیستدا بەدیبکرێت.

ئەگەرچیش لەوانەیە لەجیهانی ڕۆژنامەگەرییدا پەیامنێری ڕاهێنرا و لەئاستێکی نزمدا خۆی بەبەرپرس بزانێ بەڵام لەدیدگای جەماوەردا زیاتر لەهەر کەسێکی دیکەی هاوشانی لەهەموو بوارێکی دیکەدا ئەو پەیامنێرە هەست بەگەورەیی و ئیعتیبار

دەکات. لەکاتی ڕووماڵکردنی هەر ڕووداوێکی ئاگرکەوتنەوەیان گێرەشێوێنیدا ناسنامە ڕۆژنامەوانییەکەی خۆی دەردەخات و ڕاستەوخۆ ڕێگەی پەڕینەوە لە بەربەست و هێڵەکانی پۆلیسی پێ دەدرێ ، تەنانەت لەکاتی ڕووماڵکردنی بابەتە ڕۆتینیەکانیشدا، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا چەند کەسێك دەوریان داوە، ئینجا ئەوانە ئەگەر مەبەستیان بێ شتێك لە ڕۆژنامە بڵاوبکرێتەوە یان شتێك لەچاپکردن دووربخەنەوە. لەسەرەتای ژیانی ڕۆژنامەوانیدا و بەهۆی سروشتی تایبەتی کارەکەی، کەسی پەیامنێر گرنگایەتییەکی پێدەبڕێ، ئەمەش ڕاستیەکە و لەوانە یە ببێتە سەرچاوەی خۆشیی بۆ زاتی مرۆڤایەتیی.

جیهانی ڕۆژنامەوان جیهانێکی خەیاڵی نییە، بگرە بەهەشتیش نییە، بەڵکو لەڕاستیدا پەیامنێر کەسێکی بەرپرسە، لەگەڵ ئەوەشدا کەچەند کەسێکی دیکە لەپرۆسەی دیاریکردنی چۆنیەتی بڵاوکردنەوەی هەر هەواڵێکدا لەڕۆژنامەدا بەشدار دەبن، بەڵام دەبێ بزانین هەر خۆی ڕاستەوخۆ لە ناو ڕووداوەکاندا دەبێ. بڕیار یاخود ئەو حوکمەی کە پەیامنێر دەیدات سەبارەت بە دیاریکردنی شتێك ، ئاخۆ بە شێوەی هەواڵ ڕووماڵدەکرێ یان بەشێوەیەکی تر ، خۆی لە خۆیدا بڕیارێکە و بایەخ و گرنگییەکی گەورەی هەیە. پەیامنێر، بە واتایەکی دیکە ، بڕبڕەی پشتی پرۆسەی کۆکردنەوەی هەواڵ و بڵاوکردنەوەو دابەشکردنیەتی . لە ڕاستیدا هەموو پەیامنێرێك نووسەریشە، بە پێچەوانەوە، نووسەرە باشەکان بە درێژایی ژیانی ڕۆژنامەوانیان ڕەچاوی ئەوە دەکەن کە ببن بە پەیامنێری باش . گاڵتە پێکردنیش یەکێکە لەو نەخۆشیانەی کە هەموو ڕۆژنامەوانان دەبێ خۆیانی لێ بپارێزن . لە کاتێکدا گومان لە ڕۆژنامەوانییدا بە شتێکی بەسوود دادەنرێ، بەڵام نواندنی هەڵوێستێکی نەگۆڕ یاخود زۆر بڵێیی بەرامبەر بەوەی کە بە ((ڕاستیەکان))ی ژیان ناوزەندەکرێ، لەوانەیە نەوەك بەتەنیا ببێتە مایەی گاڵتەپێکردنی سووك و ئابڕووبەرانە بەبەرژەوەندیی گشتیی، بەڵکو دوورنییە دابەزینی پایەی کەسێتیشی بەدواوە بێ.

زۆر لەو کەسایەتییە گشتیانەی کەپەیامنێر پەیوەندی ڕۆژانەیان لەگەڵ گری دەدات، شایستەی ئەو پایە و گرنگییەنین، پەیامنێریش ئەو ڕاستیە دەزانێ. هەروەها نەمانی خەیاڵیش بەئاشکراکردنی ((ڕێساکانی یارییەکە)) بەدیدەهێنرێ، ئەو یارییەی لەڕووی پراکتیکەوە لە سیاسەت و بازرگانیی و بوارەکانی دیکەشدا بەڕێوە دەچێ – و بریتییە لەچەند یاسا و ڕێسایەکی توند و مۆرکی دووڕوویی و بەکرێگیراوییان پێوە دیارە. لەوانەیە پرۆسەی زاڵبوون بەسەر سادەیی و ساکاریدا و تێپەڕکردنی قۆناغی هەڵخەڵەتان و فێربوونی ((ڕاستیەکانی ژیان)) مەسەلەیەکی پڕ بایەخ و گرنگ بێ، بەڵام بەمەرجێك کاملبوونی هزریی بەدواوە بێ.

دەربارەی ئەوەی ئاخۆ ڕۆژنامەوانیی پیشەیە یان بازرگانیی، کۆششێکی ناپێویستکراوە، ئەوەی گرنگە هەڵوێستی کەسە بەرامبەر بەکارەکەی ، دەکرێ سیفەتی پیشەیی لەنێو نێوەندی دارتاش و پزیشك و پەرستار و پارێزەر و شۆفێرانی تاکسی و ڕۆژنامەوانان و یان هەر کەسێکی دیکەدا نەبێ و بەدی نەکرێ. سەبارەت بەڕۆژنامەوانییش، بوارێکی دیکە نییە بتوانێ دەرفەتی زیاتر بۆ بوژاندنەوە و پێشخستنی دیدگا و بەها پیشەییەکان و خزمەتگوزاریی گشتیی برەخسێنێ، بەڵکو شوێنێکی گونجاوە بۆئەوەی لاوی لێکۆڵەر بتوانێ لەبواری ((ڕزگارکردنی جیهان))دا یارمەتی پێشکەش بکات، باشتر لە ڕۆژنامەوانیش ڕێگایەکی دیکە لەبەردەم ئەو کەسانەدا نییە کەدەیانەوێ یارمەتیدەر بن لەوەی والە دیموکراسی بکەن کاریگەرانەتر کاربکات. وەك چۆن لەهەموو بوارەکانی دیکەشدا بەدی دەکرێ، ڕێگا بەرەو لوتکە دوورودرێژە و پڕ لە بەربەستە، لە لووتکەشدا ئەو پایە و گەورەیی و هێزە هەن کە وادەکەن خەباتکردن لەپێناویاندا شایستە بێ.

## سێیەم : توانست و شیانی نووسین

دەربارەی ئەفسانەی ئەوەی کە : ڕۆژنامەوانان لەدایك دەبن و دروست ناکرێن، جۆزێف پۆلیتزەر (Joseph Politzer) ی دامەزرێنەری ڕۆژنامەی (world) کەلە نیۆیۆرك دەردەچێ و ، هەروەها دامەزرێنەری قوتابخانەی پۆلیتزەر بۆ ڕۆژنامەوانیی لەکۆلۆمبیا چەند ساڵێك لەمەوبەر وتوویەتی:

((تاکەشوێن کە بەخەیاڵمدا دێ و مرۆڤ دەتوانێ تەنیا بەهۆی لەدایکبوونەوە بەسەرکەوتوویی داگیری بکات، پێگەی گێل و نەفامە، ئاخۆ هیچ پێگەیەك هەیە مرۆڤ بتوانێ بەبێ مەشق و ڕاهێنان داگیری بکات – شیاندن و ڕاهێنان لەماڵەوە – شیاندن و و ڕاهێنان لەقوتابخانە و کۆلیژەکاندا، ڕاهێنان لەسەر دەستی گەورە مامۆستاکانی پیشە، یاخود شیان لەمیانەی ئەزموونێکی زەحمەت و توند – بەهۆی ئەو سووتانانەی والەمناڵ دەکەن لەئاگر بترسێ، بەهۆی ئەو هەڵە گەورانەی پاڵێوراو دەکەوێتە سەری.

ئەو نووسەرەی کە (( بەنووسەر لەدایك بووە)) و ، بەبێ خۆئامادەکردنیش سەرکەوتنی وەدەست هێناوە، لەڕاستیدا کەسێکە لەپیشە هەڵبژێردراوەکەیدا خاوەنی توانا و هێز و کۆششێکی نائاساییە ... تەنانەت لەوحاڵەتەشدا، ئاخۆ باشتر نییە سیستمێکی ڕاسپاردە و ڕێنماییشی هەبێ کەلەوانەیە هەمان دەرەنجامیان پێ ببەخشێ لەگەڵ پاراستنی کات و کۆششێکی زۆردا؟

لەسەرەتای سەدەی ڕابردووا، دكتۆر جۆن فاینلی سەرنووسەری ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز ڕووبەڕووبوونەوەیەكی بۆ ئەوانە دەركرد كە خاوەنداریی و سەرپەرشتی ڕۆژنامەوانەكان دەكەن و ئەوانەش كەچاوەڕێ دەكرێ لەلایان كاربكەن، ئەو ڕووبەڕووبوونەوەیە ئەو كەسانەش دەگرێتەوە كەسەرقاڵی ئامادە و ڕاهێنانی ئەو ڕۆژنامەوانە چاوەڕوانكراوانەن، ناوبرا و دەڵێ:

ئەگەر لەبری ڕۆژنامەگەریی داوا لەكۆلیژ و زانكۆكان بكەم، ئەو كاتە داوایان لێ دەكەم بەشێوەیەكی تەواو و دروست چەند پیاو و ئافرەتێك ئامادەبكەن، ئەوانەی كەدەبێ شیاوبن و بتوانن ئەركێكی گەردوونی جێبەجێ بكەن، نەوەك تەنیا جوگرافیی، بەڵكو خزمەتێكی هزریی و ڕۆشنبیریی، بەجۆرێك ئەوانە لەم سەردەمەی دیموكراسییدا بن، دروست وەك چۆن دیموكریتس لەسەردەمی خۆیدا بۆ جیهانە بچووكەكەی وابوو، ئەو كەسانەی وەك ئەو پیاوەن كەدەیناسم، كاتێك ئامادەبوو بەتەواوی هەستی خۆی و شانبەشانی شوێنەوارناس بچێتە ناو تابووتی توت عنخ ئاموون. كەسانێكی وەك ئەو كە پێشتر لێكدانەوەیەكی دەربارەی ئەوە هەبوو كە ئەنیشتاین لەبیردۆزەكەیدا پێشكەشی كرد و خستیە ڕوو، وەك ئەو كەسەی ڕۆژێك لەڕۆژان بینیم لەسەر بنەمای درێژی لاكانی هەولی دۆزینەوەی ڕووبەری ئەندازەیی سێگۆشە دەدات، وەك ئەو كەسەی لەناوەڕاستی هەڵمەتی ئەم دواییەدا سەروتارێكی بەدووستوون دەربارەی هەسارەی تازە نووسی و لەهەمان كاتیشدا توانای هەیە ناوی پاڵەوانانی دەساڵی دوایی یاری بیسبۆڵت پێ بڵێ یان ئەنجامی هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتیت لەماوەی سەدەی ڕابردوودا بۆ ڕوونبكاتەوە.

چەند ساڵێك دوای ئەمە، لیژنەی تایبەت بەخوێندنی خوێندنگاكانی فێركردنی ڕۆژنامەوانیی لەوڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا وەسفی ڕاپۆرتێكی كرد كە تیایدا هاتووە: ئێمە ئەوەمان لەبەشەكانی ڕۆژنامەگەریی دەوێ پیاوانی وا دەربچوێنن .. توانای بەهەند هەڵگرتن و نرخاندنی ئەو جیهانە تازە و پڕ ئاڵۆگۆڕەیان هەبێ كەسبەینێ دەبێ بەهی ئەوان.

(( دەخوازین ئەو لاوانە — کەبێگومان لەخوارەوە دەست پێدەکەن — بەرزببنەوە بۆئەوەی لەبواری ڕۆژنامەوانییدا بەشیاوی بگەنە پێگەی گرنگ و توانایان هەبێ زیرەکانە و کاریگەرانە هێزی ڕۆژنامەوانیی بەڕێوەببەن و بەکاربهێنن، بەواتایەکی تر دەخوازین ئەو لاوانە کاتێك کەسەرقاڵی کۆکردنەوەی هەواڵەکانی پۆلیس و ئاهەنگەکان دەبن، هەڵگری کەلوپەلە عەقڵیەکان بن، ئەوانەی ئەگەر بەشێوەیەکی دروست بەکاربرێن، ڕۆژێك دادێ لەچاودێری نووسیندا دایاندەمەزرێنرێ و جێگیریان دەکات. هەموو دەرچوێك دەبێ لەمێشکیدا هەڵگری بنەما بەهێزەکانی نووسەر و بڵاوکەرەوە بێ، ئەو کۆمەڵگایە باش دەزانێ کەکارە بنەڕەتییەکانی خۆشگوزەرانی مرۆڤایەتی لەوەدایە کە ئەو کەسانەی لەڕۆژنامەکاندا کاردەکەن (کەڕای گشتیی پێکدێنن) ئاستی ڕۆشنبیریان لەپزیشك یاخود پارێزەر بەرزترە و .. دەبێ خاوەنی ڕۆشنبیریی بەرفراوان و هەمە جۆربن.

زۆر لەهاوکارانمان پێیان وایە کەشیاندن (ڕاهێنان و خۆئامادەکردن) بۆ کارکردن لەڕۆژنامەگەرییدا لەبنەڕەتدا فێربوونی چۆنیەتیی نووسین دەگرێتەوە، بەلام بەداخەوە لەڕۆژنامەگەریی یان هەر بوارێکی دیکەدا شتێك نییە وەکو ((تەنیا نووسین)) بێ.

شکسپیر بەهۆی وشەو شێوازەکەیەوە نەمر نییە بەڵکو بەهۆی گەورەیی هزرەکانیەتی، ناوبراو خاوەنی شارەزاییەکی قووڵ بووە لەمێژوو، زانستی دەروون، جوگرافیا، فەلسەفە و چەندین بواری دیکەی فیکروزانستدا، لەبەرئەوەشە تائێستا کارەکانی ئەو و توانادارەکانی تری سەدەکانی ڕابردوو دەخوێنرێنەوە چونکە خاوەنی شتێکی نائاسایین و شایستەی ئەوەن باسیان لێوە بکرێ و بخوێنرێنەوە.

بەوپێیەی هزرە گەورەکان، زیاتر لەوشەو دەربڕینە جوانەکان، نووسین گەورە دەکەن، بۆیە هەموو ئەوەی خوێندکاری ڕۆژنامەوان دەیخوێنێ گرنگییەکی گەورەی بۆ ئەو دەبێ.

بابەتی ڕۆژنامەوانیی هەموو ئەو بابەتانە دەگرێتەوە کەلە خولەکانی فێرکردندا دەگوترێنەوە هەر لەزانستە سیاسیەکانەوە بگرە تادەگاتە مێژوو و ئابووریی و زانستی کۆمەڵناسی و کیمیا و فیزیا و ژمارەیەکی زۆر بابەتی دیکە. ئەو خوێندکارەی لەساڵی یەکەمیدا دەرك بەو ڕاستیە بکات سوودێکی گەورەی پێ دەبڕێ، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتیشدا خوێندکار لەساڵی دووەم بەشی یەکەم لە خوێندنی ڕۆژنامەگەریی وەردەگرێ و بەمەش ئەو خوێندکارە بایەخ و گرنگییەکی زۆری سەبارەت بەناسینی ناوەڕۆکی ژمارەیەکی لەبن نەهاتووی کتێبی زانکۆیی لەلادروست دەبێ، زیاتر لە هەر خوێندکارێکی دیکە لەزانست و هونەرە عەقڵییەکان Liberal Arts، - ئەو خوێندکارە دەبێ دەفتەر و سەری خۆشی بەزانیاریی پڕ بکاتەوە، ئەو زانیاریی‌انەی کە لەکاتی چوون و هاتن و گەڕان بەدوای هەواڵەکاندا پشتیان پێدەبەستێ ئەرك و مەرامی خوێندنە ڕۆژنامەوانییەکان بریتیە لە زیندووکردنەوەی ئەو زانیاریی‌یانە کەلە کتێبەکانی خوێندنگادا وەرگیراون، ئەوەش بۆ خوێندکار ڕووندەکەنەوە کە چۆن لەتێگەیشتن و شرۆڤەکردنی واقیعی هەنوکەییدا ئەو زانیاریی‌انە بەکاربهێنێ. بەگوێرەی ئەزموونیش دەرکەوتووە کەبەکارهێنانی (زمان و زانست و فەلسەفە و مێژوو .. تاد) لەنێوان دەرچووانی هونەرە عەقڵییەکان و دەرچوانی خوێندگا ڕۆژنامەوانییەکاندا جیاوازیی هەیە، ئەوەتا نووسەران فێربوون و دەرکیان کردووە کەئەوەی بە (پاشخانی بەرفراوان)ی وانە خوێندنە گشتییەکان ناودەبرێ، بەتەنیا ڕاهێنانێکی گونجاو نییە بۆ نووسین و دەرکردنی ڕۆژنامە. ئەو خوێندن و وانانەش کەپەیوەندیان بەهونەرە عەقڵییەکانەوە هەیە بەزۆری تیۆریی و بێ مەبەستن، لەکاتێکدا ئەو وانانەی پەیوەندییان بەڕۆژنامەگەرییەوە هەیە کردەیی و مەبەستدارن.

بەوپێیەش کەڕۆژنامەوان بەزۆری مامەڵە لەگەڵ ئەو هەواڵانەدا دەکات کەپەیوەندییان بەبابەتی لێکۆڵینەوە و خوێندنی وانەکانەوە هەیە کە بۆ زانستە کۆمەڵایەتییە جۆراو جۆرەکان تەرخانکراون، بۆیە ئەو خوێندکارەی بۆی

دەردەکەوێ کەبایەخدانێکی لاواز یاخود هیچ جۆرە بایەخدانێکی بەزانستە سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانەوە نییە، ئەو کاتە دەبێ بڕیاربدات، ئاخۆ ڕاست بووە لەویست و خواستی خۆیدا کەببێ بەڕۆژنامەوان.

## ١- چەند تایبەتمەندییەکی بەنرخ Valuable Traits:

ئەو لاوەی کەدەبێ هانبدرێ بۆ کارکردن لەبواری ڕۆژنامەگەرییدا، ئەو کەسەیە کەدەیەوێ ماوەی لاوێتی خۆی بەوتن و نوسینی شتی بەهادارەوە بباتە سەرو بڕیاری دەرفەتی سەرکەوتنیشی بەپلەی گرنگی و بایەخدان ( هەر لەتەمەنی منداڵییەوە) بەکێشەکانی جیهانیەوە بەندە. ناشبێ لاوێك بەبێ ئەوەی چێژ لە خوێندنەوەی ڕۆژنامە وەربگرێ خواستی کارکردنی هەبێ لەڕۆژنامەگەرییدا، ئەو بایەخدانەش چەند زیاتر بێ باشترە. ئەمەش لەبەرئەوەی چونکە ئەو هەواڵانەی کەلەچەند دەساڵی داهاتوودا دەربارەی زانستە سیاسیی و کۆمەلایەتیی و ئابوورییەکان لەکتێبە دیراسیەکاندا بلاودەکرێنەوە تاڕادەیەك نادیار و شاراوە دەبن، لەبەرئەوەی ئەمانەن ئەو جۆرە هەواڵانەی کەبەزۆری پەیامنێری سەرەتایی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

ئەو سیفەت و تایبەتمەندییە کەسێتیانەش کەبۆ کەسی ڕۆژنامەوان بەگرنگ و بایەخدار دادەنرێن، ئەوانەن کەهەمان گرنگییان هەیە بۆ سەرکەوتن لەبوار و پیشەکانی تردا: -

(( زیرەکیی، هاوڕێیەتی، ڕاستگۆیی، پێشبینی و خەیاڵ ، توانا، سووربوون، خێرایی، وردبینی، ئازایەتی، بەرگەگرتن، توانای ڕێکخستنی چالاکییە تاکەکەسییەکان، پابەندبوون، هۆشیاریی هزری، دڵسۆزیی، ڕێککاریی، ڕەزاسووکیی، توانای تێبینیکردن، کارزانیی، بوێری، گەشبینی، توانای خۆڕاهێنان، دەستپێشخەریی و ...تاد)).

لەكاتێكدا ئەگەر هەر جۆرە ئاماژەیەك هەبێ و بكرێ لەقۆناغی منداڵیدا بدۆزرێتەوە و لەڕێگەیەوە بڕیار لەسەر ئاستی شیان بۆ ڕۆژنامەگەریی بدرێ، ئەوە ئەو ئامازەیە بێگومان دەبێتە پلەی دەركەوتنی ئاستی گومان و زۆرزانی ئەو كوڕ یان كچە. سەرمایەی پەیامنێر توانایەتی لەبەردەوامبوون لەئاڕاستەكردنی پرسیار تانەوكاتەی هەموو گۆشە جۆراو جۆرەكانی ئەو ئەركە دادەپۆشێ كەپێی سپێردراوە. ئەو منداڵە بچوكەی بەهۆی زۆری گلەیی و گازاندەو دایك و باوكی ماندوو دەكات، دەكرێ هان بدرێ بۆ كاركردن لەڕۆژنامەگەرییدا.

## ٢- بۆنكردنی هەواڵ Nosefor News

بەزۆری بۆنكردنی هەواڵ لەسەرووی لیستی توانا تایبەتییەكانەوە دادەنرێ كەپەیامنێر – كۆكەرەوەی هەواڵ – پێویستی پێیەتی و مانای توانای ناسینی هەواڵ دەبەخشێ لەناو زانیارییەكاندا كەئەمانەی خوارەوەش دەگرێتەوە: –

(أ) توانای زانینی ئەوەی كەزانیارییەكان دەكرێ بەجۆرێكیوا دابڕێژرێن و بخرێنە ڕوو، ببنەمایەی بایەخی خوێنەران.

(ب) توانای ناسینی هێماكان كەلەوانەیە بێ بەرنامە بن بەلام دوور نییە ببنە هۆی ئاشكراكردنی هەواڵیی گرنگ.

(پ) توانای ناسین یان زانینی بایەخی ڕێژەیی ژمارەیەك لەو ڕاستیانەی پەیوەندییان بەخودی بابەتە گشتیەكەوە هەیە.

(ت) ناسینی هەواڵەكانی دیكە كەپەیوەندییان بەزانیارییە تایبەتە بەردەستەكانەوە هەیە.

گێڕاوەی داهاتوو كەگومان لەڕاستییەكەی هەیە، دكتۆر تایلۆر (Dr.Taylor) لەكاتی دامەزرانیدا وەكو ڕەخنەگرێكی بواری مۆسیقا لەڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز، گێڕاویەتەوە، تایلۆر گوتی: – ڕۆژێك دوای ئەوەی بەمەبەستی ئامادەبون لەئاهەنگی كردنەوەی پێشانگایەكی ئۆپرا گەیشتۆتە جێ، زانیویەتی كە گۆرانیبێژی یەكەمی

ئۆپرا لەهوتێلەکەیدا ژەهری خواردووە و ئاهەنگی کردنەوەکەش ڕەتکراوەتەوە. لەبەرامبەریشدا تایلۆر گەڕاوەتەوە ماڵەکەی و خەوتووە، ئەمە سەرەڕای باوەڕ پێ نەکردن پێی، لەژێر ڕۆشنایی ئەو ناوبانگە گەورە و بەرفراوانەی کەدواتر تایلۆر پەیدای کرد. لەنیوەی شەودا، سەرنووسەری تووڕە تایلۆری لەخەو هەڵساندووە و پێی ڕاگەیاندووە کەزۆربەی ڕۆژنامەکانی تر لەلاپەڕەکانی یەکەمی خۆیاندا هەواڵی خۆکوشتنی گۆرانیبێژی یەکەمی ئۆپرا بڵاودەکەنەوە . لەبەرامبەریشدا تایلۆر وەڵامی داوەتەوە و گوتویەتی:- باشە، پێشانگای ئۆپرا نەبوو تاڵەسەری بنووسم، چیم لەدەست دێ ئەوە نەبێ بگەڕێمەوە ماڵی خۆم.

پەیامنێرێکی دیکە (ئەگەری ئەوە هەیە چیرۆکەکە هەڵبەستراو بێ) ئەرکی ڕووماڵکردنی هەواڵی وتارێکی پێ سپێردراوە کە کەسێکی گرنگ دەیخوێنێتەوە، ڕێنمایی ئەوەش بەپەیامنێرەکەدراوە کە چاودێری وتارەکە بکات و لەگەڵ ئەو وێنەیەدا بەراوردی بکات کە خۆی هەیەتی و پێشتر نووسراوەتەوە، بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ وتاربێژ لەدەقی وتارەکەی دەردەچێ، لەکاتی دیاریکراویشدا، بۆ دواجار دەست کرا بە داڕشتنەوەی وتارەکە و بۆ بڵاوکردنەوەشی تەنیا پێویستی بەخوێندنەوەی وتارەکە هەبوو.

لەبەرامبەر ئەمەشدا، پەیامنێر گەڕایەوە ڕۆژنامەکەی و پێی ڕاگەیاندن کەوتاربێژ دەقە ئەسڵییەکەی (کە پێشتر بۆ خوێندنەوە ئامادەکراوە)وەلاناوە و سەر پێیانە قسەی کردووە. جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە بەهۆی ئەو دەقەی لەلای پەیامنێر بووە هەرگیز نەکراوە چاودێری وتاربێژ بکرێ پەیامنێر شکستی هێناوە لەوەی بتوانێ یەك تێبینیش تۆماربکات کەپەیوەندی بەئاماژە سەر پێیی و ڕاستەوخۆکانی وتاربێژەکەوە هەبێ.

ئەو دوو نموونە (کلاسیکیە) ئەوە ڕوون دەکەنەوە کەتێگەیشتنی دروست و ، بڕیاردانی گونجاو بەسەر شتەکاندا دوو مەسەلەی پێویستن و بۆ پەیامنێر هەرگیز دەسبەرداربیان لێ ناکرێ. بەتایبەتیش لەڕۆژانی ئەمڕۆماندا کەنووسینگەی

پەیوەندییە گشتییەکان و ڕاگەیاندنە ڕۆژنامەوانییەکان تاڕادەیەك دەبنە بەربەست لەبەردەمی دیدەنی کردنی سەرچاوەکاندا. بۆیە پەیامنێر دەبێ پرسیار لەدوای پرسیار ئاڕاستەی هەر کەسێك بکات کە دیمانەی لەگەڵدا دەکات بۆئەوەی بتوانێ لەلایەنە نائاشکراکان و لایەنە گرنگەکانی بابەتەکە، بکات.

بەواتایەکی دیکە پەیامنێر دەبێ مرۆڤێکی خۆتێهەڵقورتێنەر بێ و حەز بەلێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بکات و هەستیار و بیرتیژ بێت و بەشێوەیەکی دروستو گونجاو بەگومانیش بێ. ئەوەی ئەو پەیامنێرە جیادەکاتەوە کەخاوەنی هەستێکی بەهێزی بۆنکردنی هەواڵەکانە ئەوەیە کە لەوانەیە هەمان ئەو توخمانە لەچیرۆکە هەواڵییە وێکچووەکاندا هەبن، بەڵام بێگومان لەڕووی بایەخپێدان و گرنگییەوە ئەو بوونەیان جیاواز دەبێ.

بۆ نموونە: لەهەواڵێکدا کەپەیوەندی بەڕووداوێکی هاتوچۆوە هەبێ، پەیامنێر دەبێ هەمیشە هەوڵی وەدەستهێنانی ناوی هەموو ئەو کەسانە بدات کەپەیوەندییان بەڕووداوەکەوە هەیە، ئەمە جگە لەئاست و پلەی برینەکان و درێژەی ئەو بابەتەی پەیوەندی بەپێکدادانەکەوە هەیە و قەبارەی زەرەرمەندیی و ... تاد.

لەهەواڵی ژمارە(أ)دا لەوانەیە ناوی کەسی تووشبوو گرنگترین توخم بێ، لەکاتێکدا لەهەواڵی (ب)دا دوور نییە ناوی ئەو کەسە ناودارەی لەڕووداوەکەدا هیچ ئازارێکی پێ نەگەیشتووە ببێتە توخمێکی هەرە گرنگ. هەرگیز دوو ڕووداو بەتەواوی لە ئەنجامی یەك هۆکاردا ڕوویان نەداوە. لە ڕووداوێکدا لەوانەیە ناتەواوییەك لە برێکی ئۆتۆمۆبێلەکەدا هەبووبێ، لەڕووداوێکی دیکەدا شۆفێری سەرخۆش هۆکاربووە، لەڕووداوی سێیەمدا لەوانەیە هۆکار ئەو پارچەیە بێ کە ڕاگەیاندنەکانی لەسەر نووسراون و بەرچاوی شۆفێریان گرتبێ.

کەم جارێکیش هۆکاری ڕووداو نامۆو تاڕادەیە نائاسایی دەبێ — وەك ئەو ڕووداوەی کەلە ئەنجامی چوونە ژوورەوەی زەردەزیرەیەك بۆ ناو ئۆتۆمبێل و

پێـوەدانی شـۆفێر ڕوودەدات، لەئەنجامیشـدا شـۆفێرەكە نـەیتوانیوە كـۆنتڕۆڵی ئۆتۆمۆبیلەكەی بكات.

لەچیرۆكی هەمان ئەو ڕووداوەدا، لەوانەیە سیما و سیفەتی گرنگی دیكە بەدی بكرێن كەبەبێ ئاڕاستەكردنی پرسیاری گونجاو بۆكەسە پەیوەنـدارەكان دوور نـەبێ پـەیامنێر نـەتوانێ بیانزانێـت. بێگومـان هـەمان ئـەو دوو كەسـە پێشـتر دووچـاری ڕووداوی لـەو جۆرەهـاتوون، لەوانەیـە یـەكێكیان بـەم دواییانـە نەخۆشـخانەی جـێ هێشـتبێ و لەئـەنجامی ڕووداوی پێشـوودا چارەسـەری بـۆكرابێ. هـەروەها بـەدوور نازانرێ یەكێك لەوانە بەڕێگاوە بێ بۆ دیدەنییەكی گرنگ، وەك سەردانی نەخۆش یان پێشكەشكردنی یارمەتی لەڕووداوێكی تردا.

ئەگـەرەكانی دۆزینـەوەی سـیماو سـیفەتی تایبـەت و جیاكـەرەوە لەهەواڵێكـدا كەپەیوەندی بەڕووداوێكی سادەوە هەبێ بە هیچ شێوەیەك لەشێوەكان تەواو نـابن و لـەبن نایـەن، زۆریـش گـوتراوە بـۆ دووپاتكردنـەوەی ئـەو حەقیقەتـەی كەپـەیامنێر بۆئەوەی بتوانێ بەقووڵی ڕووماڵی ڕووداوەكە بكات دەبێ هەمیشە چالاك و ئاگـادارو ئامـادەبێ بـۆ سـوود وەرگـرتن لەدەرفەتـەكان، دەبـێ بیربكاتـەوە، بـیر بكاتـەوە، بیربكاتەوە. هەروەها بپرسێ، بپرسێ، بپرسێ.

ڕووماڵكردنی هەواڵیی باش لەدەسكەوتنی ڕاستییەكان (Facts) پێكدێت، دواتـر لە بەدەستهێنانی چەند شتێكی دیكە. پەیامنێریش ئەگـەر نـەیتوانی ئەمـە جێبـەجێ بكات، ئەوكاتە چیرۆكە هەواڵییەكە تـەواو نـابێ، بگـرە لەوانەیـە شـێوێنراویش بێـت، چونكە هەندێك تـوخمی گـرنگ فـەرامۆش كراون و وەلاوە نـراون. ئـەو پـەیامنێرەی كەفێری ئەنجامدانی كارێكی هەمەلایەن و تـەواو دەبـێ كـە بریتیـە لـە لێكۆڵینـەوە و گـەڕان بـەدوای هـەموو گۆشـە نادیارەكـانی چـیرۆكی هـەواڵیی سـاكار و ئاشـكرادا، پەیامنێرێكە ڕاهێنـانێكی بـەنرخی دەسـگیردەبێ و ڕێگـەی پـێ دەدات ئـەو هەواڵانـە شـرۆڤە بكـات كەدەیانگوێزێتـەوە. بەهـەمان شـێوە بـۆنكردنی مشـكێك، سـیفەتێكی

گرنگـە و دەبـێ لـە کەسـی پـەیامنێردا هـەبێ، بەتایبـەتی لـەو پـەیامنێرەی بـۆ شرۆڤەکردنی هەواڵەکان تێدەکۆشێ.

بۆ نموونە: پەیامنێرێك زانی کەئەندامێکی ئەنجوومەنی پیران وتارێك پێشکەش دەکات. ئەو پەیامنێرە زیرەك و چاپووك دەبێ ئەگەر روونی بکاتەوە ئاخۆ ئەمە مانای ئەوەیە دانیشتنێکی گرنگ کە بڕیار بوو ئەو ئەندامە سەرۆکایەتی بکات دواخراوە یاخود لادراوە. پـەیامنێرێکی دیکـە نـەیتوانیوە یاریـەکی دیاریکراو بکڕێ بەهۆی تەاوبوونی لەبازاڕدا، لێی کۆڵیەوە، بەدوایداچوو، دواتر بۆی دەرکەوت کڕین و فرۆشتنێکی بێ وێنە لەسەر ئەو جۆرە یاریانە هەیە.

دەبـێ ئـەو جـۆرە بۆنکردنـە ((بـۆنکردنی مشـك))کـە یەکێکـە لـەگرنگترین و پـڕ بایەخترین ئەو سیما وسیفەتانەی دەبێ لێکۆڵەر و ڕۆژنامەوان و کەسی ئەکادیمی هەیبێ. پەیامنێرو ئەوەی بەدوای ڕاستیەکاندا دەگەڕێ بەدوای دۆزینەوە و ئاشکرا کردنی هەموو جۆرە ڕێگەیەك لەپێناوی دەستەبەرکردنی زانیارییەکان، ئەگەر بەدروستی و وەکو پێویستیش کار بکات، ئەو کاتە هیچ مەبەست و ئامانجی پێشوتری نابێ هەوڵی پێگەیشتنیان بدات، بەهەمان شێوە هیچ یەکێك لەئەگەرەکانیشی نابێ تا بۆ وەدیهێنانیان تێ بکۆشێ، بەڵکو تەنیا ڕاستییە کەدەبێ سوور بێ لەسەر گەیشتن پێی.

ئەو ڕێگەیەی کەلەمیانەیەوە پرۆسەی گواستنەوەی ئەو زانیارییانەی پێ ئەنجام دەدرێ کەپەیامنێر کۆی کردوونەتەوە، بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بابەتێکی گرنگە، وەکو شێوازێك بۆ ناسینی ئەو گۆڕانکاریانەی کەلە ئەنجامی پێشکەوتنی ئەلکترۆنیدا وەدی هاتوون.

لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە هەنگاوی یەکەم و بنەڕەتی یەك هەنگاو دەبێ ئەویش: گەڕان و لێکۆڵینەوە لەڕاستیەکان و دەستگیر کردنیانە.

## ٣- هەواڵ چییە؟ What is News

هەوڵە ئەکادیمیەکان ڕاستی ئەوەیان دووپات کردۆتەوە کەهەواڵ ڕاپۆرتێکە لەسەر ڕووداو، نەوەک خودی ڕووداوبێ. لەهەر خولەکێکی دیاریکراودا ملیۆنەها ڕووداو هەن و لەیەک کاتدا لەجیهاندا ڕوودەدەن. یەکێک دەمرێ و یەکێکی دیکەش لەدایک دەبێ، ئەوەی تریان تاوانێك ئەنجام دەدات... تاد. هەموو ئەم ڕووداوانەش بریتین لە هەواڵیی شاراوە، یان لەوانەیە ڕووبدەن ئەو ڕووداوانەش نابن بەهەواڵ تا ئەو کاتەی بەڵێندەرێکی ناردنی هەواڵ دەگاتە جێ و ڕاپۆرتێکیان لەبارەوە پێشکەش دەکات. بەواتایەکی دیکە، هەواڵ ڕاپۆرتێکی نووسراوە لەسەر ڕووداو، لە خودی ڕووداویشدا شتێکی کرۆکیی و خودیی نییە.

پەیامنێرە پرۆفیشنەڵ و شارەزاکان گرنگیی شاراوە و ئەگەری ڕوودانی ڕووداوێك، بەرلەوەی بڕیاربدەن ئاخۆ ڕاپۆرتێکی لەبارەوە دەنووسن یان نا، دەخەملێنن، بەم جۆرەش ڕووداو دەکەن بەهەواڵ. ئەو پەیامنێرانە مرۆڤن و خواوەند نین و خاوەنی پێوەرێکی ڕەها و پتەویش نین بۆئەوەی لەبڕیار و دیارکردنی ئەوەدا بەکاری بێنن ئاخۆ ڕووداوەکە دەگوازنەوە یان چاوپۆشی لێدەکەن.

هیچ شتێکیش نییە نەکرێ لەڕێگەی خستنە ڕوو و پێشکەشکردنی بەشێوەیەکی زیرەکانە نەبێتە مایەی بایەخ و گرنگیی، خودای گەورەش بەتەنیا توانای دیارکردنی ئەو شتانەی هەیە کە گرنگن.

ناکرێ لەڕێگەی بەکارهێنان و زیادکردنی هەندێك وشەی وەك (کات و وردیی و کورتی)یەوە پەرە بە تێگەیشتنی سروشتی هەواڵبدرێ، بەو پێیەی ئەو جۆرە سیفەتانە پێویستیان بەڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە و ئەمەش لەپەیامنێرێکەوە بۆ یەکێکی تر و لەبارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخێکی تر جیاوازە.

هیچ شتێك نابێ بەهەواڵ، تائەو کاتەی دەگوازرێتەوە ( ڕووماڵدەکرێ)، بەبێ ڕەچاوکردنی کاتی ڕوودانی. جگە لەمە سروشتی ڕووداو لەڕێگەی شیکردنەوەی ئاسەوارەکەیەوە بۆ سەر ئەوانەی کاری تێدادەکەن یان دەیخوێننەوە گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەگەر چیش وەلام یان کاردانەوە خێرا و ڕاستەوخۆ یاخود دواخراو و دواکەوتو بێ. پلەی ئەو گرنگییەش کەدیراسەکردنی چەند فاکتەرێکی وەك وەلامدانەوە یاخود کاردانەوەی کۆمەلایەتیی هەرچۆنێك بێ، ئەوا بەپلەی یەکەم پەیامنێر بەتوانا و سووربوونێکی زۆرەوە لەگەڕان بەدوای ڕاستیدا کاردەکات. بگرە لەخۆشی ناپرسێ سوود و کاریگەری ئاشکرا و شاراوە چی و چۆن دەبێ کەئەو زانیارییانە دروستیان دەکەن، یاخود ژمارەی ئەو پاسەوانانە چەندە کە دەرگاکان دەپارێزن (Gatekeepers) و دەکرێ مامەلەیان لەگەلدا بکرێ، لەجیاتی ئەمە پەیامنێر بایەخ بەئەرکی سەرەکیی خۆی دەدات کەدۆزینەوەی ڕاستییە.

## ٤-پێویست بوون بەشرۆڤەکردنی هەواڵ
## :The Need for Interpretation

ڕۆژنامەوانیی سەرکەوتووی ئایندە ئەگەر بیەوێ بەسەر پەیژەکانی سەرکەوتندا سەربکەوێ، پێویست نییە لەسەری ببێتە زیاتر لە کرێکارێکی زیرەك کەڕاهێنانێکی تەواو و هەمە لایەنی وەرگرتبێ. پەیامنێر دەبێ لەوە بەتواناتر بێ کەبتوانێ تەنیا ڕووماڵی هەواڵە ڕۆتینییەکان بکات.

بگرە دەبێ جگە لە گواستنەوەی ئەوەی ڕوودەدات توانی شرۆڤەکردنیشی هەبێ. بۆئەوەی شرۆڤەی هەواڵ بکەیت، پێویستە تێی بگەیت، تێگەیشتنی هەواڵیش مەسەلەیەکە زیاترە لەتێگەیشتن و دیاریکردنی ئەو زمانەی کەکەسانێك لەبوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا بەکاریدەهێنن. تێگەیشتنی هەواڵیش جیاکردنەوە و ناسینی ڕووداوی دیاریکراو لەناو زنجیرەیەك ڕووداودا دەگرێتەوە، چ لەڕووی هۆکار یاخود دەرەنجام و کاریگەرییەوە بێ.

مێژوونووسانی ئاینده بەپشت بەستن بەبۆچوون و لێکدانەوەی تایبەتی خۆیان بۆ شتەکان بەگوێرەی پەیوەندییە دروستەکان و گرنگیی ڕێژەییان، دەکرێ ببنە خاوەنی توانای زیاتر لە پێشبینیکردنی ئاراستەو کێشەکانی ئێستا، بەڵام ئەگەر پەیامنێر وەکو پێویست لەمیانەی خوێندنەوەی مێژوو و دیراسەکردنی ئابووریی و کۆمەڵناسیی و زانستە سیاسییەکان و بابەتی ئەکادیمی تر ئاگادار بێ و ئەگەر ئاگاشی لەهەوڵی چاودێرانی دیکە بێ کەلە ڕێگەی کتێب و بابەتی گۆڤارەکانەوە بۆ شرۆڤەکردنی ڕووداوە هاوچەرخەکان دەیدەن، ئەوا ئەو پەیامنێرە، بەلای کەم، دەرك بەحەقیقەتی ئەوە دەکات کە هەواڵ تەنها ڕووداوێکی گۆشەگیر نییە، بەڵکو بەزنجیرەیەك ڕووداوی گرنگەوە گرێدراوە.

پەیامنێری شرۆڤەکار (The Interpretative Reporter)ی ڕووداوەکان لەئایندەدا دەبێ بەرامبەر بەپێکدادانەکان خۆڕاگر بێ و لەبۆچوونیشیدا بەرامبەر بە ژیان وەکو دەروونناس و فەیلەسوف وابێ، ناتوانێ سەربکەوێ ئەگەر هەڵوێستە جێگیرەکان ببنە کۆسپ لەڕێگەیدا، ئەو هەڵوێستانەی کەدوورنییە زیان بەتێگەیشتن و دەرککردن بەکێشە مرۆڤایەتییەکان بگەینن.

شیکردنەوەی دەروونیی هاوچەرخ دووپاتی کردۆتەوە کە هەنگاوی یەکەم بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لەئاڵۆزییە دەروونیەکانی ئەوەیە وا لەو کەسە بکەیت ئەو بناغانە بناسێ کەئەو ئاڵۆزیانەی لەسەر بونیاتنراون یاخود سەریانگرتووە، بۆیە پەیامنێر — کۆکەرەوەی هەواڵ دەبێ بەباشی تێبگات خەڵك چۆن بیردەکەنەوە و لەبەرچی بەم جۆرە بیردەکەنەوە، بۆئەوەی لەکاتی پرۆسەی گەڕانیدا بەدوای ئەوەی کەبە(ڕاستی) ناوزەد دەکرێ دووربێ لە مەترسی لە خوڕەوشت و هەڵسوکەوتی ئەوانەش بگات کە گواستنەوەی هەڵسوکەوتەکانیان دەکەوێتە ئەستۆی و بەبەرپرسیارێتی ئەو دەزانرێ.

ئەو شتە چییە کەبەڕای گشتیی ناودەبرێ و لەوانەیە پێی وابێ کەڕۆژنامەوان کاریگەرییەك دروستدەکات؟ چۆن لەژێر ڕۆشنایی ئاراستە ئابووریەکاندا کەڕێگە

بەسەرهەڵدانی دیاردەی لەو جۆرە دەدەن، باسی بزوتنەوەیەکی سیاسیی تازەبکرێ؟ چی دەربارەی ئەو هێزەی کە گێرەشێوێنیی هەنووکەیی هەیەتی دەزانێ و دەتوانێ چی بکات؟

شرۆڤەکاری هەواڵ دەبێ هۆکارەکان بزانێ، لەکاتێکدا خەڵکی ئاسایی چاودێری دەکەن و تەنیا ڕووداوی ڕووداوەکان دەبینن، هەروەها لەسەریەتی، دروست بەهەمان وردی و ئەو جیددیەتەی کە زانا بەوردبینەکەی دەڕوانێتە نموونەکەی ، ئەویش بەشێوەیەکی زانستیانە لەو هۆکارانە بکۆڵێتەوە . پەیامنێر ناتوانێ بەشدار بێ لەو ڕووداوانەی کەلەبارەیانەوە دەنووسێ، لەکاتێکدا ئەگەر ئەمە ڕوویدات ئەوا بێگومان بۆچوونەکەی تێکەڵ بەهەواڵەکە دەبێ، ئەگەرچیش پەیامنێر ئەوەی لەتوانایدا هەبێ دەیکات بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەبەردەوامی دەکەوێتە هەڵەوە.

پرۆگرامی زانستی شتێکی دیکە نییە ئەوە نەبێ کە دەبێ هەڵوێستەکەت بەپێی توانا ڕاست بێ یان نزیک بێ لەڕاستی هەڵەکانی پەیامنێریش (بەهەرحاڵ) دەبن بەهەڵەی دروستی شارەزایەك لەجیاتی ئەوەی بەهەڵەی گەورەی نەزانێك لەقەڵەم بدرێن. وەك چۆن(N.P.Bagby)ی مامۆستای ڕۆژنامەوانیی لە زانکۆی تەکساس وتوویەتی: —

پتەوکردن و ڕێکخستنی بیرکردنەوە وا لە پەیامنێر دەکات کەنەوەك بەتەنیا بەپێی ویستی سەرۆك و خاوەنکارەکەی ئەرکە ئاساییەکانی بەجێبگەیەنێ، بەڵکو ئەمە لەوانەیە وابکات کەدوو چیرۆکە هەواڵ سەر هەڵبدەن و گەشە بکەن، لەکاتێکدا پێشتر تەنیا یەك چیرۆکی هەواڵیی هەبووە. چیرۆکە هەواڵیەکانیش لەنزیك سەربانەوە نین، بەڵکو تەنیا ئەو پەیامنێرەی هەوڵی داڕشتنەوەی بەردەوام و قووڵ و هەمەلایەنەی بیرکردنەوەی خۆی دەدات، توانای دۆزینەوەی ئەو جۆرە چیرۆکە هەواڵیانەی هەیە.

ڕۆژنامەوانیی بەناوبانگی ئەمریکیی ولیام لیتل (William Little) نووسیویەتی: پێشنیازی من بۆ نووسەرانی لاو و ئەوانەی لەناوەڕاستی تەمەندان

ئەوەیە : بیربکەنەوە، قەناعەتی تەواوم هەیە کە زۆربەی نووسینە خراپ و نابەجێکان کەسانێك دەینووسن هەرگیز بیریان نەکردۆتەوە لەوەی مەبەستیانە چی بڵێن — لەبەرچی دەیانەوێ ئەوە بڵێن — بەزۆری گوێبیستی ئەو برگەیە دەبێت: ئەو کەسە نازانێ دەیەوێ چی بڵێ. بیرنەکردنەوە مەسەلەیەکە لەهەموو قۆناغەکانی پرۆسەی نووسینی هەواڵدا هەیە و بەدیدەکرێ، ٩٨٪ی سەروتارەکانیش دەکرا باشتر بوونایە ئەگەر بەژمارەیەکی کەمتری وشە بنوسرانایە، ئەوەیە کەدەمەوێ بیڵێم، ئەوەش ئەو هۆکارەیە کە پاڵم پێوەدەنێ ئەوەبڵێم. ئەو شێوازە لەوانەیە بتوانێ ئەوەی کەپێویستە بگوترێ لەهزری نووسەردا بچەسپێنێ و بەر لەهەموو شتێك و بەکورتیش وای لێبکات بەباشی و هەمەلایەنی و قووڵییەوە بیرلەوە بکاتەوە کەدەیەوێ بیڵێ.

دیارە ئەمەش هەمووی وەك شتێکی ئاسایی وایە، بەڵام، لەکاتێکدا من ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕۆژنامەکان دەخوێنمەوە، ئەمە ئەو هەڵە گەورەیەیە کەدەیبینم: ئایا ئەو ڕۆژنامەوانە دەزانێ هەوڵدەدا چی بڵێ؟ لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەو نازانێ چونکە بەهیچ شێوەیەك بیری لەوە نەکردۆتەوە : دەمەوێ چی بڵێم، لەبەرچی بیڵێم؟

## ٥- پێشکەوتنی شرۆڤەکردن

## The Growth of Interpretation

هێزی پاڵنەری گرنگی یەکەم بەرەو چارەسەری شرۆڤەکاری و بەرە و بەکارهێنانی شرۆڤەکاری، جەنگی یەکەمی جیهانیی خستیە ڕوو، کاتێك ئەو شەڕە هەڵگیرسا، زۆربەی ئەمریکییەکان دووچاری سەرسوومان بوونەوە و بەهیچ شێوەکیش نەیانتوانی هۆکارەکان ڕوونبکەنەوە. م، براون(Broen،M) لەنامەی دکتۆراکەی لەزانکۆی (ویسکونسم)دا لەناوەڕاستی سییەکاندا دەربارەی ئاستی بەرپرسیارێتی ئاژانسی دەنگوباسەکان بەرامبەر بەو دیاردەیە نووسیویەتی:—

شکستهێنانی گەورە بۆ ئاژانسی ئاسوشیتدپرێس دەگەڕێتەوە لەوەی کە ڕێگەی لەپەیامنێرەکانی خۆی گرت بابەتی هەواڵیی پاشکۆدار و بونیاتنراو لەسەر بنەمای سیاسەت و ئاڕاستەکان بنێرن. ئەوە بوو ئاژانسی ناوبراو هەڵوێستێکی ترسنۆکانەی نواند، ئەو هەڵوێستەی کە ڕێگە بەپەیامنێران دەدات تەنیا ئەوە بگوازنەوە کە بەتەواوەتی دیار و ئاشکرایە، بەوەش ڕازی نەبوو کە هیچ جۆرە شیکردنەوەیەك بۆ ڕووداوەکان بکرێ، بگرە سووربوو لەسەر ئەوەی کەتەنها ڕووداوە دیار و ئاشکراکان ڕوومالبکرێن. ئەگەر چیش هەندێك لەپەیامنێرانی ئەو ئاژانسە لەسەر کاروباری دەرکیی مەشقیان پێ کرابوو، بەڵام کەمێکیان توانای شیکردنەوە و دەرککردنیان بەگرنگیی ڕووداو و ئاڕاستەکانیان هەبوو.

نەوەك بەتەنیا ئاژانسی ئاسوشیتد پرێس، بەڵکو ئاژانسەکانی هەواڵ و ڕۆژنامەکانی تریش لەئەزموونی ئەوەی کەئامادەنین لەهەنگاوە کۆتاییەکان بگەن، ئەو هەنگاوانەی جیهانیان نغرۆی شەڕکرد، یاخود بتوانن وەکو پێویست لەکاتی هەڵگیرساندیا ڕووداوەکانی شەڕ ڕوومالّ بکەن، وانەیەکی گرنگ فێربوون.

لەماوەی ساڵانی بیست و سییەکاندا ئەو ئاژانس و ڕۆژنامانە چەندین شارەزای مەشق پێکراوو ڕاهێنراویان لەپایتەخت و بنکەکانی هەواڵیی جیهاندا، نەوەك تەنیا بۆ گواستنەوەی هەواڵەکان بەڵکو بەمەبەستی ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی ڕووداوەکانیش دامەزراند، بەناوبانگترین ئەو ڕۆژنامەوانانە ئەمانە بوون:-

دەبلیو. دیورانتی (W.Duranty) و ج. جونتەر (J.Gaunter) و ڤ. شیان (V.Sheean) و ئی. موریر (E.Mowrer) و ك. رینۆلدز (K.Reynolds) و دەبلیو شیرەر (W.Shirer)و ئێم. دەبلیو فودور (M.w.fodor).

ئەمانە و چەندین کەسی دیکەش لەمیانەی هەواڵیی ڕۆژنامەو بابەتی گۆڤار و کتێب و وتارە رادیۆییەکانەوە دەتوانین بڵێین کارێکی باشیان بەئەنجامگەیاند بۆیە مایەی سەرسوڕمان نەبوو و بەپێچەوانەی ساڵی ١٩١٤ ، بەر لەهەڵگیرساندنی

جـەنگی دووەمـی جیهـانیی، زۆربـەی هـەرە زۆری ئەمریکییـەکان چـاوەڕێی ئـەو جەنگەیان دەکرد یان بەلای کەم دەیانزانی دوورنیە شەڕێکی لەو جۆرە بەرپاببێت .

دوا بەدوای هەرەسهێنانی بازاڕی سەنەدە داراییەکان لەساڵی ١٩٢٩ دا و لەماوەی وێکهاتنەوەی ئابووریی لەسییەکان و سەردەمی بزووتنـەوەی ئـەزموونیی سیسـتمی تازە (New Deal)، یشدا داواکـاریی خوێنـەران ڕوی لـەزیادبوون کـردوو قۆنـاغی بەتەنیا ڕووماڵکردنی هەواڵە ناوخۆییەکانی تێپەڕاند، بەو پێیەی ئەو ڕووداوانە لەسەر ئاستی تەواوی میللەتدا هەستێکیان لەگەڵ خۆیانـدا هێنـا سـەبارەت بەبایـەخی ڕوو لەزیادبووی حکومەتی فیدراڵی لەژیانی هەموو تاکێکدا. بەمەش ژمارەی دابەشکردنی گۆڤـــارە هەفتەییـــە تـــازە دەرچـــووەکانی وەك: تـــایم(Time) و نیوزویـك(Newsweek) و هـی تـر وەکـو ڕۆکێـت ڕوویـان لـە بەرزبوونـەوەکرد، بەهەمان شێوە دابەشکردنی گۆڤـاری (Reader's Digest) و گۆڤـاری مانگانـەی دیکەش زۆر بەرزبوونەوە، ئـەو گۆڤارانـە بابـەتی هەڵبـژاردە و کـورت و ڕێکوپێکیـان تیادا بڵاودەکرایەوە، لەلایەکی دیکەوە ژمارەی خوێنەرانی ئـەو کتێبانـە زیـادی کـرد کە خوێندنەوەیان ئاسانە، وەك (( چۆن دەتوانی .. ئەنجام بدەیت))، باوەڕیش وایە ئەمە بۆ زیادبوونی ویستی هاوولاتی بگەڕێتـەوە لـەوەی بزانـێ لەزۆربـەی بوارەکـانی بایەخـدان و چـالاکی مرۆڤایەتیـدا چـی ڕوودەدات، نامـە هەواڵییـەکانیش دروسـت ئەمەیان پێشکەشی جەماوەری گشتیی و تایبەتی دەکرد.

ڕۆژنامـەکانیش دەسـتیانکرد بـە گونجانـدنی شـێوازی سـەرەکیی هەواڵـەکان و فراوانکردنـی ناوەڕۆکـەکانیان بۆئـەوەی ئـەو سـتوونانە بگرنـە خۆیـان کـە هـەڵگری واژووی شرۆڤەکارانی سیاسیی بن. لەناوەڕاستی سیەکانیشدا ڕۆژنامە هەڵپرژانە سەر بڵاوکردنـەوەی پێداچـوونەوە (خسـتنە ڕووReview)ی ڕۆژنامـەوانیی هەفتانـەی هەواڵـەکان، بەرچاوترینیشـیان (نیویـۆرك تـایمز) بـوو، هـەروەها هەوڵیانـدا پێداچـوونەوەی هـەواڵیی هەمـەڕەنگی ڕۆژانـە بڵاوبکەنـەوە و ئـەو پاشـکۆ (یـاخود گۆڤار)انەش فراوانترکران کـە ڕۆژانـی یەکشـەممە دەریانـدەکردن، لەلایـەکی دیکـەوە

بەشی بابەتە وەسفی و چیرۆکییە داهێنانەکانیان فراوانتر کرد و ژمارەی بابەتە (تەواو کەرەکانSupplemental) یان زیادکرد، ئەمەش بۆئەوەی بتوانن پاشکۆیەکی مێژوویی و جوگرافیی و خودیی و زانیاریی بەهەواڵ ببەخشن، بەو ئامانجەی وا لەو هەواڵانە بکەن کەپەیوەندییان بەڕووداوەکانەوە هەیە ئاسانترین و خاوەنی مەغزا و مانابن. ئەمەش خۆی لەخۆیدا هۆکارێك بوو بۆئەوەی لەبواری ڕیزپەندیکردنی ئەو جۆرە نووسینانەدا چەند وشەو زاراوەیەکی تازە سەرهەڵبدەن و لەبری دانانی هەموو ئەو نووسینانە لەژێر ناونیشانی (پارچە هزرییەکاندا)وەك چۆن لەڕابردوودا باو بوو، ئێستا ڕۆژنامەوانان وایان لێهاتووە قسەبکەن و زاراوەی وەك: بابەتە لاوەکییەکان، ڕوونکردنەوە، هەڵوێستەکان، کۆی بابەتەکان ( wrap - ups)، تەواوکردنی ڕێکخستنی بابەتەکان (Button - ups) و بۆمبە قورسەکان (Block buroters)، شێواز و جۆری دیکەی ڕوونکردنەوە و شرۆڤەکردن بەکاربهێنن، هەر لەنێو ئەو زاراوە تازانەدا ناوی ئەمانە دێنین: پاشکۆ، ئەوەی لەژێر سەرەوە دایە، ڕووماڵی داهێنەرانە یاخود شرۆڤەکارانە.

ڕاستەوخۆ لەدوای تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانییەوە هیچ بابەتێکی دیکە بەقەد شرۆڤەکردنی هەواڵ لەلایەن یەکگرتووی نووسەرانی ڕۆژنامە ئەمریکییەکان و هیچ ڕێکخراوێکی ڕۆژنامەوانیی ترەوە بایەخی پێ نەدرا، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەو ناوانەی کەبابەتەکە پێی براون، لەساڵی ١٩٤٧ یشەوە، واتە ئەوساڵەی کەتیایدا چەندین ڕێکخراوی ڕۆژنامەوانیی دامەزرێنران، گەلێك توێژینەوە بڵاوکرانەوە وبوونەمایەی ورووژاندنی مشتومڕی گەرموگوڕ دەربارەی ئەو بابەتە.

لەسەرەتادا بایەخێکی زۆر بەو پێناسانەدرا کە پەیوەندییان بەدیارکردنی ئەو جیاوازییەوە هەیە (ئەگەر هەبێ) کە لەلایەك لەنێوان شرۆڤەکردن و ئەو بابەتەدا هەیە کە ڕوونکردنەوە و ڕووداوی تێدایە و پاشکۆش پێکدێنێ لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ سەروتار و ئەو ستوونانەدا کەبیرو بۆچوون دەگرنە خۆیان. ئەوەش پرسیارێکی بنەڕەتییەو پەیوەندیی بەو سیاسەتەوە هەیە: ئاخۆ ڕێگە بە ڕۆژنامەوانیی

ئاسوشیتدپرێس دەدرا کەلە ڕووماڵکردنە هەواڵییە سادە و بابەتیەکانی ڕووداوەکان دوور بکەونەوە؟

لەنێوان ئەو بەیاننامە نموونەییانەشدا کەلەلایەن چەندین کۆمەڵەو ڕێکخراوی بەهێزەوە دەرکراون، ئەو ڕاپۆرتە بوو کە کۆمەڵەی (ماڵ و کارەکان) دەریکرد و تیایدا هاتووە: شەپۆلێکی توندی داواکاری لەئارادایە و پەیوەندییان بە زەرورەتی بەکارهێنانی نووسینی شرۆڤەکاری زیاترەوە هەیە. هاووڵاتی ئاسایی ئەمریکی نیگەرانە، وەك بەرهەمێن وەکو بەکاربەریش نیگەرانە ئەو نازانێ و تێ ناگات چی بەسەردێ یان لەو جیهانەی کەتیایدا دەژی چی ڕوودەدا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداری حەقیقەتی ئەوەیەکە ڕووداوی گرنگ و گەورە لەئارادان و ڕوودەدەن. دەیەوێ دەربارەی شتومەك و پرۆگرام و سەرکردە تازەکان بخوێنێتەوە.

ئێستا، لەڕووی کردەییەوە گفتوگۆ تەواو بوو، بەڵام چەند دەنگێکی کەم هەن دژی پێویستبوون بەڕوو ماڵکردنی هەواڵی شرۆڤەکاریی (تەئویلی (Interpretative Reporting) دەوەستن، ئەمەش مانای وایە کەلە پێناوی ئەوەی پەیامنێری ئایندە ببێتە زیاتر لەکرێکارێکی ڕەزاگران و پڕووپووچ، دەبێ خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێویستی و داواکاری ڕوولەزیادبوو بۆ ڕووماڵکردنی هەواڵی (قووڵ) و (ئەوەی لەژێر سەرەوەدایە)و (دەبێ خوێنەر لەئیمڕۆدا ڕوداوی پشتی پەردەکان ببینێ) و (لەچوارچێوەی خۆی و لەژێر ڕۆشنایی ئەزموونی کەسێتی خۆیدا هەواڵ بۆ خوێنەر بگوازرێتەوە و بگێڕێتەوە) و (مەغزا و دەلالەت لەواقیع دەربهێنێ) و (ئاماژە بەگرنگیی و مەغزایی ڕووداوە هەنووکەییەکان بکات)، لەکاتێکیشدا ئەگەر بمانەوێ وتەی چەند نووسەرێکی هەمە جۆر بەکاربهێنین، دەکرێ ئاماژە بەوە بکەین کە م. چایلدز (M.Childs) نوسیویەتی: ((ئەو پەیامنێرەی ڕووداو شرۆڤە دەکات، ئاسۆی هەواڵ بەرفراواندەکات، ڕوونیدەکاتەوە، فراوانی دەکات و وەسفی دەکات، ئەو ڕوونی دەکاتەوە .. بەپێچەوانەی نووسەری ورووژێنەریش، ئەو پەیامنێرەی شرۆڤەی هەواڵ دەکات دەبێ تێگەیشتنێکی کاملبوو

و قووڵی بەرامبەر بەگرنگیی و بەرپرسیاریەتی کارەکەی هەبێ .. بۆ ئەو پەیامنێرەی شـرۆڤەی هـەواڵ دەکـات یـەکێك لـەگرنگترین ئەرکـەکانی ئەوەیـە کەدەسـت بەبەرفراوانکردنی چواردەوری بازنەی هەواڵەکان بکات... ئەرکی تایبەت و بەرچاوی هـەواڵ لەوەدایـە کەلـەو بڵاوکراوانـە دوورتـر بـڕوات کـە بـەخۆڕایی دابەشـدەکرێن، هـەروەها دوورتـر لـەو بەیاننامانـەی کـەبۆ دابەشـکردن بەسـەر ڕۆژنامەکانـدا ئامـادە دەکرێن، دوورتر لەوەش کەلە کۆنگرە ڕۆژنامەگەرییەکاندا دەگوترێن...)).

لەوانەیە بپرسیت : لە کوێ دەکرێ ئـەوجۆرە پەیامنێرانـە بدۆزرێنـەوە کـەتوانای شـرۆڤەکردنی هەواڵـەکانیان هـەبێ؟ ئەوانـەی لـەمیانی پێشـکەوتن وئەزموونـدا دەدۆزرێنـەوەو پێدەگـەن، لـەڕوو مـاڵکردنی هەواڵـەکانی ئەنجومـەنی شـارەوانی و هەواڵەکانی ویلایەتدا دەردەکەون .

زانیاریی‌ان گەشەدەکات و ئـەزموونیان کامـڵ دەبـێ و متمانـەیان بـەخۆیان زیـاد دەبێ.

لیسترمارکیل (L.Markel) بەیـەکێك لـەگرنگترین بەرگریکـەرە بەپەرۆشـەکانی ڕووماڵکردنی شـرۆڤەکاریی هەواڵـەکان دادەنـرێ لـەدژی ڕەخنـە گرانـی، ماریکـل نووسیویەتی :

(( ئەوانەی دژایەتی شرۆڤەکردن دەکەن، دەڵـێن چیرۆکی هـەواڵیی دەبـێ تـەنیا بریتی بێ لەبڵاوکردنەوەی ڕاستییەکان، من دەپرسم: کام ڕاستی؟ ئاشـکرای دەکـەم کەلەواقیعدا شتێکی وەکو هەواڵیی (بابەتی Objective) بوونی نییە بـەو مانایـەی ئەو دژایەتیکەرانە بەکاری دێنن، یاخود بەهەر مانایەکی دیکە، بابەتی ترین پەیامنێر بەنموونـە وەربگـرە، دەبینـی پـەنجا ڕووداو (ڕاسـتی Fact) کۆدەکاتـەوە، ئینجـا لـەنێوان ئـەو پـەنجا ڕاسـتییەدا، دوانزەیـان هەڵدەبـژێرێ کـەپێی وایـە تاڕادەیـەك بایەخـدارن، ئامادەیـان دەکـات بـۆ ئـەوەی لـەو چیرۆکە هەواڵییـەدا بـەکاربهێنرێن کەدەینووسێ، بەمەش ئەو پەیامنێرە سی و هەشت ڕاستی پشتگوێ دەخات. ئەمـە

یەکەم ڕاهێنانە دەربارەی دادگایی کردن و لەهەمان کاتیشدا مومارەسەی یەکەمی دەربڕینی بیر و بۆچوونە.

دواتر پەیامنێر بڕیاردەدات ئاخۆ لەنێو ئەو دوانزە ڕاستیدا کەهەڵیبژاردوون کامەیان پێشەکی چیرۆکی هەواڵیی پێکدێنێ. ئەو ڕاستیە دیاریکراو و پەیوەندیدارەش کەهەڵیدەبژێرێ گرنگیەکی پێ دەبرا – چونکە خوێنەر بەزۆری بەخوێندنەوەی پێشەکیی هەواڵ وازدێنێ، واتە برگەی یەکەمی، ئەمەش ڕاهێنانی دووەمی دادگایی کردن و مومارەسەی دووەمی دەربڕینی بیروبۆچوونە.

دوابەدوای ئەمە پەیامنێر دەستدەکات بەخوێندنەوەی ئەوەی کەبەچیرۆکێکی بابەتییانە ناو دەبرێ و بڕیاردەدات ئاخۆ لەلاپەڕەی یەکەم یان لەلاپەڕەی ژمارە (٢٩)دا بڵاوبکرێتەوە، لەکاتێکدا ئەگەر لەلاپەڕەی یەکەمدا بڵاوبکرێتەوە لەوانەیە کاریگەریەکی بەهێز بکاتە سەر ڕای گشتیی، بەڵام ئەگەر لەلاپەڕەی ژمارە(٢٩) دا بڵاوکرایەتەوە ئەو کاتە لەوانەیە کاریگەریەکەی بەهەمان هێز نەبووایە. لەو باوەڕەدام گرنگترین ئەو بڕیارانەی پەیوەندییان بەنووسین لەڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەدا هەیە ئەو بڕیارەیەکە ئەو هەواڵانە دیار دەکات بۆئەوەی لەلاپەڕەی یەکەمدا بڵاوبکرێنەوە. ئەمەشیان ڕاهێنانی سێیەمی دادگایی کردن و مومارەسەی سێیەمی دەربڕینی بیروبۆچوون و هەڵوێستە.

بەکورتی، دەکرێ بوترێ: ئەو هەواڵە (بابەتییە)، بەپێی مەرجە ئاماژەیی و شرۆڤەکارییە تایبەتیەکان، بەهیچ جۆرێك بابەتی نییە و دادگایی کردن (بۆچوون – بڕیار)ی پێویست لەپێناوی شرۆڤەکردن شتێکی جیاواز نییە لەو دادگایی کردنەی کەپرۆسەی دەستنیشانکردنی ڕاستیەکان دەگرێتەوە لەوەی کەبە چیرۆکی هەواڵیی وەقائیعی ناودەبرێ یاخود لەخستنەڕوو و پێشکەشکردنی ئەو چیرۆکەدا بەدەربڕینێکی دیکە، دروست وەك ئەوەی دادگای باڵا دەڵێ: یاسا هەر یاسایە، بەهەمان شێوە و دروست وەك ئەوە وایە کەلە شێوازەکانی ماسکۆمۆنیکەیشندا دەڵێن: هەواڵ هەر هەواڵە.

## چوارەم: چۆن ئامادە دەبێت؟

### ١- باگراوندی هەواڵیی Informational Background:

ڕێسای ڕەچاوكراو لەئامادەبوون بۆكاركردن لەپیشەی ڕۆژنامەوانیدا ئەوەیە:
تا پێت بكرێ شت فێربە و هۆشیار و زیرەكیی بنوێنە. پەیامنێری نەفام و كەم ئەزموون زیانێكی گەورە پێكدێنێ، سەرچاوەكانی هەواڵ وەڕس دەكات و ناتوانێ هەموو ڕووداوو ڕاستییە بنەڕەتییەكان دەسگیر بكات، دواتر چەند هەڵەیەكی گەورە دەكات دەربارەی ئەوەی پەیوەندی بەڕووداو یان بەخستنەڕوو و توندكارییەوە هەیە، ئەمە لەكاتێكدا كەخەریكی نووسینی چیرۆكی هەواڵێك دەبێ.
بۆئەوەی پەیامنێر بتوانێ چیرۆكێكی هەواڵیی پەیوەندار بەبنكەیەكی پۆلیس یان بەدادگایەكی تاوان یاخود بەئەنجومەنی شار و بنكەی حكومەتی ویلایەت و بارەگاكانی سەركردایەتییە سیاسییەكانەوە ڕوومالبكات، دەبێ لەپێكهاتەی حكومەت و سروشت و كاری نووسینگە ئیدارییە جۆراو جۆرەكان تێبگات. پەیامنێر دەبێ توانای هەبێ بخوێنێتەوە و بەپەلەش لە ناوەڕۆكی بەڵگەنامە فەرمییەكان بگات، بەباشی مانای زۆر لە زاراوەكان بزانێ، ئاگاداری ئەو جیاوازییە وردانە بێ كەلە نێوان وشە و بڕگەكاندا هەن، شارەزای لایەنە یاسایی و ناوە فەرمی و زاراوە تایبەتیەكانی زۆربەی كێشە و فەرمانگە و كارەكان بێ. پەیامنێر بەبێ زانینی ئەو

بابەتەو چاوخشاندن بەهزر و هەڵوێستەکانی ئەو کەسەی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکات، نابێ گفتوگۆی هەواڵیی لەگەڵ هیچ کەسێك ئەنجام بدات.

ئەگەر چیش زۆربەی نووسینگەکانی نووسین لەرۆژنامەکاندا خاوەنی کتێبخانەی چاکن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیامنێر دەبێ لەپێناوی نووسینی چیرۆکدا ئەو کتێب و سەرچاوە و دۆسیانە بناسێ کە بابەتی رۆژنامەوانیی دەگرنە خۆیان بۆئەوەی لەدەستەبەرکردنی زانیاریی‌ی مێژوویی یان هەر زانیاریی‌یەکی دیکەدا بگەرێتەوە بۆیان. بەتێپەربونی کات و لەگەڵ بەردەوامبوونی مومارەسە و تاقیکردنەوەشدا، ئەو پەیامنێرە خۆی وەك كۆگایەكی دەوڵەمەند بەزانست و زانیاریی‌ی دەبینێتەوە و توانای ئەوەی لادروست دەبێ ئەو رێکخراوە گشتیی یان تایبەتیانە بناسێ کەدەبێ لەهەر بۆنەیەکدا راوێژ، یان پەیوەندییان پێوە بکات، وێرای توانای فێربوونی ئەوەی کە هەر فەرمانگە یاخود لایەنێك چی بەلاوە گرنگە.

پەیامنێر بەبێ ئەو زانیاریی‌یە پاشخانیانە دەربارەی ئەو بوارەی کاری تێدادەکات ناتوانێ راپۆرتێکی هەواڵ بنووسێ، هەروەها دەبێ بزانێ کە پێشبرکێی ئەمرۆ دورو درێژترین پێشبرکێیە لەمێژووی شارەکەدا و ئەمەش جاری یەکەمە ئەو پاڵێوراوە لەوشارەدا زۆرینەی دەنگەکان مسۆگەر بکات و ئەو رووداوەش لەوچوارپیانەدا روویداوە کەپێشتر ئەنجومەنی شار رازی نەبووە هێمایەکی هاتوچۆی لێ دابنێ، ئەو پێشنیازەش کە وادیارە تازەیە لەراستیدا پێشنیازێکی کۆنە، دەساڵ لەمەوبەر لە راپۆرتی ئەنجومەنی شارەوانیدا هاتووە ..تاد.

ر.پاینی (R.paine)، کەیەکێکە لەبەرێوەبەرانی نووسینی ئاژانسی ئاسۆشیتد پرێس، لەکۆبوونەوەیەکدا کەبەم دواییانە سازکرا و بەرێوەبەرانی نووسینی ئاژانسی ناوبراو تیایدا بەشداربوون، ئەم چیرۆکەی خوارەوەی خستەروو:

— گراند جنکشن، تین . ١٩ — (أ.ب) — سەگێکی راوەدوونراو، نەرمونیان و زیرەك، لەپێشانگای پاڵەوانێتی نەتەوەیی‌دا کەدوێنێ لێرە بەرێوەچوو، لەهەوڵێکدا کەسێ کاتژمێری خایاند، توانی سێ باڵندەی قەڵەو بەترسەوە بفرێنێ.

## باینی باسی لە هەواڵە کرد و گوتی:

پێم وایە لەبەرامبەر وشەی سەگی ڕاوکردندا هەموو خاوەن سەگێکی ڕاوکردن لەو وڵاتەدا لەترسان دەکەونە لەرزینەوە، ئەمەش بەتەواوی وەك ئەوەی دەبێ بڵێی مانگایەك پاڵەوانێتی کانتی دیربی بردۆتەوە.

ئەوانە جۆرێکی تەواو جیاوازن لەسەگی ڕاوکردن، ڕاوچییە پرۆفیشناڵەکان بەتووڕەیی و دڕندەییەوە وەڵام دەدەنەوە ئەگەر ئەو ناوە بدرێتەوە پاڵ یەکێك لە سەگە ڕاوچییە مەشق پێکراوەکانیان.

دووەم، وشەی دەترسێنێ یاخود بەشێوەیەکی مەترسیدارانە دەفڕێ، بەتەواوی پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو وشەیەی دەبوایە بەکاربهێنرایە، چونکە برگەی (بەشێوەیەکی مەترسیدارانە دەفڕێ) مانای ئەوە دەگەیەنێ کەباڵندەکانی تر دەترسێنێ و پاڵیان پێوە دەنێ دووربفڕن. بەڵام ئەو وشە گونجاوەی کەباوە لەو بوارەدا بەکاربهێنرێ، (ئاماژەی پێدەکا) یان ( پیشانی دەدا)یە.

چەند ساڵێکی کەم لەمەوبەر، ڕۆژنامەوانێکی نەفام لەدکتۆر ڕۆبرت میلی کان (کەخەڵاتی نۆبڵی لە فیزیا پێ براوە) دەپرسێ: ئەو سوودە چییە کەتیشکی گەردوونی (کونی) دەیبەخشێ؟، شتێکی لەم جۆرە لەو ڕۆژانەدا کەتیایاندا کێشەکانی جیهان چارەسەر دەکران، تاڕادەیەك وەکو نوکتە یەك وابوو لەنووسینگەی نووسینی ڕۆژنامەکاندا، بەمەش ئەو پەیامنێرانەی ئەرکی ڕووماڵکردنی هەواڵەکانی جیهانیان پێدەسپێردرا لەوە زیاتر توانایان نەبوو کەپرسیاری کاتی چاوەڕوانکراوی فڕینی زاناکە بەرەو مەریخ بکەن، یاخود بازنەی نادیار ئاشکرا بکات و بدۆزێتەوە یان بۆن لەپیاز جیابکاتەوە. بۆیە مایەی سەرسووڕمان نییە کە تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان ، ژمارەیەکی زۆر لەزانایان قسەکردن لەگەڵ ڕۆژنامەوانندا ڕەتدەکەنەوە یان لێی دوو دڵن.

ئەو پەیامنێرەی لەڕووماڵكردنی هەواڵیدا شێوازی شرۆڤەكاری بەكاردێنێ، دەبێ هەوڵ بدات وەڵامێك بۆئەو پرسیارە بخاتە ڕوو كەلە هزری خوێنەر دایە: ئەمە مانای چییە؟

بۆئەوەی پەیامنێری شرۆڤەكار هەواڵ دەربارەی ڕووداوێك دابنێ (لەناوەوە)، پێویستە گرنگی ڕێژەییەكەی دەربخات.

دكتۆر هۆف (D.Huff) كتێبەكەی خۆی ((چۆن لەژمارەكاندا درۆدەكەیت) كە بۆ هەموو ڕۆژنامەوانێك گرنگە، بەئاگاداركردنەوە دەست پێدەكات لەوەی ڕووماڵكردنی بەرفراوانی هەواڵیی بۆ جۆرێكی تایبەتی هەواڵ (بۆ نموونە لەشێوەی هەواڵیی تاوان) لەوانەیە زۆر بەئاسانی لێكدانەوەیەكی شێوێنراو دەربارەی بارودۆخی كۆمەڵایەتیی ببەخشێ.

هۆف نووسیویەتی:

((پرۆگرام و زاراوە ئامارییەكان، لە ڕووماڵكردنی دەرەنجام و زانیارییە كەڵەكەبووەكاندا لەبوارەكانی ئابووریی و كۆمەڵایەتیی و بازرگانیی و پێوانی ڕای گشتیدا دوو مەسەلەی زۆر پێویستن. بەڵام لەنەبوونی ئەو جۆرە نووسەرانەدا كە بەتێگەیشتن و ڕاستگۆیانە وشە بەكار دێنن، هەروەها لەدیارنەبوونی ئەو خوێنەرەی كەتێیان بگات و بیانناسێ، ئەو كاتە دەرەنجام دەبێ بەتەنیا قسەكردنێك)) بەتەنیا پێشكەشكردنی كۆی ژمارەی جۆرە جیاوازەكانی تاوانە ئەنجام دراوەكان لەدوو ناوچە یاخود زیاتردا، لەڕووی كردەییەوە مانای كورت هێنانە لەپێشكەشكردنی چیرۆكی ڕاستەقینەدا، لەكاتێكدا ڕوونكردنەوە پەیوەندارەكان بە شرۆڤەكردنی شێوازەكانی پێشێلكردنی یاسا لەچەند شوێنێكی جیاواز و لەهەمان كات و شوێندا و لەماوەی زەمەنیی جیاوازدا، دەكرێ لە فاكتەرە چاوەڕوانكراوەكانی وەك قەبارە و ئاڵۆزی دانیشتوان و ئەو سیاسەتانەی كەپۆلیس پیادەیان دەكات یاخود لەهۆكاری دیكەدا بدۆزرێنەوە.

پەیامنێر بۆئەوەی بتوانێ وێنەیەکی نزیک لەحەقیقەتی بارودۆخی دانیشتوان (لەهەر گرووپێکدا) بخاتە ڕوو ، پێویستە ڕەچاوی چەند شتێك بکات لەوانە: تەمەنی ئەو گرووپە، خانوو بەرە، شوێنی ئەو خانووبەرانە، شالاوی تازە هاتووان، ئەو کاریگەرییەی دروستی دەکەن، بەو ئاسەوارانەشەوە کەلەئەنجامی لاگیریکردن یان دژایەتیکردنی ئەو جۆرە کەسانەدا دێنە کایەوە، بەهۆی جیاوازی ئەتنیکی یان بنەچەی نەتەوایەتی، ئاینی یاخود هەرهۆکارێکی دیکە. پەیامنێران دەبێ لەچڕی دانیشتوان و کێشەی گواستنەوە و ئاسانکاریەکانی شوێنی چاوەڕێکردنی ئۆتۆمۆبیل و دامودەزگا فێرکاری و خۆشگوزەرانی و ڕۆشنبیریەکان و بڕی داهات و ئاماژەی خەرجییەکانی ژیان و ئاستی گەشەکردنی لادێ و دەورەبەرە نزیکەکان و فاکتەری دیکەی کاریگەریش بکۆڵنەوە.

بەدەستگیربوونی ئەو زانیارییەی و ژمارانە، پەیامنێر دەتوانێ تێگەیشتنێکی ئاشکرای بارودۆخ پێشکەشی خوێنەران بکات، ئەو کارەی وا لەخوێنەران دەکات بتوانن لەپێناوی گۆڕینی ئەو بارودۆخەدا بیر لە چەند ڕێگە چارەیەك بکەنەوە.

بەتەنیا جارڕدانی ڕاستی ئەوەی کەپرۆسەی قەرزدان لەهەموو کاتێك زیاتر ڕووی لەزیادبوونکردووە، مانایەکی کەمی دەبێ، بەڵکو لەوانەیە هیچ مانایەکیش نەبەخشێ، تاخوێنەر نەزانێ چۆن ژمارە وەدیهاتووەکان لەگەڵ ژمارە هاوشێوەکانیاندا لەماوەی چەند مانگ یان چەند ساڵی دیکەدا بەراورد بکات. خشتەو هێڵە بەیانی و وێنە ڕوونکەرەوەکان یارمەتیدەر دەبن لەدەرخستنی ئاڕاستەکاندا. بەناوبانگترین ئەو ڕۆژنامانەش کەخشتە و هێڵ و وێنەی لەوجۆرەیان بە شێوەیەکی کاریگەر بەکارهێناوە ڕۆژنامەی (The U.S.newsand world report)ە.

لەپێناوی خستنەڕووی وێنەیەکی فراوان و ڕوونیش دەربارەی بارودۆخی ئابووریی بەگشتیی، پێویستە لەهەر بوارێکی چالاکی ئابووریدا ژمارەی بەراوردکار پێشکەش بکرێن.

بەزۆری پێویست دەکات ئامانجی کەسانێك لەدوای هەواڵ بزانرێ، بەمەبەستی تێگەیشتنی هەڵوسکەوت و کردەوەی ئەو کەسانە، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا پەیامنێری شرۆڤەکار لەگەڕاندایە و زۆرجاریش بەئاسانی ئەو سەرچاوانەی دەسگیر دەبێ کە زانیارییە وەدەستهێنراوەکانیان بۆ دەگەڕێتەوە... پاش بەسەربردنی ماوەیەکی دوورو درێژیش لەپرۆسەی گەڕاندا و بەو پێیەی کەشارەزای (فێڵەپیشەییەکانە)، ئەو کاتە بەلای کەم توانای ئاماژەکردنی دەبێ بۆ هۆکارە چاوەڕوانکراوەکانی هەڵسوکەوتی چەندین کەس لەوانەی خاوەنی گرنگیی هەواڵین. لەکاتێکدا ئەگەر توانای ئەمەی نەبوو، ئەوا خوێنەران لەبارودۆخی نەزانین لەوەی (چی ڕوودەدات)دا خۆیان دەبیننەوە.

ئەگەر بتەوێ وەکو مێژوونووسێك یاخود وەکو تایبەتمەندێك لەزانستی وەسفکردنی مرۆڤدا بۆ سەردەمەکەت بنووسی، مانای وایە دەبێ شارەزای (قوتابخانە هزرییەکان) و (کەشوهەوای هزری) و ئاراستە کۆمەلایەتیی و ئابووریی و سیاسییەکان بیت. ڕۆژنامەوان دەبێ بزانێ بۆچوون و لێکدانەوەکانی پەروەردەکار کەی لەگەڵ لێکدانەوەکانی زانایەکی پایە بەرز یاخود ڕێکخراوێکی تایبەتمەند یان هەر بۆچوونێکی دیکەدا کە لەشوێنی ترەوە دەربڕاون، یەکدەگرنەوە بەم جۆرە و لەگەڵ دیدێکی هەمە لایەن و قووڵدا، ڕۆژنامەوان دەرکدەکات و بۆی دەردەکەوێ ئەو شتانەی لەبوارە جیاجیاکاندا وەك ئەوە وان کەبریتی بن لە کۆمەڵێك دیاردەی گۆشەگیر، ئەوەیە کە ڕاستی دەرەنجامی ڕیشەیەکی هۆکارییە. بەشێوەیەکی بەردەوامیش هەمیشە ڕوونکردنەوەیەك لەئارادایە: (( لەبەرچی ئەو ڕێگەیەمان گرتە بەر)).

## ٢- شیانی ئەکادیمی:

سەرەڕای ئەوەی هەمیشە چەند هەڵاوێردنێك هەن، بەڵام ئاڕاستە هەنووکەییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕۆژنامەوانانی ئایندە دەرچووی پەیمانگا و کۆلیژە ڕۆژنامەوانییەکان دەبن. خوێندنگا ڕۆژنامەوانییە هاوچەرخەکانیش خوێندنگای پیشەیی نین، هەروەها ڕێژەی نێوان دوو سێیەك تا چوار پێنج یەکی ئەوەی خوێندکاران لەو خوێندنگایانە دەیخوێنن لەهونەرە عەقڵیەکانەوە ( Liberal Arts) (زمان، فەلسەفە ، مێژوو .. تاد) وەردەگیرێن.

هەر شتێك و هەموو شتێك کەڕۆژنامەوانانی ئایندە دەیخوێنن، بەهایەکی ئایندەیی شاراوەی دەبێ بۆ ئەو ڕۆژنامەوانە، شتێکی بێزارکەریش دەبێ کاتێك ئەو ڕۆژنامەوانە نەتوانێ فێری پرۆگرامی خوێندنی تەواو بێ لەزانستە مرۆیی و سروشتی و پزیشکیەکاندا.

ئەو ڕۆژنامەوانانەی دەیانەوێ شارەزایی تەواو لەبوارێکی دیاریکراودا وەربگرن پێویستە ئەوە بکەن، بەڵام زۆربەیان دەبێ بۆ دەستەبەرکردنی پاشخانێکی بەرفراوان و قووڵ و هەمەلایەن لەزانستە کۆمەڵایەتییەکان و زانستی سیاسیی، کۆمەڵناسیی، بەتایبەتیش زانستە ئابوورییەکان تێبکۆشن. جگە لەوە خوێندکار دەبێ بەشی تایبەت بەدارایی گشتیی و زانستی تاوان و کێشەکانی کار بخوێنێ .. دواتر دیراسەکردنی مێژوو دیدگای پێویستی بۆ تێگەیشتنی ڕووداوەکان پێ دەبەخشێ و زانستی دەروونیش لە تێگەیشتنی هەڵسوکەوتی تاکەکەسی و بە کۆمەڵی نزیك دەخاتەوە. لە خوێندنی ڕۆژنامەوانیی پێشکەوتوو وباڵاشدا خوێندکار دەبێ چاوەڕێ بکات چۆنیەتی بەکارهێنانی زانستی تیۆری و پاشخانی بخوێنێ کە توانیویەتی لە میانەی ڕووماڵکردنی هەواڵیی یان لە کاتی شرۆڤەکردنی ڕووداوێکدا دەستگیریان بکات. ڕۆژنامەوان لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکەیدا و لە میانەی ئەنجامدانی کارە

ڕۆژنامەوانیەکانی دیکەدا کە پێی دەسپێردرێ، دەرك بەوە دەکات ( چۆن تیۆر دەگۆڕدرێ بۆ پراکتیك)، ئەگەر شتێکیشی لەفەلسەفە خوێندبێ، تواناداریتر دەبێ چونکە بە شێوەیەکی قووڵتر تێدەگات و لە ژێر ڕۆشنایی گشتیی و بەردەوامیشدا دەتوانێ ڕووداوی ڕاستەوخۆ وخێرا هەڵبسەنگێنێ.

سەرپەرشتیاری ڕۆژنامەوانیی توندوتۆڵ، ئەوەی ئاستی گرنگیی وردبینی دووپات دەکاتەوە، دەتوانێ شێوازو پرۆگرامەکانی لێکۆڵینەوەو بەدواگەڕان فێری ڕۆژنامەوان بکات . دۆزەرەوەی ڕووداو_ ڕاستی ڕۆژنامەوانیی هەرگیز بە پێشەکی و ئەگەری پێشووتر دەست پێ ناکات، پاشان بە دوای چەند ڕاستیەکدا بگەڕێت ئەو ئەگەرانە دووپات بکەنەوە . لێکۆڵەرێك بەدوای ڕاستیدا ، خاوەن هزرێکی کراوە، دەپشکنێ، دەگەڕێ ولە هەموو ڕێگەیەکەوە لە ڕاستی دەکۆڵێتەوە، تەنیا دوای تەواوبوونی هەموو دەرفەتێك بۆ دەستگیرکردنی زانیاریی زیاتر هەوڵی گەیشتن بەو دەرەنجامانە دەدات کە پەیوەندییان بەو بابەتانەوە هەیە کە کۆیکردوونەتەوە. ئەو نزیکبوونەوە بابەتیە لە مەعریفە لەو پرۆگرامە تەندروست ترە کە چەندین لێکۆڵەر لە بوارە زانستیەکانی تر بەکاری دێنن. لە میانەی ئەو ڕاهێنانەشدا، خوێندکاری _پەیامنێر دەگاتە ئاستی دەرککردن بە سروشتی ئەو بابەتەی کە لە سەرچاوەیەکەوە دەستی کەوتووە . دەتوانێ بە قووڵی بخوێنێتەوەو ژمارەکانی بودجە یاخود لە ڕاگەیاندنەکانی بەرپرسێك و دەرچوونی یاسایەك و......تاد، تێ بگات.

هەر لە جەنگی دووەمی جیهانیەوە، ژمارەیەك لە زانایانی زانستی کۆمەڵناسی بایەخیان بە دیراساتی چەندیی ئاراستە جۆراوجۆرەکانی هەڵسوکەوتی کۆمەلایەتیی و تیۆری پەیوەندیکردن دا . ئەوان ئامرازە کەسیەکانی سەرژمێری کارو زمانی زانای کۆمەلایەتیی بەکاردێنن، بۆ ئەوەی ئاسەوارەکانی ئەو شێوازە جۆراوجۆرە بەکارهێنراوەنە دیراسە بکەن وبپشکنن بۆ هێنانەدی کاریگەری بەسەر هزرو هەڵسوکەوتی مرۆیدا . ئەو دەرەنجامانەش کە ئەم زانایانە پێیان گەیشتن ،

سەبارەت بە پیاوانی پروپاگەندە و پەیوەندییە گشتیەکان، ئەوانەی خاوەنی شتومەك وهزرن ومەبەستیانە بیانفرۆشن وبیانگەیننە بازارو گرنگیی زۆریان هەبوو. زانینی ویست وخواستەکانی ئەو کەسانەو ئەوەش کە بۆ وەدیهێنانی تێدەکۆشن، بۆ ڕۆژنامەوانیی دروست مەسەلەیەکی گرنگ و بایەخدارە، بەوپێیەی ڕۆژنامەوان پارێزەرو بەرگریکەری قوربانییە چاوەڕوانکراوەکانی ئەوانە.

## ٣-تازە ڕۆژنامەوانێك Cab Reporter

ئەو ڕۆژنامەوانە تازە دەرچووە کەسێکی بەختەوەر دەبێ کاتێك کاری یەکەمی ڕێگەی پێ دەدات بنووسێ ولە ڕووی هەواڵییەوە ڕووماڵی ڕووداوەکان بکات. ئەو تازە دەرچووە دەبێ دوور بکەوێتەوە لەوەی کە لە نوسینگەی نووسینی ڕۆژنامەدا خۆی بمرێنێ و کاری تەنیا بریتی بێ لەوەرگرتنی هەواڵ لە ڕێگەی تەلەفۆن یاخود پێداچوون و داڕشتنەوەی هەواڵ، یان ئەوە بێ لە ڕادیۆو تەلەفزیۆندا لە ژوورەکانی نووسینی هەواڵ دابنیشێ، ئەو ژوورانەی تیایاندا تەنیا سەردێڕی هەواڵەکان دادەڕێژنەوە، بە جۆرێك لەگەڵ سروشتی ئەو دوو دەزگایەدا بگونجێن. بۆ چاودێری کردنی واقیعی (خاو) ی ژیان هیچ شوێنێك لە دادگاو بنکەکانی پۆلیس گونجاوتر نییە. لەو شوێنانەدا پەیامنێر چاوی بە نووسەر وشانۆنووس و نووسەرانی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکان و زانایانی بواری کۆمەڵناسی ویاساناس و خوێندکاری دیکە دەکەوێ، ئەوانە لە پێناوی تێگەیشتن وبەکارهێنانی تایبەت بە خۆیان سەرقاڵی چاودێریکردن و کۆکردنەوەی زانیاریی ڕاست وبەڵگەدار دەبن. ئەمانە ئەو شوێنانەن کە تیایاندا لێکۆڵەر بە واقیع دەگات، بەو مانایەی کە لەگەڵ لایەنی بوارەکانی ژیان و گرفتە کۆمەڵایەتیەکان و لاوازیی مرۆیی، هەروەها لەگەڵ نموونە هەمە جۆرەکانی کەسایەتیەکان ڕووبەڕووی یەکتر دەوەستن. ڕۆژنامەوانیش ئەگەرچی لەوانەیە زۆر جەختنەکات کە تا کاتێکی دیارینەکراو ڕووماڵکردنی ئەو جۆرە

بابەتانەی پێبسپێردرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەزموونێکی دەوڵەمەندە و دەبێ پێیدا تێپەڕ ببێ.

هەروەها ڕاهێنانی ڕۆژنامەوانیی هەمەلایەنی یەکەم دەبێ جۆرە پەیوەندیکردنێك بە سیاسەت و حوکمەت بگرێتە خۆی، بەو پێیەی هەردوولا سەرچاوەی وشك نەبووی ئەرکە گشتیەکانن: کۆبوونەوە، وتار، ژیاننامە، ڕووداو، دیمانە، کاری ڕۆتینی، هەواڵیی کۆمەڵایەتیی.........تاد. دوابەدوای چەند ساڵێکیش لە ئەنجامدانی ئەو ئەزموونە ، ڕۆژنامەوانیی تازە دەتوانێ بیر لە جێگیربوون و سەقامگیریی بکاتەوە، واتە وەرگرتنی تایبەتمەندیی لە بوارێکی دیاریکراودا.

## ٥- ئامرازە یاریدەدەرەکان Occupation Aids

توانای بەکارهێنانی ئامێری چاپکردن مەسەلەیەکی گرنگ وبنەڕەتیە، پەیمانگای زۆریش هەن وانەی تایبەتی سەبارەت بە فێربوونی بەکارهێنانی ئەو ئامێرانە پێشکەش دەکەن، واش بە باشتر دەزانرێ خوێندکار پێشتر خۆی لەسەر هەندێك نەریت ڕانەهێنابێ کە پێویست بە ڕاستکردنەوەیان بکات. تا ماوەیەکی زۆر درەنگیش ، ژمارەیەکی کەم لە پەیامنێران هەستیان بە پێویستبوون بە کورتکردنەوە دەکرد، چونکە ئەرکی تۆمارکردن کە لە ڕابردوودا هەوڵ دەدرا زۆر بەکاربهێنرێ، لە جیاتی خێراکردن بووە هۆی سستکردنی پرۆسەی گواستنەوەو نووسین. بەڵام ئێستا، کاتێك پێویست دەبێ لەگەڵ چەند پەیامنێرێکی دیکە دیمانەیەکی هەواڵیی ڕۆژنامەوانیی لەگەڵ سەرچاوەکان ئەنجام بدەیت یاخود لەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانیانەدا ئامادە بیت کە تیایاندا بوار بە ژمارەیەکی کەمی ڕۆژنامەوانان دەدرێ پرسیار بکەن، لەو حاڵەتەدا تۆمارکردنی هەموو ئەوەی دەگوترێ، وشە بە وشە، دەبێتە مەسەلەیەکی گرنگ و بایەخدار. هەروەها باشتر وایە گفتوگۆو شایەتیی لە دادگاو لە بەردەمی لیژنەکانی لێکۆڵینەوەو گوێگرتن، بە

بەکارهێنانی کورتکردنەوە تۆماربکرێ، لە بەر ئەوەشە ژمارەیەکی زیاترو زیاتری ئەو پەیامنێرە تایبەتمەندانەی لەو بوارەدا کاردەکەن فێری کورتکردنەوە دەبن. ئەوانەی زۆر کارناکەن، شێوازی تایبەتی خۆیان لە کورتکردنەوە پێشدەخەن، لەوانەشە فێری جۆرێك لە سیستەمە بازرگانیەکان ببن کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشت بە کورتکراوەی ئەو بڕگەو پیتانە ببەستن کە بە کارهێنانیان بلاّوەی کردووە. ئەو پەیامنێرەی توانیویەتی شێوازێکی تایبەت بە کورتکردنەوە دابهێنێ، بە زۆری بۆ ئەو دەربڕینانەی کە بەکارهێنانیان دووبارەدەبێتەوە ، کورتەی وشەکان دادەنێ، بۆ نموونە(2)لە جیاتی (To)و(c) لە جیاتی (See )و (U) لە جیاتی (You) و(R) لە جیاتی Are و........تاد، بەکاردێنێ، جگە لەوە پەیامنێر دەتوانێ لەو تێبینیانەدا کە تۆماریان دەکات نووسینی ( هیجائی) ئاسانکراو بە کاربهێنێ، وەك نووسینی (rr) لە جیاتی (Rail Road) و(Inc) لە جیاتی (Incomplete )و ....تاد. هەروەها لەوانەیە وشەی بیانی کورتتر لە ئینگلیزی بە کاربهێنێ وەك: (selon)ی وشەی فەرەنسی لە جیاتی (According to)ولە جیاتی (capital punishment) هەردوو پیتی (cp)و لە جیاتی ( Labor Union) هەردووپشتی (LU)بەکار بهێنێ، بەلاّم لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانیی و چالاکییە گشتیەکاندا، تەنانەت لە هەندێك دیمانەی ڕۆژنامەوانیشدا ئامێری (ریکۆردەر) بە بەرفراوانی بەکاردەهێنرێن، زیاتریش وەکو ڕێگەیەك بۆ پاراستنی تەوەرەکانی ( ئەو ڕۆژنامەوانەی گفتوگۆ Interviewerئەنجام دەدات)و تەوەرەکانی (کەسایەتیەکان کە گفتوگۆیان لەگەڵ ئەنجام دەدرێ (Interviewee)، بۆ ئەوەی لە پرۆسەی گواستنەوەی وتەکاندا بەرزترین ئاستی وردبینی مسۆگەر بکرێ. مەترسیەك لە ئارادایە لەوەی ئەو جۆرە گفتوگۆیانە شێوازی فەرمیانەی زیاتر وەربگرن، چونکە بوون وبەکارهێنانی ئامێری ریکۆردەر لەوانەیە وا لەو کەسایەتیە بکات کە گفتوگۆی لەگەڵ سازدەدرێ، لە قسەکانیدا ئاگاداروخۆپارێزتربێ . لە کاتی بەکارهێنانی وێنەگرتنی سینەمایی یان

تەلەفزیۆنیشدا دەکرێ هەمان شت بگوترێ. ئاشکراشە ڕۆژنامەوان دەبێ چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەو ئامێرانە بزانێ، ئەگەر چی لە ڕۆژنامە گەورەکاندا کەسانی تەکنیکار ئەو کارە دەکەن، هەروەها هەندێك سەندیکای کرێکاران هەن ڕێگە بە پەیامنێران نادەن ئەو کارە بکەن. داهێنانە تەکنەلۆژییە تازەکان لە بواری پەیوەندیکردندا ، لە شێوەی ئامێرەکانی FacsimileوfaxوUltra و کۆمپیوتەرو مانگە دەستکردە تایبەتەکان بە پەیوەندیکردن وئەو کۆمپیوتەرانەی توانای وەرگێڕانی زمانەکانیان هەیەو خوێندنەوەی برگە نووسراوەکان بە هۆی دەست و نووسین بە ئامێری چاپکردن و وەرگێڕانی وشەی دەربڕاو بۆ وشەی نووسراو لەسەر شریتی کونکراو. ئەو داهێنانانە لە پرۆسەی پەیوەندیکردن و دەسگیرکردنی زانیاریی و چارەکردن و گواستنەوەیاندا گۆڕانکاری گرنگیان هێناوەتە کایەوە، بەلام سەرەڕای گرنگیی ڕوو لەزیادبووی تەکنۆلۆژیا لە بواری ڕووماڵکردنی هەواڵیدا ، توخمی مرۆیی_پەیامنێر The Reporter–بە بازنەی بنەڕەتی دەمێنێتەوە لە پرۆسەی کۆکردنەوەی هەواڵ و گواستنەوەیاندا، بەمەش هەرگیز نابێ ڕاهێنانی توخمی مرۆیی پشتگوێ بخرێ، وێڕای ئەو توانا تەکنیکیانەش کە لە ئایندەدا دێنە پێشەوە.

## پێنجەم: ئیتیکی ڕۆژنامەوانیی
## The Ethics of Journalism

لە کاتی بیرکردنەوەدا لە پیشەی ڕۆژنامەگەریی، هەرلاوێك کە خاوەنی هۆشیاریەکی کۆمەڵایەتیی گونجاو بێت ، دەبێ لە خۆی بپرسێ: ئەو بڕە چەندەکە دەبێ لە دەروونی خۆمی بفرۆشم؟.

سەبارەت بەوەی کە تایبەتە بە ڕۆژنامەوانیی ، ئەو لاوە مەبەستیەتی ڕوونکردنەوەیەکی تایبەت بەو تۆمەتبارکردنانەی دەستبکەوێ کە گوێبیستیان بووەو بریتی بوون لەوەی کە شێوازەکانی ڕاگەیاندنی جەماوەری چەند سەرمایەدارێکی پارێزگارو دواکەوتوو خاوەنداریان دەکەن و بەڕێوەیان دەبەن ومەبەستی سەرەکییان وەدیهێنانی بەرزترین ئاستی قازانجە لەوەی خزمەتکردنی کۆمەڵگا بێ، سیاسەتی داڕشتن ونووسینی هەواڵیش تاڕادەیەکی زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەریی گرووپە بەهێزەکانی فشارەوە، بەمەش تاکی پەیامنێر بۆ ئەوەی بمێنێ وبەردەوام بێ، پێویستە ئەو هەواڵانەی بە زۆری لە میانەی شێوازی نا ئەخلاقیدا کۆیان دەکاتەوە، حەشاریان بدا، گومڕایان بکات، زیادەڕۆیی بنوێنێ و بیانشێوێنێ، ئەمانەش زیاتر ئەو هەواڵانە دەگرێتەوە کە بریتین لە: پێشێلکردنی تایبەتمەندێتی و خیانەتکردن لەو متمانەیەی ئەوانە پێیان بەخشیوە کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات.

## ١- ماف و ئیمتیازەكانی ڕۆژنامەوان

ڕەتكردنەوەی ڕاشكاوانەو بنەبڕی ئەو جۆرە تاوانباركردنانە مەحاڵە. بێگومان مومارەسە ڕۆژنامەوانییە هەڵەو ونابەجێكان لەهەندێك شوێندا هەن و بەدیدەكرێن، لەوانەشە بۆ دڵدانەوە نەبێ ئەگەر بزانین چاوخشاندنەوە بە مێژوودا دووپاتی دەكاتەوە كە بەدترین گوناهبار و تاوانباران دەبێ بە تەواوی و ڕەهایی ملكەچ بكەن و خۆیان بەدەستەوە بدەن.

ڕادەیەكی دیاریكراو هەیە بۆ دەربڕینی هاوسۆزی بەرامبەر بەو ڕۆژنامەوانەی هەڵە و مومارەسە نابەجێكانی دەخاتە ئەستۆی بەرپرسانیەوە، هیچ سەرنووسەرێك مافی ئەوەی نییە داوا لە ڕۆژنامەوان، بەردەستی بكات بەپێچەوانەی ویژدانی خۆی بجوڵێتەوە وپێوەرە ئەخلاقییەكانی پێشێل بكات. هەروەها ئەركە (نابەجێكان) دەدرێنە پاڵ ئەوانەی لەسەرەتای دەستپێكردنی ژیانی ڕۆژنامەوانییاندا بەجێبەجێكردنی ئەو جۆرەكردەوانە ڕازی دەبن، كەمن ئەو پیشانەی تیایاندا بەكرێگیراوان بتوانن (بەرگری) لەكاربەدەست یاخود سەرۆكەكانیان بكەن، وەك چۆن ئەمە لەڕۆژنامەوانیدا هەیە، هەروەها پەیامنێری وردبین و بەسەلیقەش لەهەموو ڕۆژنامەو گۆڤارەكاندا دەرفەتی فراوانی لەبەردەمدایە بۆئەوەی بتوانێ قەناعەتی بڵاوكردنەوەی ئەوەیان پێ بێنێ كەپێی وایە ڕاستە.

پاڵنەری داراییش بۆ بڵاوكار هەر چۆنێك بێ، بەڵام كەسی پەیامنێر كەسەرقاڵی جێبەجێكردنی ئەركەكەیەتی نەكەوتۆتە ژێركاریگەریی ئەو پاڵنەرەوە، ئەمەش بەپێچەوانەی كارمەند یان كەسی شتفرۆش، كەهەست دەكات بەرپرسیارێتیەكەی بریتیە تەنها فرۆشتنی زەردەخەنەو ئەو موجامەلەكردنەی كەبەهۆیانەوە پێشوازی لە كڕیارەكانی دەكات و دووریش نییە ناڕاست و ساختە بن.

پارێزەرانیش بەشێکیان لەبەرژەوەندی ئەو کەسانەدا پێ دەبڕێ کەکاریان کەوتۆتە لایان، بەڵام زۆر ئەستەمە کەسێکی شیاو بدۆزیتەوە بتوانێت بەردی بناغە بۆ بنیاتنانی ڕۆژنامەوانێکی کارا دابنێت.

## ٢- سیاسەتی ڕۆژنامە News Paper Policy

گومان لەو ڕاستیەدا نییە کەڕۆژنامە و شێوازەکانی دیکەی ماس میدیا، بریتین لە پرۆژەی بازرگانیی زەبەلاح، کەسانێکی دەوڵەمەند و پارێزگار خاوەنداریيان دەکەن و بەڕێوەیان دەبەن، زۆربەی ئەو بڵاوکارانە زیاتر لەوەی پێیان دەگات شایستەی پێداهەڵگوتن و ڕێزگرتنن بەهۆی ئەو ماندووبوونەی کەلەپێناوی قەدەغەکردنی مەیل و مەبەستە تایبەتییەکانی خۆیاندا دەینوێنن، بۆئەوەی نەبنە مایەی شێواندنی دروستیی و دادپەروەریی و هاوسەنگیی ڕووماڵکردنی هەواڵەکان و ڕاست نییە ئەگەر بوترێ لەڕۆژنامە گەورەکاندا خاوەن ڕاگەیاندنەکان یارمەتیدەری سەرەکین و سیاسەتی هەواڵیی و نووسین دیاریدەدەکەن. گومان نییە لەوەی کەلە ڕۆژنامە گەورەکاندا (بەتایبەتی) خاوەن ڕاگەیاندنەکان زیاتر پێویستیان بەڕۆژنامە هەیە لەوەی ڕۆژنامەکە پێویستی بەوان هەبێ‌و سیفەتی پارێزگاری کەڕۆژنامە گەورەکان پێی دەناسرێنەوە و لەهەموو کاتێکیش زیاتر ئەو وەختانە دەردەکەون کەڕەزامەندی سەبارەت بەهەڵوێستەکانی سەرۆکایەتی دەنوێنن سەبارەت بەبابەتە نەتەوەییەکان، ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڕاستگۆیانە دەرکەوتووە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ ئەمە بەهۆی نەبوونی داناییەوەیە لەبۆچوونە دروستەکانی خاوەن ڕۆژنامەکاندا یان نا، ئەوانە لەبەرامبەر خوێنەر و ڕەخنەگرتن لەخەڵکانی تردا زۆر هەستیارن، لەکاتێکدا ئەو لێکۆڵینەوانەی سەبارەت بەچارەسەرکردنی هەڵمەتەکانی ١٩٦٠ – ١٩٦٤ ئەنجام دران جەختییان لەسەر دادپەروەریی و هاوسەنگییەکی نائاسایی کردەوە، ئەمەش دوای هەندێك تاوانبارکردنی توند لەهەڵمەتەکانی ١٩٥٢ – ١٩٥٦دا هات.

ڕۆژنامەوانیی ئەمەریكی، نەفامییەكی نیشتمانییە، ئەوكارەی وادەگەیەنێ كەبەزۆری پەلە دەكات و بەئاسانیش هەڵدەخەڵەتێ و نابەجێیانەش خوێنەرانی ئاڕاستە دەكات لەمیانەی پەلەكردن لەبڵاوكردنەوەی ئەو بەیاننامە و ڕاگەیاندنانەی كەكەسایەتییە فەرمییە پایەدارەكان ڕایاندەگەیەنن و دواتر دەردەكەوێ كەپێویستیان بەڕاستكردنەوە، بگرە تەنانەت بە درۆخستنەوەش هەیە. لەكۆتایی جەنگی دووەمی جیهانییەوە، زۆربەی هەرەزۆری ڕۆژنامە ئەمریكییەكان و گۆڤار و ڕادیۆ و تۆڕە تەلەفزیۆنییەكان و شێوازە ماس میدیاییەكانی تر هەڵوێستی لایەنگری ڕەخنەنەگر لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریكا، دەنوێنن. هەر خوێنەرێكی ئەمەریكی كەتەنیا بەخوێندنەوەی ناونیشانی هەواڵەكان وازناهێنێ، بەباشیی دەزانێ كەڕۆژنامەوانیی ئەمەریكی هەرگیز ملكەچی ئەو پێشنیازانە نەبووە كەچاودێری (ڕووی دیكەی) هەواڵەكان دەكەن، لەزۆربەی حاڵەتەكانیشدا كاتێك جۆرە شێواندنێكی هەواڵیی بڵاودەكرێتەوە، ئەوكاتە سەرچاوەی ئەو هەواڵە بەتاوانباری سەرەكیی و گرنگ دەزانرێ نەوەك ئەو شێوازە ڕاگەیاندنەی بڵاویدەكاتەوە.

گومان نییە لەوەی كەپەیامنێران (بەتایبەتیش) لەسەرەتای ژیانی ڕۆژنامەوانییاندا خۆیان لەقەرەی شێواندن نادەن، هەروەها یەكێك لە گرنگترین دەرەنجامە لاوەكییە بەسوودەكان بۆ دابەزینی ئاستی پێشبڕكێ، بریتییە لەلاوازیی حەز بزوێنیی گرتنەبەری شێوازی نائەخلاقی بۆ دەسگیربوونی هەواڵێكی وروژێنەر و گرنگی ڕۆژنامەوانیی كەهێشتا بڵاونەكرابێتەوە.

ژمارەیەكی كەمی پەیامنێران خۆیان دووچاری دزینی وێنە، یان نواندنی ڕۆڵی پۆلیس یاخود لێكۆڵەری تاوان دەكەنەوە، لەكاتێكیشدا ئەگەر ئەو پەیامنێرانە نەیانتوانی ڕوانینێكی قووڵ و هەمەلایەنانەتر پێشكەشبكەن، مانای وایە ئەوان خودی خۆیان خاوەنی ئەو ڕوانینە قووڵە نین بۆ ڕووداو، لەلایەكی دیكەوە، ڕۆژنامەكان لەپێناوی ئاشكراكردنی گەندەڵی و دڵنیابوون لەڕاستیی ڕووداوەكان، یاخود دەرخستنی ئەو ڕاستیانەی كەلەلایەن جەماوەرەوە گرنگن و خزمەتی

بەرژوەندییەکانیان دەکەن، پارە و پوول و کات و توانایەکی زۆریان تەرخان کردووە.

## ٣- پێشێلکردنی تایبەتمەندێتی Invation of privacy

هیچ ڕوونکردنەوەیەکی شەرعی یاخود یاسایی نییە ئاستی مافی ئەو تایبەتمەندێتیە دیاری بکات کەهەر کەسێك هەیەتی، بەڵام بەشێوەیەکی گشتیی دان بەو ڕاستیەدا نراوە کەهەر کەسایەتییەك ئەگەر مایەی بایەخ و گرنگیی جەماوەر بێ، وەك سیاسەتمەدار و ئەکتەران، زۆربەی ژیانی تایبەتی خۆیان دەکەن بەقوربانی، هەروەها کەسانی دیکەی وەك شایەتی ڕووداو و تاوانەکان و هی تری لەو بابەتانە، بەپێی ویستی خۆیان بڕێکی ژیانی تایبەتییان لەدەستدەدەن. هەندێك کەس پێیان خۆشە کەسانی دیکە باسیان بکەن، هەندێکی تریش دڵیان بەمە خۆش نابێ.

زۆربەی ڕۆژنامەکان ناوی ئەو منداڵانە بڵاوناکەنەوە کەبۆیەکەم جار تاوان ئەنجام دەدەن، جگە لەوە ناوی کەسوکاری تێوەگلاوان و قوربانییانی دەستدرێژی کردنە سەر و ئەتککردن و هی تریش بڵاوناکەنەوە. لەمیانەی کۆنگرەی لووتکەی ڕۆژنامەگەرییدا سەبارەت بەو جۆرە سیاسەتی بڵاوکردنەوەیە ڕێککەوتنکراوە، پەیامنێرە تازەکانیش دەبێ بزانن کەسەرۆك و بەرپرسانیان لایەنگری لەو بڕیارە بنەڕەتیانە دەکەن کەدەیاندەن.

## ٤-دەركردنی بڕیاری پەیوەندار بەڕوومالْكردنی هەواڵیی
## Reportorial Decision making

ئەم شتە دیسان سەبارەت بەزۆر مەسەلەی پەیوەندیدار بەئەخلاقی سیاسییەوە ڕاستە، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بەوەوە هەیە ئاخۆ پەیامنێر لەگرنگیی تەقینەوە پشێوییە ڕەگەز پەرستییەكان یان ئاستی ورووژاندن لەچارەسەركردنی كێشەكانی سێكس و تاوان یاخود قەبارەی وردەكارییەكان و تەنانەت ڕاستییە پەیوەندیدارەكان بەڕووداوێكی خۆكوشتن یان بەكێشە نەتەوەیی و ڕەگەز پەرستیەكان، كەم دەكاتەوە یان زیاتر دەریان دەخات. پەیامنێر كاتێك بەتەواوی دەرك پەوە دەكات كەبەگوێرەی سیاسەتی ڕۆژنامە كاردەكات، دەتوانێ بەرپرسیارێتی بخاتە ئەستۆی بەرپرسەكەیەوە.

ئەو بڕیارە بێزاركەر و نابەجێیەش كەدەبێ لە هەندێك كاتدا پەیامنێر بیدات ئەوەیە ئاخۆ گوێی لەڕاگەیاندن و بەیانە (نافەرمییەكان) گرتووە، بەمانای ئەوەی ئایا بەمتمانەوە زانیارییەی وەردەگرێت. لەهەندێك حاڵەتەدا، لەڕێگەی پەیماندان بەوەی كە پشت بەقسەی سەرچاوەی هەواڵەكان نابەستێ و وتەكانی ناگوازێتەوە، پەیامنێر دەتوانێ زانیاریی و ڕاستیی وا دەستەبەر بكات گەڕای گشتیی مافی خۆیەتی بیانزانێ و شارەزایی دەربارەیان هەبێ، هەروەها دەتوانێ سەرە داوێك بدۆزێتەوە و بەدوایدا بچێ بەبێ ئەوەی سەرچاوەكەی تێوە بگلێنێ، هەندێك جاریش

پەیامنێر دەبینێ کەڕێگەی بەخۆی داوە ڕووداوێك پشتگوێ بخات، زۆر ئاستەمیشە بتوانرێ ڕێسایەك دابنرێ و بکرێ لەهەموو هەڵوێستێکدا پیادە و ڕەچاوبکرێ، تەنیا شتێك هەیە گومانی لەبارەوە نییە ئەویش ئەوەیە:

ئەگەر پەیامنێر پەیمانێکی دابێ، لەسەریەتی بیپارێزێ و پابەند بێ پێیەو، ژمارەیەك لەڕۆژنامەوانان لەبەرئەوەی ڕازی نەبوون بەوەی ئەو متمانەیە بدۆڕێنن کەسەرچاوەی هەواڵ پێیانی بەخشیوە، دووچاری بەندکردن بوونەتەوە.

## ٥–ئازادیی ڕۆژنامەگەریی

## Freedom of the press

بۆ ئەنجامدانی هەر پرۆسەیەکی هەڵسەنگاندن و بەهادارکردنی دروست و لەبار بۆهەر کارێکی ڕۆژنامەوانیی، دەبێ ئەو ئامانجە سەرەکییە لەهزردا بخولێتەوە کەدەستوور بۆ ئازادیی ڕۆژنامەوانیی دیاریکردووە و ڕێگەی پێداوە.

لەلایەك، باوك و باپیرانی دامەزرێنەر ویستوویانە هەرجۆرە دەستێوەردانێکی حکومیی و سانسۆرێکی پێشوەختە لەسەر بڵاوکردنەوەی هەواڵ قەدەغەبکەن و ڕێگەی لێ بگرن، زیاتر بەمەبەستی خزمەتکردنی بەرژەوەندیی جەماوەر و ڕای گشتیی، لەکاتێکدا ئەوان سەدەکانی خەبات و تێکۆشانیان لەیادە کەبەریتانیا لەپێناوی وەدەستهێنانی ئەو جۆرە مافانەدا بەخۆیەوە بینیوە، لەلایەکی دیکەشەوە، مەبەست لەئازادیی ڕۆژنامەگەریی ئەوەش بووە کە ببێتە ئامرازێکی ئەرێیی بۆ پشتگیرتنی دەرفەتەکانی سەرکەوتنی حکومەتی ئەزموونیی، لەپێناوی گەل و لەڕێگەشیەوە. (مافی زانین) پارێزگاریی لێ کرا. باوك و باپیرانی دامەزرێنەریش ئەگەر باوەڕیان وابوایە کەشێوازێك لەشێوازەکانی یاسادانانە حکوومیەکان لەوانە بوو بەباشترین شێوە خزمەت بکەن و ئەو ئامانجەش وەدی دەهێنن، بێ گومان دایان دەنا، بەڵام بە هەرحاڵ، هەستیان بەپێچەوانەی ئەمەکرد.

ئازادی بەرفراوان، بۆ هەرلایەن و بۆهەمووان لەوەی بەپێی ویستی خۆیان قسە بکەن وشت بڵاوبکەنەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو ویستەیان ناڕاست و نادادپەروەرانەو ناهاوسەنگیش بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بۆماوەیەکی دوورودرێژ بەباشترین شێواز خزمەتی بەرژەوەندییەکانی جەماوەر دەکات. بەم جۆرە ئازادیی ڕۆژنامەگەریی شێوازێکە بۆ هێنانەدی ئامانجێکی دیاریکراو، بەڵکو لەبنەڕەتدا ئامانجیش نییە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەو ئامانجەشدا، خوێندنەوەی ئەو ئەنجامانەی کەپەیمانگای گالوب و پەیمانگای دیکەی تایبەت بەپێوانی ڕای گشتیی پێی گەیشتوون، نابنە مایەی هاندان و گەشبینی، ئەو دەرەنجامانە نەزانی و نەفامییەکی گەورە و بەرفراوان سەبارەت بەو ناوو ڕووداوانە دەردەخەن کەلەهەواڵەکاندا باسیان لێوە دەکرێ.

پێمان وایە گلەیی و گازاندەکردنیش تەنها ئەو ڕۆژنامەیە ناگرێتەوە کەدەخرێتە ژێر دەست و فرمانی جەماوەرەوە، بگرە دەبێ لەماڵ و خوێندنگا و کڵێساو شوێنی دیکەشدا لێی بکۆڵدرێتەوە. ئاساییە ئەگەر هۆکاری ئەمە ئاڵۆزی کۆمەڵگا هاوچەرخەکەمان و هەستنەکردن بەهێمنیی و ئاسایش بێ، ئەگەرچیش ڕۆژنامەگەریی مۆنۆپۆڵی گەیشتۆتە ئاستێك کەتەنیا یەك بۆچوون دەربارەی کێشە گرنگ و زەبەلاحەکان دەخاتە ڕوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەك گۆڤاری لیبراڵ و ڕۆژنامەی تایبەت ماون و دەکرێ بەشداریان تێدابکرێ.

لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا (کەبەهۆی فێربوونەوە یەکێکە لەگرنگترین گەلەچاوکراوەکان)، بەڵام دەشێ کەسانی نەفام و شێتیش هەبن، بەهەمان شێوە هەرگیز دروست نییە ڕۆژنامەوانیی بکەینە قوربانی و (وێڕای هەموو کەمتەرخەمی و هەڵەکانیش) بەرپرسیارێتی گوێنەدانی جەماوەری بخەینە ئەستۆ. لەوبوارەدا دەکرێ بەرگریکردنی ڕۆژنامەوانیی لە ئازادیی و مافەمەدەنییەکان شتێکی سوومەند بێ، بەڵام لەکاتێکدا کە ڕۆژنامەوانیی سەرقاڵی ئەنجامدانی ئەو کارەیە، هەنگاوێك دەبڕێ لە دژایەتیکردنی هێزە نادیموکراسییەکاندا . کەسی تازە هاتوو بۆ نێو بواری

ڕۆژنامەوانیی بتوانێ هەرشتێك پێشکەش بکات، دوورنییە ببێتە مایەی باشترکردن وپێشخستنی ڕۆڵی ڕۆژنامەوانیی لەو بوارەداو دواتر دەچێتە خانەی خزمەتی بەرژەوەندیی گشتیی ، دەرفەتە ڕێ پێدراوەکانیش بۆ ئەو جۆرە خزمەتکردنە لەوانە زیاترە کە دەکرێ ئەو لاوە لە زۆربەی شوێنەکانی دیکەدا بیدۆزێتەوە، لە ڕاستیشدا ئەو ناتوانێ لەمە زیاتر بکات غەیری ئەوە نەبێ پیادەکردنی ڕێکەوتنامەی ڕابیتەی ئەمریکی بۆ نووسەرە ڕۆژنامەوانەکان بکات، ئەو ڕێکەوتنەی کە لە نیسانی ساڵی ۱۹۲۳دا بڕیاری لەسەر دراو تیایدا هاتووە، ئەرکی بنەڕەتی ڕۆژنامەکان بریتیە لە گواستنەوەی کاروکردەوەو چۆنیەتی بیرکردنەوەو شێوازی هەستکردنی ئەندامان بۆ خودی ڕەگەزی مرۆڤایەتی ، بەرفراوانترین ئاستی ڕۆشنبیری و زیرەکیی و مەعریفەو ئەزموون بن، وێڕای هێزە خۆڕسك ودەسکەوتوو وڕاهێنراوەکان لەسەر تێبینی وبیرکردنەوەو شرۆڤەکردن، هەروەها شتێکی دیکە بە سیفەتی ڕۆژنامەوانییەوە بەندە کە پابەندبوونەکانیەتی وەك مامۆستاو شرۆڤەکار، بەمەبەستی دۆزینەوەی چەند شێوازێکیش بۆ گەیشتن بە ڕێسا دروستەکانی مومارەسەکردن وخواستە پاساودارەکانی ڕۆژنامەگەریی ئەمریکی ، ئەم یاسایانەی خوارەوە دانراون :.

–بەرپرسیارێتی : هیچ شتێك مافی ڕۆژنامە دیارناکات لەوەی خوێنەران بۆ خۆی ڕابکێشێ وزیاد بکات تەنیا ئیعتباری خۆشگوزەرانی و دڵخۆشی کۆمەڵگا نەبێ . ئەو سوودەی ڕۆژنامە لە بەشداربوونی بایەخ و گرنگیی گشتیدا بەدەستی دێنێ ، هەر ئەویش هەستکردنی بەبەرپرسیارێتی دیاریدەکات ، ئەو هەستەی دەبێ لەلای هەموو کارمەندانی ڕۆژنامە هەبێ. ئەو ڕۆژنامە نووسەش کە هەر جۆرە شێوازێکی خۆویست وپڕووپووچ بەکاردێنێ، کەسێکە شایستەی ئەو بڕواو متمانەیە نییە کە پێی دراوە .

–ئازادیی ڕۆژنامەگەریی: دەبێ ئازادیی ڕۆژنامەگەریی بە مافێکی بنەڕەتی دابنرێ بۆ ڕەگەزی مرۆڤایەتی ، مافێکی دروست و نەگۆڕە ومایەی مشتومڕیش نییە کە بە ئاشکراو ڕاشکاوانە گفتوگۆ دەربارەی هەرشتێك بکەیت کە یاسا قەدەغەی نەکات، بەو یاسایانەشەوە کە کۆت و بەندکراون.

–سەربەخۆیی: سەربەخۆبوون لەهەر جۆرە پابەندییەك جگە لە دڵسۆزی بەرامبەر بە بەرژەوەندیی گشتیی ، مەسەلەیەکی بنەڕەتی وسەرەکییە.

أ–خستنە پێشەوەی هەربەرژەوەندیەکی تایبەت لەسەر بەرژەوەندیی گشتیی ، ئینجا ئەمە لەبەر هەرهۆکارێك بێ، شتێکی نادروست و نەگونجاوە لەگەڵ ڕۆژنامەگەریی ڕاستگۆو خاوێندا نایەتەوە. هەروەها ئەو هەواڵانەی لەسەرچاوە تایبەتیەکانەوە وەرگیراون ، نابێ بەبێ ناوهێنانی ئەو سەرچاوانە بڵاوبکرێنەوە ، ئەگینا چ لە ڕووی شێواز یاخود ناوەڕۆکەوە ناکرێ وەکو هەواڵ پێشکەشبکرێن.

ب–بە ئەنقەست لادان لە ڕاستی و لایەنگری نواندن لەکاتی دەربڕیندا پێچەوانەی ڕۆحی ڕۆژنامەگەریی ئەمریکییە، بەلاّم نواندنی لایەنگری لە ستوونە هەواڵیەکاندا ، دەبێتە مایەی شکاندنی ئەو پرنسیپە سەرەکییەی کە پیشەی ڕۆژنامەگەریی لێیەوە سەردەگرێ.

–ڕاستگۆیی و دروستی و وردبینی: بڕواو متمانەی پتەو بە خوێنەر ئەو بناغەیەیە کە ڕۆژنامەوانییەکی وای لەسەر بنیاتدەنرێ شایەنی ئەو ناوە بێ:.

أ– ئەو متمانە بەهێزەیە وا لەڕۆژنامەوانیی دەکات ڕاستگۆبێو بەهۆی نەبوونی جدیەتیش لە چارەسەرکردن و ووردبینی دا هیچ کاتێك لە ڕۆژنامەیەك نابوورێ ، بەو پێیەی ئەو دووسیفەتە لە چوارچێوەی بواری ئەودان، هەروەها لە نەتوانینی ڕۆژنامەش نابوورێ لە بوون بە خاوەنی ئەو جۆرە سیفەتە بنەڕەتیانە .

ب– ناونیشانەکان دەبێ بە تەواوی پشت بە ناوەڕۆکی بابەتەکانیان ببەستن.

–لایەنگیری نەکردن: دروست ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان سنوورێکی یەکلاکەرەوە لە نێوان گواستنەوەی هەواڵ ودەربڕینی بۆچووندا دیاریدەکات. ڕاپۆرتە هەواڵییەکان دەبێ بەتاڵ بن لە هەرجۆرە بۆچوون و لایەنگیریکردنێك.

أ–ئەم ڕێسایە ئەوانە ناگرێتەوە کە بە بابەتە تایبەتیەکان ناودەبرێن و بۆ بەرگریکردن لە هەڵوێستێك تەرخانکراون ، یان ئەوانەی هەڵگری واژۆیێکن ، چونکە

لەو جۆرە بابەتانەدا ڕێگە بە نووسەرانیان دەدرێ دەرەنجام و شیکردنەوەکانیان بخەنە ڕوو.

–هاوسەنگیی: ڕۆژنامە نابێ تۆمەتبارکردنە نافەرمییەکان بلاوبکاتەوە ، کە لەوانەبێ کاربکەنە سەر ناوبانگی کەسێك، بەبێ ئەوەی دەرفەت بە کەسی تۆمەتبارکراو بدرێ بۆچوونی خۆی دەرببڕێ. دروست ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ڕۆژنامەوانیی لە هەموو حاڵەتێکداو لە دەرەوەی ڕێوشوێنە قەزاییەکاندا ئەو دەرفەتە بە کەسی تۆمەتبارکراو دەبەخشێ.

أ–بە بێ ڕێگەدان یاخود بوونی پاساو لەلایەن مافی گشتیەوە ، ڕۆژنامە نابێ ماف یان هەستە کەسێتیەکان پێشێل بکات.

ب–وەکو ئیمتیازو ئەرکێك ، ڕۆژنامە دەبێ تەواوی ئەو هەڵە تازانە ڕاست بکاتەوە کە کردوونی و پەیوەندیان بە ڕووداو یان بۆچوونەوە هەیە، ئینجا سەرچاوەی ئەو هەڵەیە هەرچیەك بێ.

–ئەدەب و زەوق : ڕۆژنامە (کە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە لە پێناوی هێنانە دی ئامانجی ئەخلاقیدا تێدەکۆشێ)ناتوانێ خۆی لە تاوانبارکردن بە نەبوونی ئەو سیفاتانە بدزێتەوە ، کاتێك لە بناغەی چارەسەرکردندا بابەتی ورووژێنەر و هاندەر بلاوبکاتەوە، لە شێوەی ئەو بابەتانەی کە سەبارەت بە تاوانەکان بلاودەکرێنەوە. ئەو ڕۆژنامانەی ئەوە دەکەن ڕۆژنامەی باش نین. پیادەنەکردنی ڕێساو یاساکانی ڕۆژنامەوانیی وای لێدەکات نەتوانێ لەو بوارەدا شتێك بکات تەنیا دەربڕینی هیوا نەبێ بەوەی ئەو جۆرە مومارەسە ڕۆژنامەوانییە بۆگەن ونادروستانە بە گشتیی ڕەت بکرێنەوە و ڕووبەڕووی سەر کۆنەکردنێکی پیشەیی بەهێز ببنەوە.

## گرفتەکانی کۆکردنەوەی هەواڵ

## Problems of Newsgathering

١-ئەنجامدانی گفتوگۆ ڕۆژنامەوانییەکان .

-پابەندیی وتێکۆشین.

-هاوڕێیەتی و پەیوەندییە کەسییەکان.

-ئەوانەی بەدوای ناوبانگدا دەگەڕێن.

-گفتوگۆ فەرمییەکان.

٢-ئەو ڕۆژنامەوانەی گفتوگۆئەنجامدەدات.

٣-پەیوەندییە گشتییەکان.

-ڕەخنەی پێچەوانە .

-هەڵوێستی بەرگریکار.

-مەترسییەکان.

٤-نهێنییە حکومییەکان.

٥-گۆشەنیگای شرۆڤەکاریی.

هەندێك جار پەیامنێر لەو شوێنەدا ئامادە دەبێ کەتیایدا ئەو گفتوگۆیە ڕووماڵ دەکات و لەبارەیەوە دەنووسێ، وەك کۆبوونەوە ، یان وتارخوێندنەوە، یاخود دادگایی کردن، یان یارییەکی وەرزشیی. لە زۆربەی کاتەکانیشدا پەیامنێر زانیارییەکانی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ، یان لە دەسی دووەم (نا بەرایی Second-hand)دەسگیر دەکات، لە میانەی ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ شایەتحاڵ و بەرپرسان وکەسانی تر، یان لەڕێگەی ڕاگەیاندنە ڕۆژنامەوانیەکان وڕاپۆرت و بەڵگەکانەوە، بەلام بۆ ئەوەی کۆکەرەوەی هەواڵ پەیامنێر لە شوێنی ڕووداو ئامادەبێ، پێویستە لە درێژەی بابەتەکان وردبێتەوەو بە پشتبەستن بە بەرپرسانی پەیوەندیداری وەك پیاوانی ئاگر کوژێنەوەو پۆلیس و سەرۆکی کۆنگرەو......تاد، لە ڕادەی ڕاستی و دروستیان دڵنیا بێ .

## یەكەم: ئەنجامدانی گفتوگۆ ڕۆژنامەوانییەكان
## Interviewing

### ١-زیرەكیی و فێڵبازیی: Resourcefulness

لە بەرچی پەیامنێران سەرەڕۆیی دەكەن ولە كاتی بەرپابوونی جەنگ لە بەرەكانی شەڕدا ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە، نەوەك بە تەنها ئەمە ، بەڵكو لە كاتی ئاشتیشدا، كاتێك ڕووماڵی ڕوودانی لافاو و باوبۆران و ئاگركەوتنەوەو مانگرتن و تاوان و ڕووداوی دیكە دەكەن، بە هەمان شێوە خۆیان دەخەنە مەترسیەوە. هیچ سەرنووسەرێك چاوەڕێی ئەوە لە پەیامنێرێك ناكا خۆی بخاتە هەڵوێستێكی مەترسیداری ناماقوڵانەوە، بەڵام هەردەم ئەو ڕاستیە دەخاتە هزری پەیامنێرەوە كە بە بەردەوامیی وبۆ بەدەستهێنانی زانیاریی زیاتر لە ڕێگەیەك هەیە، بۆیە زیرەكیی و فێڵبازی مەسەلەیەكی پێویستە بۆ پەیامنێران . ئەو نووسەرەش كە دەیان بەڵكو سەدان میل لە پەیامنێرەوە دوورە ناتوانێ لە بری پەیامنێر بیربكاتەوە .ئەزموونێك بێنە بەرچاوی خۆت كە ڕووبەڕووی ڕۆژنامەوانیی تازە كاربێتەوە:. گەیشتنی بە شوێنی ڕووداوێكی هاتوچۆ دوای پەرت و بلاوەلێكردنی جەماوەر وگواستنەوەی بریندراران بۆ نەخۆشخانە و دوورخستنەوەی ئاسەواری ڕووداوەكە لە سەر ڕێگا ، پەیامنێرێك كە زیرەك و فێڵباز نەبێ ، لەوانەیە

بە تەلەفۆن پەیوەندی بە بارەگای ڕۆژنامەوە بكات بۆ ئەوەی پێیان ڕابگەیەنێ كە توانای وەرگرتنی زانیاریی وڕووماڵكردنی ڕووداوەكەی نییە، ئەمە لە كاتێكدا پەیامنێری زیرەك و فێڵباز چەند پرسیارو لێكۆڵینەوەیەك لەگەڵ خاوەن كۆگاو ماڵە نزیكەكاندا دەكات، هەروەها هەوڵی دۆزینەوەی پۆلیسێكی نزیك لە شوێنی ڕووداوەكەدا دەدات، چونكە لەوانەیە ناوی كەسانی تێوەگلاوی ڕووداوەكەی لابێ یاخود بزانێ، ئەگەر لەمەشدا سەرنەكەوت ، دوور نییە ئەو پەیامنێرە ڕووبكاتە نزیكترین شوێن بۆ چاككردنەوەی ئوتومبێل بە مەبەستی بینینی ئوتۆمۆبێلە زەرەرمەندەكان. لە كاتێكدا ئەگەر ئەمەش سەری نەگرت، لەوانەیە هێما یان دەلیلی ژمارەی مۆڵەتەكانی لێخوڕینی دەستبكەوێ، ئەمە لە كاتێكدا ئەگەر خاوەنی شوێنی چاككردنەوەی ئوتۆمۆبێل ڕازی نەبێ ناوی كە سانێكی پێ بدا، پاشان پەیوەندی بە سەركردایەتی پۆلیسەوە دەكات بۆ ئەوەی ناوی ئەو كەسانە و ناونیشانەكانیان وەربگرێ . دوورنییە پەیوەندی بە نزیكترین نەخۆشخانەشەوە بكات. بێگومان پەیامنێر لە ڕێگەی یەكێك لەو سەرچاوانەوە، ئەو كەسانە دەناسێ كە پەیوەندیان بە ڕووداوەكەوە هەیە، جگە لەمە زانیاریی زۆریش دەربارەی ئەوانە دەزانێ كە دەخوازێ چاوی پێیان بكەوێ، ئەگەر بۆشی دەركەوت كە یەكێك لەو كەسانە كوژراوە ، ئەو كاتە دەبێ لە شوێنی هەڵگرتنی لاشە نادیارەكاندا دەست بە گەڕان و لێكۆڵینەوە بكات، یان لەوانەیە پەیوەندی بە ئەنجامدەری لێكۆڵینەوە لە كوژراوەكانەوە بكات. پەیامنێری خاوەن ئەزموونی زۆرو بەرفراوان، شارەزای هەموو ئەو كەنالانەیە كە لە میانەیانەوە دەتوانێ ئەو هەواڵانەی دەست بكەوێ كە مەبەستیەتی - كەسە نەناسراوەكان، ئەوانەی ناسینەوەیان ئاستەمە، دەكرێ لە ڕێگەی ئەو هێمایانەوە بناسرێنەوە كە ئاماژە بە شوێنی شوشتن و خاوێنكردنەوە دەكەن، یاخود بەهۆی هەر هێمایەكی دیكە كە لەسەر جلوبەرگ بدۆزرێنەوە، یان لەڕێگەی چارەكردنی دانەكانیان وتەنانەت بە هۆی هەر ئاماژەو ئاسەوارێكی برین و شێوانی جەستەیی. بۆ نموونە دەكرێ ڕووداوێكی خۆكوژی بە هۆی دۆست

وهاوڕێیانی کەسی خۆکوژەوە ڕوونبکرێتەوە، ئەو دۆستانەی هەندێك قسەو باسیان دێتەوە بیر کە لەکاتی خۆیدا بۆ ئەوان گرنگییەکی ئەوتۆیان نەبووە، بەڵام وا دیارە ئێستا توانای شیکردنەوەی ئەو هۆکارەیان هەیە کە پاڵی بەو کەسەوە ناوە خۆی بکوژێ . زۆر جاری واش هەیە پەیامنێر هەندێك چیرۆکی هەواڵیی دێتەوە یاد کە چەند هەفتە یان مانگێك لەمەو بەر لەو ڕۆژنامەیەدا بلاوکراونەتەوە کە کاری تێدا دەکات و لەوانەیە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە لە ئارادان . پەیامنێر دەبێ لە سەر ئەوە ڕابێت کە ڕۆژانە ئەو هەواڵانە بخوێنێتەوە کە ڕۆژنامەی پێشبڕکێکەر بلاویان دەکاتەوە، هەروەها پێویستە ئەو هەواڵانە لای خۆی هەڵبگرێ کە دواتر سوودیان دەبێ بۆ ئەو.

## ٢- پابەندبوون و تێکۆشان Preseverance:

دوای ئەوەی پەیامنێر دەگاتە ئاستی پێکەوەنانی پەیوەندی پتەو لەگەڵ کەسێکدا کە توانای بەخشینی زانیاریی‌ی هەبێ، ئەو کاتە پەیامنێر لەوانەیە دڵتەنگ بێ کاتێك بۆی دەردەکەوێ کەسەرچاوەی هەواڵ و زانیارییەکانی ئامادەنییە وەکو پێویست یارمەتی بدات. لەوانەشە هۆکاری ئەمە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەکەسی پەیامنێر نەیەوێ لە کێشەیەکەوە بگلێ، یان لەوە دەترسێ دواتر وەکو شایەتێك لەدادگا بانگ بکرێ یاخود سەبارەت بەکارمەندانی حکومەت و پیاوانی سەربەباندەکان و ئەو خەڵکانەی لێیان دەترسێ مەسەلە و بابەتی نابەجێ بوروژێنێ. لەوانەشە ئەو نەیەوێ نەفامی خۆی ئاشکرا بکات یان زانیاریی‌ی نهێنی سەبارەت بە پلانە تایبەتیەکانی کار و کاروباری کەسێتی بدرکێنێ.

ئەو هۆکارانەی پاڵ بەسەرچاوەی هەواڵەوە دەنێن کە گوێشی (سماعە)ی تەلەفۆن یان دەرگای ماڵەوە دابخەن و بەتەواوی بێدەنگی بنوێنن، لەوانەیە هەمە

جۆر و جیاوازبن، بەڵام پابەندبوونی ڕۆژنامەوان یەکێکە و ناگۆڕێ، ئەویش ئەرکیەتی لەئاشکراکردنی هەر ڕووداوێك کەبڵاوکردنەوەی ببێتەمایەی بەرژەوەندیی گشتیی.

لەزۆربەی کاتەکاندا پابەندی سوودو کەڵکی بەدواوە دەبێ. کەسێك ئەگەر خۆی لەڕۆژنامەوانیی دزیەوە و وەڵامی تەلەفۆنی نەدایەوە و خۆی لەناو ماڵی خۆیدا بەندکرد، ئەو کەسە بێگومان یاریەکی دۆڕاوانە دەکات،بەتایبەتیش ئەگەر ئەم کەسە ئەگەر ئەمە ئەو کەسە بێ کەزانیاریی یان بۆچوونی لەلا کۆبووبێتەوە، ئەو کاتە نارازیبوونی بەوەی ڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەوانیی بدات، نابێتە هۆی ئەوەی کەلەچاوی خوێنەردا خۆی هەڵوێستێکی گونجاودا ببینێتەوە. پەیامنێر دەبێ هۆشیار و ئاگادار بێ لە دڵنیابوون لەوەی ئەو کەسە بەمەبەستی خۆدزینەوە لەگفتوگۆکردن یان لەترسی ڕووبەڕووبوونەوەی تاوانکارییەکان دیارنەماوە، پەیامنێریش لەوانەیە ئەو دەربڕینە بەکاربێنێ: نەکرا پەیوەندی بەو کەسەوە بکرێ و دیمانەی لەگەڵدا بکرێ، لەڕاستیدا پەیامنێر پێویستە ئەوجۆرە دەربڕینە بخاتە ناو چیرۆکە هەواڵییەکەی خۆی، بۆ ئەوەی خوێنەران بزانن کە بۆ دیدەنیکردنی ئەو کەسە چی لەدەست هاتووە کردوویەتی. بەڵام ئەگەر کەسی باس لێوەکراو ڕازی بوو بەقسەکردن و دواتر پەشیمان بووەوە و سووریش بوو لەسەر بێدەنگیی خۆی، ئەو کاتە لەوانەیە بێدەنگییەکە لەهەر قسەیەك گرنگتربێ کەلەوانەیە بیکات. بەڵام ئەگەر پەیامنێر پرسیاری ئاڕاستەی کەسێك کرد و لەبەرامبەردا وەڵامی نائاشکراو نادیاری وەرگرتەوە یان وەڵامی هیچ پرسیارێکی نەدایەوە، ئەوا دەتوانێ بڵێ: بەڕێز (فلانەکەس) ڕازی نەبوو هیچ قسەیەك بکات. لەو حاڵەتەشدا خوێنەران دەتوانن سەبارەت بەو هۆکارە بگەنە دەرەنجامەکانیان کەپاڵی بەو کەسەوە ناوە ڕازی نەبێ وەڵام بداتەوە.

ئەلفن بۆتەری سەرۆکی ئەنجوومەنی شار ئەمڕۆ هیچ شتێکی وای نییە بیڵێ سەبارەت بەتاوانبار کردنی کارمەندانی شار (کەئەویش لەناویاندایە)، بەوەی لە کۆگاکانی شاردا بەبێ بەرامبەر سووتەمەنییان دەستدەکەوێ، دوێنێ (لیۆناردپۆل)ی

سەرۆکی لیژنەی شەقام و شۆستەکان ئەو تۆمەتەی ورووژاند، لەوەڵامی پرسیاری پەیامنێرانیشدا بەڕێوەبەری دەزگای سووتەمەنی گوتی: حاڵی حازر هیچ شتێکم نییە بیڵێم.

هەندێك جار پەیامنێر دەتوانێ ئەو کەسە ڕازی بکات کە زانیاریی یان بیروڕای لا هەیە، بەوەی کەبەرژەوەندی وادەخوازێ ئەو زانیارییانە ئاشکرا بکات و قسە بکات. کەسی باس لێوەکراویش ئەگەر بزانێ ڕۆژنامە بەنیازە ئەوە بڵاوبکاتەوە کەڕازی نەبووە زانیاریی بدات یان قسە لەبارەی ڕووداو بکات، ئەوکاتە لەوانەیە بترسێ و لە بڕیارەکەی پەشیمان بێتەوە و زانیارییە پێویستەکان ئاشکرا بکات.

کەسێك کەبەشێوەیەکی ناپەجێ لەهەواڵەوە گلابێ، لەوانەیە دوودڵیی بنوێنێ لەقسەکردن بۆ ڕۆژنامەوانیی، لەترسی ئەوەی نەوەك وتەکانی بەناپەجێیی بگوازرێنەوە و بخرێنەڕوو. کەساپەتی وڕاستگۆیی پەیامنێریش لەوانەیە بەس بن بۆ ڕازیکردنی ئەو کەسە بەقسەکردن. هەموو شتێك دەوەستێتە سەر شێوازی خۆنزیکردنەوەی پەیامنێر لەکەساپەتییە و چۆنیەتی چارەسەرکردنی بابەتەکە، هەروەها دەوەستێتە سەر هەڵوێست و بارودۆخی پەیامنێریش لەکاتی ئەنجامدانی گفتوگۆکەدا.

پێویستە ئامانجی پەیامنێر بریتی بێ لەڕازیکردنی ئەو کەسە، ئەو هیچ ڕق و کینەیەکی بەرامبەری نییە و دووریش نییە کەسی قسەکەر خۆشحاڵ بێ بەو دەرفەتەی ڕێگەی پێدراوە قسە بۆ کەسێکی هاوسۆز بکات و بتوانێ گێڕانەوەی چیرۆکەکەی گونجاو و ئاسان بکات.

خۆشبەختە ئەو پەیامنێرەی کەخاوەنی چەند زانیارییەکەو قسەکەرەکەی پێی وانییە کەدەیانزانێت، زیرەکانە خزاندنی ئەو زانیارییانەش بۆ ناو گفتوگۆکان لەوانەیە سنوور بۆ هەر هەوڵێکی فێڵ و ساختەکاری دابنێ. پەیامنێر ئەگەر شارەزایی نەترساندنی قسەکەرەکەی نەبێ، دوورنییە خۆی دەست بەهەڵخەڵەتاندن

بکات. زۆرجار ڕووبەڕووبوونەوەی گرنگە و پێویست دەکات بەبەیاننامە یان ڕاگەیاندنێك بەرەنگاری بەیاننامە و ڕاگەیاندنی تر ببیتەوە.

پەیامنێر دەبێ هەمیشە لەوە ئاگادار بێ کەلایەنێکی بەهێز پشتگیریی لێ دەکات، ئەویش ڕۆژنامەکەیە کە کاری تێدا دەکات. لەکاتێکیشدا ئەگەر پەیامنێر هەڵیخەڵەتێنرێ یان ڕێگە بەخۆی بدات بڕەوێتەوە، ئەمە مانای وایە کەلەبەردەم سەرنووسەرەکەیدا نەیتوانیوە ئەرکەکانی خۆی ڕاپەڕێنێ، پەیامنێر ئەگەر بەسەر خاکێکدا بڕوات و مافی تەواوی ئەو کارەی هەبێ، ئەو کاتە مەرج نییە خاکەڕایی و زەلیلی بنوێنێ. ئەو کەسانەی بۆ هەر ماوەیەك لەبواری ژیانی گشتیدا کاردەکەن، دەرك بەهێزو توانای ڕۆژنامەگەریی دەکەن و ڕێزیشی دەگرن، بەڵام ئەمە بەهیچ شێوەیەك مانای ئەوە نابەخشێ کەپەیامنێر دەبێ تووڕەیی بنوێنێ یان پەنا بباتە بەر هەڕەشەکردن، تەنیا لەو حاڵەتانەدا نەبێ کەتیایاندا هەڵسوکەوتی لەوجۆرە ئاسایی دەبن. پەیامنێر دەبێ بەپێی تێگەیشتنی خۆی بۆ ڕاستی ئەوەی کەبەرژەوەندی گشتیی کات و شوێنی هەڕەشە و نەرمی نواندن دیاریدەکات، هەڵوێست دەنوێنێ. باشترین جۆری گفتوگۆ ڕۆژنامەوانییەکان ئەوانەن کەبەشێوەیەی ئاسایی و هێمنیی و نافەرمیی ئەنجام دەدرێن. پەیامنێر لەوانەیە بتوانێ متمانەی بەرامبەر مسۆگەر بکات و خۆشی وەکو کەسێکی سەرنجڕاکێش بخاتە ڕوو ئەگەر ڕاستەوخۆ سەبارەت بەهۆکاری هاتنی قسە نەکات و لەجیاتی ئەوە بەچەند تێبینی و قسەیەکی گشتیی دەست پێ بکات و ئەگەر توانی وتەکانی کەسی قسەکەر بگوازێتەوە ئاراستەی بابەتی مەبەست، ئەو کاتە – دڵنیا دەبێ لەوەی دەتوانێ گفتوگۆکە بەو ئاراستەیەدا ببات کەدەیەوێ، واش بەچاك دەزانێ لەکاتی ئەنجامدانی گفتوگۆی لەوجۆرەدا کەمترین ژمارەی تێبینی تۆمار بکرێ، بگرە زۆرجار تەنانەت نووسین و تۆمارکردنی تەنیا یەك تێبینی وەکو کارەساتێك دێتە بەرچاو، هەرکاتێکیش پەیامنێر توانی لەیادی قسەکەرەکەی بەرێتەوە کەبۆ بڵاوکردنەوە قسە دەکات، ئەو وەختە شتی زیاتری دەسگیر دەبێ لەوەی هەموو ساتێك بەبیری

بهێنرێتەوە كە هەموو قسەیەكی تۆماردەكرێ. هەندێك جار كەسی قسەكەر داوا لەڕۆژنامەوان دەكات كەتەواوی قسەكانی تۆمار بكات، یاخود لەكۆتایی گفتوگۆدا ڕۆژنامەوان دەتوانێ بڵێ: بەو بۆنەیەوە هیوادارم ئەو ناوەم بەڕوونی پێ بڵێی بۆئەوەی بەهەڵە نەینووسم یان لەوانەیە پرسیار سەبارەت بە ژمارەی ورد یان ناونیشانی ئاشكرا و دیاركراوو ... تاد بكات، ئەمانەش هەموویان چەند شتێكن قسەكەر خۆشحاڵ دەبێ بەوەی كەڕۆژنامەوان زۆر بەوردی تۆماریان دەكات. ڕۆژنامەوان دەبێ ئاگادار بێ لەپرسیاركردن دەربارەی ئەو زانیارییانەی دوورنییە كەسی قسەكەر بەو ئاڕاستەیەدا ببەن كەپێی وابێ ڕۆژنامەوان نازانێ چی بۆ بڵاوكردنەوەیە و چی نا.

پەیامنێر دەبێ بیركردنەوەی خۆی ڕابهێنێ بۆئەوەی بەهێز بێ و بتوانێ دوای كاتژمێرێك لەئەنجامدانی گفتوگۆ هەموو ئەو تێبینی و ئاماژەو وتە گرنگانەی بێتەوە یاد كەكەسی قسەكەر كردوونی، بەرامبەر بەهەر برگەیەكی لەناكاو و ترسناكیشدا، ڕۆژنامەوان دەبێ تێبینیەكی هزریی لەمێشكی خۆیدا تۆمار بكات و بەدرێژایی ماوەی گفتوگۆش لە مێشكی خۆیدا هەڵگێڕو داگێڕی پێ بكات. دوای جێهێشتنی شوێنی ئەنجامدانی گفتوگۆش، پێویستە یەكەم دەرفەت بقۆزێتەوە بۆ تۆماركردنی ئەو جۆرە تێبینیانە و هی تریش. دواتر ڕۆژنامەوان ئەگەر ماوەی كاتژمێرێكی هەبێ بۆنووسینی چیرۆكەكە، ئەو كاتە بۆی دەردەكەوێ كەتەواوی گفتوگۆكەی دێتەوە یاد.

ژمارەیەكی كەم لەسەرنووسەرانی ئەمڕۆ، هانی جێبەجێكردنی ئەو فرتوفێڵانە دەدەن كەلەڕێگەیانەوە پەیامنێر دەتوانێ گفتوگۆی ڕۆژنامەوانیی دەسگیر بێ. ڕاستگۆیی و ئاشكرایی باشترین شێوازن بۆ ئەم كارە، ڕۆژنامەوان دەبێ خۆی و مەبەست لەدوای سەردانەكەی بناسێنێ و ڕوونبكاتەوە، دواتر هەوڵ بدات لەپێناوی دەستكەوتنی ئەو زانیارییانەی مەبەستیەتی هەر شێوازێكی ڕەوایانە كەلەچوار

چێوەی تواناکانیدا بێ، یان شێوازی دیکەی توندتر (ئەگەر پێویست بێ)، بگرێتە بەر.

لەکاتی نووسینی بۆچوونێکیشدا، وابەچاك دەزانرێ و بەمەبەستی زیادکردنی هێزی قەناعەت پێکردن و متمانە، ڕۆژنامەوان ئەو وتانە بخاتە ڕوو کەلەمیانەی گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانیدا هاتوون.ئەگەر کارێکی واش ئەنجام بدات ئەوا دەربڕینی (_ئەمڕۆ لەگفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانیدا بەڕێز وایت ڕایگەیاند ...)) گونجاوترە لە ((ئەمڕۆ بەڕێز وایت بەڕۆژنامەوانانی ڕاگەیاند کە ....)).

ڕۆژنامەش نابێ بەدەسکەوتنی گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانیی تایبەت بەخۆی بنازێ، ئەو کاتە نەبێ کە گفتوگۆی باسکراو بڕێك زیرەکیی و داهێنان و سەرکەوتنی بەسەر پێشبڕێکێکەرانیدا پێوە دیاردەبێ.

## ٣- پەیامنێر و دۆستایەتی و پەیوەندییە کەسییەکان

بەوپێیەی کەسێك نییە، وەك ئەوەی بەنوسین دەینووسێ بتوانێ لەکاتی قسەکردنیشدا پابەند بێ بەڕێساکانی زمانەوە، بۆیە پەیامنێر دەبێ لەڕووی زمانەوانییەوە لەو ڕاگەیاندنە زارەکیانە وردبێتەوە کەکەسایەتییە پەیوەندارەکان دەیاندەن، بۆئەوەی کەسایەتییەکە دووچاری ئیحراجبوون نەبێتەوە و ڕێگەش بەخەڵکی دیکە نەدرێ لەوەی کە بەهەڵە تێی بگەن. بەڵام ( لەهەندێك کات و بۆنەدا) بەرژەوەندی گشتیی ناخوازێ کەسەرچاوە بپارێزرێ، بۆنموونە، سەرەڕای بوونی بەڵگەی یەکلاکەرەوە بۆ پێچەوانەی ئەمە، بەڵام بەرپرسی فەرمی ڕادەگەیەنێ کە هیچ شتێك دەربارەی ڕووداوەکە نازانێ، ئەگەر چیش بەپێی حوکمی پلەو پایەی دەبێ هەموو شتێکی لەبارەوە بزانێ،و لەوحاڵەتەدا زوڵم نییە ئەگەر ڕۆژنامەوان قسەکانی ئەو بەرپرسە وەکو خۆی بگوازێتەوە، لەکاتی سەرهەڵدانی زەرورەتێکی لەو جۆرەشدا، ئەو پەیامنێرەی کە پەیوەندی ڕۆژانەی بەسەرچاوەکانی هەواڵەوە

هەیە، خۆشحاڵ دەبێ ئەگەر ڕۆژنامە پەیامنێرێکی (تایبەت) بنێرێ بۆ چارەسەرکردنی ئەو چیرۆکە تایبەتییە، چونکە ئەو پەیامنێرەی لەبوارێکی دیاریکراودا کاردەکات، بەئاسانی مێکی زۆری دەزانێ کەبۆ دەسکەوتنی زانیاریی سەبارەت بەمەسەلەیەك پەنا بباتە بەر هەرپەشەکردن لەسەرچاوەکانی هەواڵی خۆی بەواتایەکی تر پەیامنێر ناتوانێ کاریگەر بێ ئەگەر هەموو ئەوانە بکات بەدوژمنی خۆی کەلە دەسکەوتنی زانیارییەکاندا پشتیان پێ دەبەستێ. کەواتە پەیامنێر چۆن دەتوانێ دۆستایەتی و پەیوەندی کەسێتی دابمەزرێنێ و پارێزگارییان لێ بکات و لەهەمان کاتیشدا ئەرکەکانی جێبەجێ بکات، هەر لە کۆکردنەوەی هەواڵ و دەستکەوتنی زانیاریی و ... تاد.

ئەم پرسیارە یەکێکە لە زەحمەتترین و ئاڵۆزترین ئەو کێشە و گرفتانەی کەڕووبەڕووی ڕۆژنامەوان دەبنەوە و دەبێ چارەسەربکرێن. وەك چۆن پەیامنێرێك گووتوویەتی:

(( پەیامنێر، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم بەسەر دەست بەکاربوونیدا و بەتایبەتی ئەو کاتەی بەئەرکی ڕووماڵکردنی چەند بابەتێکی تایبەت ڕادەسپێردرێ، پەیوەندی کەسێتی لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵدا دادەمەزرێنێ، ئەمەش کارێکە و ناکرێ جێ بهێڵرێ، بەو پێیەی پەیامنێر ڕۆژانە گفتوگۆ لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکات، بەپێچەوانەی ئەمە، ئەو جەماوەرەی ڕۆژنامەوان بۆی دەنووسێ و لەبەرامبەریدا بەرپرسە، شتێکی تاکەکەسی نییە و تەمومژاوی و نادیاریشە. مەترسییەکی هەمیشەییش لەئارادایە و خۆی لەبەخشینی سوودی گومان (فائدة الشك) بەمرۆڤدا دەبینێتەوە، لەسەر حیسابی تەنیا گرووپێك لەخوێنەران.

بۆنموونە، چاودێرێکی خوێندنگاکان خۆی دەخاتە هەڵوێستێکی نابەجێوە، بەو پێیەش کەتۆ دەیناسی، بۆیە دەرك دەکەیت کەخاوەنی پاك و پیرۆزترین ئامانج و پاڵنەرە لەجیهاندا، بەڵام تەنیا لەخەملاندن و بڕیارداندا هەڵەی کردووە، تۆبەتەواوی دەزانی کەئەو پێی وایە ئەرکەکەی بریتییە لە ڕێنمایی کردنی جەماوەر، یان

ڕووبەڕووی ئەم هەڵوێستەی خوارەوە بوویتەوە: - پۆلیسێك لەکار وەستێنراوە، چونکە لەبەندکراوێکی داوە، تۆش لە ڕووداوەکەت کۆڵیوەتەوە، پۆلیسی باسکراو لاوێك بووە، بۆماوەی نزیکەی ساڵێك، ڕاهاتوویت ڕۆژانە قسەی لەگەڵ بکەیت، دەربارەی خۆی و خانەوادە و ویست و خواستەکانیشی هەموو شتێکی پێ گوتوویت. ڕاستەوخۆ و بەپەلە بڕیاری لەکار وەستاندنی دەرکراو هیچ گومانێکیش نییە لەوەی سزای شایستەی خۆی وەرگرتووە. پرسیم: جەماوەر چ قازانجێکی پێ دەبڕێ ئەگەر بزانێ پۆلیسەکە لەکار وەستێنراوە، لەکۆتاییدا جەماوەر چییە؟

بێگومان چیرۆکەکەم نووسی و کاتێك دووردرێژم بەوە بردە سەر کەبۆ پۆلیس و سەرۆکەکەی ڕوون بکەمەوە، لەبەرچی پێویستە جەماوەر ئەو ڕووداوەبزانێ؛ بەڵام مەسەلەی بنەڕەتی ئەوەیە کە پەیامنێر زۆرجار دەبێ ئەو جۆرە بڕیارانە بدات و ئەگەر زۆر هۆشیار و ئاگاداریش نەبێ، ئەوکاتە، بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکات، خۆی لەحاڵەتی ملکەچکردن بۆ بانگەوازی مرۆیی سەرچاوەی هەواڵەکانیدا دەبینێتەوە، لەوباوەڕەشدام ملکەچکردن بۆ ئە بانگەوازە (Appeal) بەهێزترین ئیغرایە کە پەیامنێر لەکاتی کارکردندا لەوانەیە دووچاری ببێ.

ساکاریی (السذاجة) یەکێکە لەمەترسیدارترین ئەو کۆسپ و هەڵخلیسکانانەیە کەپەیامنێر دەبێ خۆیان لێ بپارێزێ، بێجگە لە ئاستی لۆژیکیانەی بیروبۆچوون و کەسێتی ئەو کەسەش کە گفتوگۆی لەگەڵدا سازدەکرێ؛ بەڵام پەیامنێر پێویستە ئاگاداری ئەو ڕاستییە بێ کەلە قسەکانی کەسی قسەکەر وردبێتەوە و تاقییان بکاتەوە و لەڕاست و دروستیان دڵنیا بێ و لەبیروبۆچوونی دیکە بگەڕێ، واتە، بەشێوەیەکی گشتیی پەیامنێر نابێ وابەئاسانی هەڵبخەڵەتێ.

لەڕاستیدا زۆر جار سەرچاوەی هەواڵەکان گێڕانەوەی یەك لایەنە دەخاتە ڕوو، ئینجا بابەتەکە هەر چییەك بێ، پەیامنێری بێ ئەزموون و نەشارەزاش تاڕادەیەکی زۆر دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو ڕاگەیاندنەی کەدەربارەی شێوازی کارکردنی ئیدارە

یان دامەزراوەیەکی حکومی پێی دراوە، ئەمە ئەگەر بەتەنیا پشت بەو زانیارییانە ببەستێ کەلەلایەن کەسێکی پەیوەندیدار بەو دامەزراوەیەوە پێی درابێ.

تەنیا لەڕێگەی ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ کەسانێکی دیکەدا کە بەهەڵوێستی ڕەخنەگرانە ناسرابن، چەند شتێکی وەك دوورخستنەوە و فرێدان و توندکردن و دەرخستن گرنگیدان بەشێواندنەکان زیاتر ڕوون و ئاشکرا دەبن. پەیامنێر ئەگەر ئەم کارە جێبەجێ نەکات، دەبێتە تەنها کەسێکی نامە ئاڵوگۆڕکەر و ڕاگەیاندنە ڕۆژنامەوانییە یەك لایەنییەکان دەگوازێتەوە بۆ ڕۆژنامە. پەیامنێر دەبێ بزانێ وردبوونەوە و هەڵسەنگاندنی زانیارییەکان و دڵنیابوون لەڕاست و دروستییان، چ لەڕێگەی ئەنجامدانی دیمانە لەگەڵ کەسانی دیکەدا یان لەڕێگەی پەیوەندیکردن بەسەرچاوەی هەواڵی دیکەوە، یاخود بەهەر شێوازێکی دیکەبێ، مەرج نییە لەهەموو حاڵەتێکدا ببێتە هۆی گۆڕانی تەواوی لێکدانەوە سەرەتاییەکان، بەڵام ئەمە ڕێوشوێنێکی خۆپارێزییە لەدژی ئەو هەڵەیەی لەوانەیە لەئەنجامی توندڕەویکردن لەپشت بەستن بە یەك لایەن یان وتەکانی یەك سەرچاوەوە ڕوو بدات.

## ٤-ئەوانەی بەدوای ناو و ناوبانگدا دەگەڕێن

## publicity seekers

مەسەلەکە هەر چۆنێك بێ، هەموو کەسێك بەپارێزی نییە لەبەخشینی گفتوگۆ ڕۆژنامەوانییەکان، ئەو کەسەی هەوڵی ترساندنی پەیامنێران دەدات یان لەبەریان دەپاڕێتەوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ڕاگەیاندنانەی خزمەتی بەرژەوەندییە تایبەتەکانی دەکەن، کەسێکە هەمووکات و لەهەموو شوێنێکیشدا هەیە و بەدی دەکرێ و پەیامنێر دەبێ هەردەم ئاگاداربێ و خۆی لێ بپارێزێ، بۆیە پێویستە لەهەموو برگەیەك وردبێتەوە و لەڕاست دروستی و گونجاوییان لەگەڵ واقیعدا دڵنیابێ.

وانەبێژوگۆرانی بێژان، کەهەست بەبوونی پابەندی بەرامبەر بەجەماوەر دەکەن، هەر جۆرە ناوبانگییەك بەرز دەنرخێنن کەبەدەستی دێنن، دووریش نییە دوو دڵی بنوێنن یان ڕازی نەبن بەوەی ڕاگەیاندنی ڕۆژنامەوانیی ببەخشن، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ئەوانە خاوەنی ڕازڕاگر، یان (سکرتێر)ن کەپێشوازی لەپەیامنێران دەکەن و سەبارەت بەو بابەتەش دەپرسن کەلەدیمانە ڕۆژنامەوانییەکەدا باسی لێوە دەکرێ، بێگومان ئەنجامیش بریتی دەبێ لەوەڵامی مردوو بۆ پرسیاری مردوو، زۆرجاری واش هەیە ئەو وەڵامانە بەئامێری چاپکردن چاپ یان کۆپی کراون.

ئەو پەیامنێرەی پرسیارێك ئاڕاستەی کەسایەتی قسەکەر دەکات و ئەویش وەڵامێکی ئامادەکراوی دەداتەوە، بێگومان پەیامنێرێکی گێل و نەفامە و دەبێ هەست بەمە بکات، لەوانەیە بینینی چەند جۆرێکی دیکە لەو ناودارانەی ئامادەی کۆبوونەوە دەبن شتێکی وائاسان نەبێ زۆر جار پەیامنێر دەتوانێ ڕاگەیاندنێکی لەو کەسایەتییانە دەستکەوێ کەدیدەنییان ئاسان نییە، ئینجا چ لەڕێگەی ناردنی نامەی ناساندنی کەسێکی دیکەی گرنگ، یان لەدەرەوەی هوتێل و بارەگای حزب چاوەڕێیان بکات، هەروەها دەکرێ پەیامنێر لەدوای پەردەوە چاوەڕێی کەسایەتییەکە بکات کاتێك پێشانگایەکی شانۆیی یان مۆسیقی پێشکەش بکرێ یان لەکاتی وتنەوەی وانەیەکدا.

لەزۆربەی حاڵەتەکاندا دوای ئەوەی ڕۆژنامەوان ناوی خۆی دەنێرێتە ژوورەوە یان لەنوسینگەی بەڕێوەبردنی هۆتێلەوە بەتەلەفون قسە لەگەڵ کەسایەتییەکەدا دەکات، دەتوانێ ڕاگەیاندنێکی دەست بکەوێ، خۆ ئەگەر لەوەختێکی نەگونجاویشدا قسەی لەگەڵ کەسایەتیەکەدا کرد، ئەوا دەتوانێ کاتێکی دیکە بۆ ئەنجامدانی گفتوگۆ دیاریبکات، ڕۆژنامەوان زۆرجار ئەمەی بۆ ڕێك دەکەوێ چونکە ئەو کەسایەتیە ئاستی ئەو ناوبانگییە دەزانێ کەدوای بەخشینی ڕاگەیاندنێکی ڕۆژنامەوانیی پەیدای دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە نایەوێ ڕۆژنامەیەکی گرنگ بێزار بکات.

هەر مۆسیقاژەن یان زانا و نووسەر و سیاسەتمەدار و کەسایەتییەکی دیکە ناوبانگ پەیدا بکات، ڕقی لەو ڕۆژنامەوانە هەڵدەستێ کەچالاکی و ناوبانگەکەی پشتگوێ دەخات، هەروەها هەر کەسایەتییەکی تایبەتمەند هەست بەبێزاری و وەڕسی دەکات کاتێك قسە لەگەڵ کەسێکدا بکات کە هیچ زانیارییەکی دەربارەی ئەو لایەنە نەبێ، چەندین کتێب و سەرچاوەی پەیوەندیدار بەچۆنیەتی بەڕێوەچوونی ژیانی ئەو جۆرە کەسایەتییە ناودارانە هەن و ڕۆژنامەوان دەتوانێ بیانخوێنێتەوە، جگە لەوە ئەرشیفی ڕۆژنامەش بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی کارە تازەکانی ئەو کەسایەتییە دەگرێتە خۆی.

ڕۆژنامەوان ئەگەر شارەزای بابەتەکەی نەبێ، شکست دێنێت لەئەنجامدانی دیمانەی ڕۆژنامەوانیدا، کەسی ناوداریش کەڕۆژنامەوان ڕاهاتووە لەسەرئەوەی دیمانەی ڕۆژنامەوانیی لەگەڵدا بکات، لەوانەیە لەگەڵ پەیامنێری نەشارەزادا سۆزداری بنوێنێ و دووریش نییە هەندێك وەڵامی ئامادە و تەنانەت کۆنیشی پێ ببەخشێ، بەڵام بێگومان ئەمانە ئەو وەڵامانە نین کە سەرنووسەر دەیەوێ پەیامنێر پەیدایان بکات.

لەوانەیە لەپەیامنێرە تازەکارەکان نەگیرێ کاتێك لەمیانەی ئاڕاستەکردنی پرسیارەکاندا سەیری دەفتەری تێبینیەکانیان دەکەن، بەڵام پەیامنێرە شارەزاو خاوەن ئەزموونەکان پرسیارەکان لەمێشکی خۆیاندا هەڵدەگرن و دەبێ پەیوەندییان بەبواری بایەخ پێدانی کەسایەتی قسەکەرەوە هەبێ و سادە و ساکار و سەرەتایی نەبن، هەروەها پرسیارەکان لەو جۆرە نەبن کەپێشتر چەندین جار ئاڕاستەی هەمان ئەو کەسایەتییە کرابن، پێویستە پەیامنێر گۆشەیەکی نوێ بدۆزێتەوە بۆ باسکردنی بابەت یان بەدوای بابەتێکی تازەدا بگەڕێ کەبتوانێ لەگەڵ کەسایەتییەکەدا قسەی لەبارەوە بکات.

جگە لەوە، پەیامنێر نابێ بەتەواوی بواری کار و تایبەتمەندی کەسی قسەکەرەکەی دابپۆشێ یان داگیر بکات، ئەگەر ئەمەشی کرد، مانای وایە نەیتوانیوە

بەقووڵیی و بەشێوەیەکی جیدیانە چارەسەری هیچ لایەك بکات، ئەو گفتوگۆ ڕۆژنامەوانییانەی کەلەگەڵ کەسایەتییە ناودارەکاندا دەکرێن، هەمان ئەو گفتوگۆیانەن کەدەربارەی چەند خاڵێکی دیارکراو دەخولێنەوە و ڕۆژنامەوان بەشێوەیەکی هەمەلایەن و قووڵ لەگەڵ ئەو کەسایەتییەدا وتووێژی لەبارەیانەوە کردووە.

## ٥- گفتوگۆ فەرمییەکان Formal Interviews

لەزۆربەی حاڵەتەکانیدا ئەو کەسانەی کەدەزانن ڕۆژنامەوانێ بەنیازی ئەنجامدانی دیمانەیە لەگەڵیاندا، هەوڵی ڕێکخستنی دیمانەی فەرمی دەدەن و نوێنەرانی هەمو ڕۆژنامەو ڕادیۆ و کەناڵە تەلەفزیۆنیەکان و شێوازەکانی دیکەی ماس میدیا لەکۆمەڵگادا ئامادەدەبن، بەپێی بیروبۆچوونی پەیامنێری ڕۆژنامەوانیش ئەو جۆرە گفتوگۆیانە پەسەندنین چونکە تیایاندا پەیامنێر ناتوانێ هیچ جۆرە زانیارییەکی تایبەتی دەست بکەوێ.

بەهەرحاڵ، قازانجی گفتوگۆ فەرمییەکان لەوەدایە کە تیایاندا ژمارەیەکی گەورە لەو عەقڵانە ئامادەدەبن کەبیر لەو پرسیارانە دەکەنەوە کەئاڕاستەیان دەکەن، جاری واش هەیە کەسی قسەکەر پێشتر ڕایدەگەیەنێ کە ئەو پرسیارانە دەبێ بنووسرێن و ئامادەبکرێن و کاتژمێرێکیش بەر لەدەستپێکردنی دیمانەکە بدرێتە دەستی، ڕێوشوێنی لەو جۆرەش لەوانەیە بوار بەپەیامنێری ڕۆژنامەوانیی بدات کەزۆر بەوردی بابەتی سەرەکیی دیمانەکە بزانێو لەهەمان کاتدا بواری ئەوەش بەقسەکەر دەدات کەوەلامی گونجاو و دروست بۆ ئەو پرسیارانە ئامادە بکات کەئەگەر بەبێ بەرنامەیش بخرێنە ڕوو، وەلامی وا بسەپێنن لەوانەیە لەبەرژەوەندی پەیامنێردا بن.

تەنانەت ئەگەر لەگەڵ پەیامنێرانی دیکەشدا گفتوگۆ لەگەڵ کەسایەتییەک ئەنجام بدەیت، دەتوانی زانیارییی وادەسگیر بکەیت کەبابەتی جیا لەوانی دیکەی لەسەر بنووسی. زیرەکترین و بەتواناترین گوێگر و پەیامنێریش ئەوەیەکە باشترین چیرۆکی هەواڵیی سەبارەت بەدیمانەکە دەنووسێ. بەزۆریش ئەو بەراوردکردنەی کەسەبارەت بابەتە جۆرا و جۆرەکان دەکرێت و لەڕێگەی دیمانەیەکی ڕۆژنامەوانیی هاوبەشەوە بڵاودەکرێتەوە، دەبێتە مایەی ئاشکراکردن و ڕوونبوونەوەی شێوازە هەمە جۆر و جیاوازەکانی چارەسەرکردنی خودی بابەتەکە. لەوانەیە پەیامنێرێك زیاتر بایەخ بەدەربڕینێکی دیاریکراو بدات، یەکێکی دیکەش جەخت لەسەر لێدوانێکی تەواو جیاواز بکاتەوە، دوورنییە پەیامنێری سێیەم تیشك بخاتە سەر کەسایەتیی ئەو بەرپرسەی لێدوانەکەی داوە زیاتر لەبایەخدان بەقسەکانی، هەندێك کاتیش پەیامنێری ڕۆژنامەوان لەوانەیە بۆماوەی خولەکێك یان دووخولەك لەکۆتایی دیمانەکەدا دوابکەوێت بۆئەوەی وەڵامی پرسیارێکی تایبەتی دەستبکەوێ.

## ٦- ئینکاریکردن و بەدرۆخستنەوە Denials

هەندێك جار ئەو کەسەی کەپەیامنێر لێدوانەکانی گواستۆتەوە بەدرۆخستنەوەیەك دەردەکات، بەڵکو لەوانەیە دووپاتی بکاتەوە کەهەرگیز چاوی بەوپەیامنێرە نەکەوتووە کەچیرۆکە هەواڵییەکەی نووسیوە، ئەمەش زیاتر ئەو کاتانە ڕوودەدات کەپەیامنێر ژمارەیەك لەو تێبینیە سەرپێییانە دەردەخات کەسایەتیەکە خستونییەتە ڕوو و واباوەڕ دەکرێ کەبەشێکی لێدوانە فەرمییەکە نین.

بەدرۆخستنەوەی چەند ڕووداوێك کەلە لێدوانە ڕەسمەیەکەدا هاتوون، مەسەلەیەکە دەکرێ لەڕێگەی پێشکەشکردنی، تۆمارکردنێکی دوورودرێژی لێدوانەکەوە یەکلابکرێتەوە، بەڵام کەمن ئەو ڕۆژنامانەی پشتگیری لەو هەڵسوکەوتە دەکەن. ئەنجامدانی کارێکی لەو جۆرەش مانای وایە کەسی دیمانە لەگەڵکراو هەموو

وشەیەك لادەبات کەحەزی پێ نەکات ، هەروەها مانای دەسبەرداربون لەو ئیمتیاز و دەسەڵاتەشە کەڕۆژنامە هەیەتی و بریتیە لەوەی کەڕۆژنامە بەو جۆرەی بەباشی دەزانێ، زانیاریی کۆبکاتەوە و بابەتەکانیش بنووسێ.

ڕۆژنامەوان ئەگەر بەشێواندنی لێدوانەکانی کەسایەتیەکە تاوانبار نەکرابێ، دەتوانێ سووربێ لەسەر هەڵوێستی خۆی، لەکاتێکیشدا ئەگەر ڕۆژنامە پشتی بگرێ، پەیامنێر دەتوانێ ڕووبەڕووی ئەو کەسایەتییە ببێتەوە کەئینکاری کردووەو لێدوانێکی پێ داوە، لەوبارەشەوە دەکرێ بابەتێکی دیکە بنووسێ و تیایدا جەخت بکاتەوە کەئەوەی لەبابەتی یەکەمدا نووسیویەتی ڕاست و دروست بووە، پاشان جەماوەر بڕیار بۆلایەك دەدات، بەزۆریش جەماوەر باوەڕ بەڕۆژنامەوان دەکات کەچاوپێکەوتنەکەی کردووە.

بەڵام، وەك باوە، پەیامنێران ئەو ئاماژە و تێبینیانە بەکارناهێنن کە گومانیان هەیە لەوەی کەسایەتیی قسەکەر ئینکارییان لێ دەکات و بەدرۆیان دەخاتەوە. هەرکاتێکیش پەیامنێر بیەوێ دڵنیابێ لەوەی کە گفتوگۆ دووچاری ئینکاری و بەدرۆرخستنەو نابێتەوە، دەتوانێ بۆجاری دووەم و لەڕێگەی تەلەفۆنەوە قسە لەگەڵ ئەو کەسایەتییەدا بکات کە گفتوگۆی لەگەڵ کردووە، بۆئەوەی ڕەزامەندیی سەبارەت بەهەمووشتێك وەربگرێ کەدەیاننووسێ، ڕۆژنامەوان کەئەمە دەکات ئەو وتارەشی دەست دەکەوێ کەجاری یەکەم ئەنجامی داوە، لەوانەیە کەسێکی سێیەم وەکو شایەت لەگەڵ خۆیدا ببات. بەڵام کەم جاری وا هەیە شتێکی لەوجۆرە ڕوویدات، بەوپێیەی بوونی کەسی سێیەم لەوانەیە مۆرکی نافەرمی لەگفتوگۆکەدا دووربخاتەوە.

## دووەم : ئەو ڕۆژنامەوانەی گفتوگۆ ئەنجام دەدات

## The Interviewer –گفتوگۆكەر

لەوانەیە جیهان لەپەیامنێرێكدا بەدی بكرێ، هەروەها دوورنییە نووسەر لەخەڵوەتگاكەیدا لەمشكێك شەرمەزار تر بێ كەپیشلەیەكی لێ دەردەكەوێ، جگە لەوە بەدوور نازانرێ توانای بەردەوامیی نەبێ و بەهۆی بوونی خەڵكانی ترەوە هەست بەشلەژان بكات و هێزی ئەنجامدانی گفتوگۆی كۆمەڵایەتیی یان خوێندنەوەی وتارێكی فەرمی تیادا بەدی نەكرێ، بەو مانایەی كەلەوانەیە دووچاری نەخۆشی ترسان لەخەڵك بووبێتەوە، لەهەمان كاتیشدا دەكرێ ئەو كەسە سوودمەند بێ و بۆ ڕەگەزی مرۆڤایەتیش دەسكەوتێك بێ، ئەمە لەكاتێكدا كەدەبێ كەسی ڕۆژنامەوان جۆرێكی دیكە و تەواو جیاواز بێ لەكەسانی تر.

مایەی حاڵیبوونە كە پەیامنێر بەشێوەیەكی نادیار ڕقی لەزۆربەی ئەوانە بێ كەكارەكەی ناچاری دەكات پەیوەندییان پێوەبكات، بەڵام دەبێ بزانێ و بەتەواوی فێربێ كەچۆن هەستی خۆی لەو جۆرانەدا بشارێتەوە و دواتر بتوانێ چاوی بەهەموو جۆرەكەسێك بكەوێ و وایان لێ بكات لەئامادەبوونیدا هەست بەئارامییەكی تەواو بكەن، بەجۆرێك بتوانێ هەموو ئەوەیان لێ وەربگرێ كەمەبەستیەتی.

بەو پێیەش زۆر لەوكەسانە لەسەر چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ پەیامنێرە ڕۆژنامەوانییەكان ڕانەهاتوون، هەر بۆیە زیاتر بەچاوی ترسەوە تێیان دەڕوانن و

تارادەیەك بەکەسی سەیر و نامۆیان دەزانن و لەو باوەڕەشدان کەنابێ بڕوایان پێ بکرێ و وەکو خەڵکی دیکەش مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ کە پیشەو کاری تر دەکەن.

هێنری .ف. برینگل — ی ڕۆژنامەوانیی بەناوبانگی ئەمریکی نووسیویەتی:

کەسی تازەکار و ئەوەی لەبەخشینی لێدواندا ئەزموونی پێشتری نییە و بۆ یەکەم جار سەرقاڵی بەخشینی یەکەم لێدوانی ڕۆژنامەوانییە، پێی وایە هەمو ڕۆژنامەوانان بریتین لەژمارەیەك فێڵباز و چاوەڕێی دەرکەوتنی گرفتی خێزانی دەکەن، بگرە وەکو ئەوانە بیر لە بەکارهێنانی هیچ ڕێگەو شێوازێکی مانۆڕو هەڵخەڵەتاندن ناکاتەوە لەپێناوی دروستکردنی کۆسپ یان وەستاندنی پرۆسەی ڕەوای گەڕان و لێکۆڵینەوەی پەیامنێر بەدوای زانیارییەکاندا ئەمە مانای وایە ڕۆژنامەوان پێویستە فێری ئەوە ببێ چۆن دەبێتە فرۆشیارێکی بەئەزموون، فرۆشتنی باش ئەو بناغەیەکە ڕووماڵکردنی هەواڵیی گونجاوی لەسەر بونیاتدەنرێ، هەروەها بەهێزیی کەسێتیی و زیرەکیی و چاپووکیی دوومەرجی سەرەکین بۆ فرۆشتنێکی سەرکەوتووانە. ئەو ڕۆژنامەوانەی واش دەردەخات کەمتمانەی بەخۆی هەیە و خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و ڕێزێکی خودییە، سەرکەوتنی جێگیر و هەمیشەیی مسۆگەر دەکات، بەئامادەبوونی ئەو جۆرە پەیامنێرە ڕۆژنامەوانییانەش لایەنی بەرامبەر هەست بەدڵنەوایی و ئارامی دەکات.

مەحاڵە بتوانرێ چەند ڕێسایەکی گشتیی سەبارەت بەپرۆسەی چۆنیەتی پێشخستنی زیرەکیی کەسێتیی دابنرێ، چەند جۆرێکی جیاوازی ڕۆژنامەوانان هەن و بەپلەیەکی یەکسانیش سەرکەوتوون. بەهەرحاڵ دەکرێ بوترێ ڕۆژنامەوانان کەسانی سادە و ساکارن و ئاگاو هۆشیان زیاتر بەئاراستەی دەرەوەی خودەکانیانە (Entroverts)، یان کەسانی گۆشەگیر و خۆپارێزن، توانیویانە لەڕێگەی هاوسەنگیی وباوەڕ بەخۆبوون و ڕێزگرتنی خودەوە خۆپارێزییەکەیان هەموار و ڕاست بکەنەوە.

* گاسبار میلکۆ تاستس نەیتوانی لەبواری ڕۆژنامەوانیی یان لەهەر بوارێکی یکەدا کەپێویستیان بەپەیوەندیکردنی ڕۆژانە لەگەڵ کەسانی تردا هەیە، سەرکەوتن ەدەست بهێنێ.

دەکرێ بەم جۆرەی خوارەوە، چەند پێشنیازێکی گشتیی بۆ ڕۆژنامەوانە ازەکارەکان دابنرێ: -

أ- ناسنامەی خۆت مەشارەوە، لێدوانی ڕۆژنامەوانیی بەناساندنێکی استگۆیانەی خۆت و کارەکەت و مەبەستی سەردانەکەت دەست پێ بکە. هەوڵ بدە ەوروبەرت بەوە ڕازی بکەیت کەمافێکی ڕەوای خۆتە هەموو ئەو زانیارییانەت ەست بکەوێ کەمەبەستە و لەو پێناوەشدا هیچ گومانێکت بەرامبەر بەتواناکانت یە، بۆیە وا باشترە خۆت لەپرسیارە نەرێییەکان (السلبیة) دووربخەیتەوە، وەك هیچ بەریەستێك نییە بۆئەوەی هەرشتێك دەربارەی ئەو کێشەیە بڵێیت، وانییە؟".

ب _ لەمیانەی ڕاستی و ئاڕاستەکردنی گفتوگۆدا، متمانە و باوەڕو تەنانەت ترس گومانیش پیشان بدە، هەوڵ مەدە بەدەرویەری بابەتەکەدا بخولێیتەوە و بەو ەسایەتییەی کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەیت، بڵێی: دەمانەوێ بزانین ئاخۆ دوانێکمان پێ دەبەخشی، بەڵکو باشترە ڕاستەوخۆ بپرسیت: بۆ چوونت چییە ەبارەت بە ...؟

پ _ لەکاتی گفتوگۆ تەلەفۆنییەکاندا زۆر ئاگاداربە، چونکە تیایاندا لایەنی تر ەسەڵاتی کۆتایی هێنان بە گفتوگۆکەی بەدەستە. مەڵێ: دەڵێم ئاخۆ ئەگەر ....، شتر وایە بڵێی: دەمەوێ لێتان بپرسم ...، سەرەتای گونجاوی گفتوگۆی تەلەفۆنی وەیەکە: فلانەکەس لەفلانە ڕۆژنامە وادەڵێ، دەمەوێ ڕای ئێوە دەربارەی فلانە تە بزانم، گفتوگۆکەش بە وشەی ((باشە)) یان ((Ok)) یاخود هەر دەربڕینێکی پەسەندی دیکە لەوجۆرە تەواو مەکە.

ت_ هەمیشە هەوڵبدە خۆت وا دەربخەیت کەدەربارەی بابەتی باس لێکراو زیاتر دەزانیت و لەکاتێکیشدا ئەگەر سەرچاوە یارمەتیی نەدایت، واپیشان بدە کەبۆ دەسکەوتنی زانیاریی شێوازی دیکەت هەیە. هاوکات هیچ هەڕەشەیەک مەکە، تەنها لەهەندێک حاڵەتی زۆر تایبەتی و وەکو دوا ڕێگەچارەدا نەبێ، بەزۆریش لەڕێگەی ئاڕاستەکردنی ئەو پرسیارانەی وا لەکەسی بەرامبەر دەکەن بگاتە قەناعەتێک کە ڕۆژنامەوان زانیاریی نادروستی لایە و ئەگەر ڕاست نەکرێنەوە، ئەوا بڵاویان دەکاتەوە، دەتوانرێ ئەو کەسەپەلکێش بکرێ و هانبدرێ زانیاریی بدات. هەروەها ترسی کەس بەرامبەر لەوەی بۆچوونێکی نادروستی لەبارەوە وەربگیرێ، لەوانەیە هاندەرێک بێ بۆ کرانەوە و دەربڕینی ڕاستی.

ج_ کاتێک کەسی بەرامبەر دوودڵی بنوێنێ یان ڕازی نەبێ بەقسەکردن، واباشە ڕۆژنامەوانان پەنا ببەنە بەر سەرقاڵکردنی ئەو کەسە بەگفتوگۆیەکەوە کە دووربێ لەبابەتە سەرەکییەکەوە، وەک قسەکردن دەربارەی شتێک کەلە ژوورەکە دانرابێ یان وێنەیەکی هەڵواسراو یان پڕوپاگەندەیەک، دوابەدوای توانەوەی شەختە و دروستبوونی جۆرە دۆستایەتییەک، ڕۆژنامەوان دەتوانێ بەئاگادارییەکی زۆرەوە ڕووبکاتەوە بابەتە سەرەکییەکە.

ح_ تاکاتی وەرگرتنی هەموو زانیارییە پێویستەکان یان تەواودڵنیابوون لەڕازی نەبوونی کۆتایی سەرچاوە بەبەخشینی زانیاریی، لەپرسیارکردن مەوەستە، زۆرجار ڕازی نەبوونی سەرچاوە بەبەخشینی لێدوان بەهەواڵێکی باشتر دەزانرێ لەو زانیاریی‌انەی کەلەوانە بوو لەڕێگەی خولانەوە بەدەوری بابەتەکەدا دەستی بکەوتایە.

## سێیەم : پەیوەندییە گشتییەکان

## Public Relation

زۆربەی ئەو کەسانەی کارکردن لەڕۆژنامە یاخود هەر شێوازێکی دیکەی ڕاگەیاندنرا جێدەهێڵن، لەبواری پەیوەندییە گشتییەکاندا کاردەکەن، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا داهاتی مادی دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەمە، لەو بارەیەشەوە ئەزموونی ڕۆژنامەوانیی چەند دەوڵەمەندتر بێ بارودۆخەکە ئەوەندە باشتر دەبێ، بەڵام کەسانی دیکە هەن نەیانتوانیوە شێوازی لەبار بۆ دەربڕین لەخۆیاندا بدۆزنەوە، بەڵکو هەندێکیان تائێستاش بەدوای دەرفەتدا دەگەڕێن بۆ پێشخستنی ئەو هۆکارانەی باوەڕیان پێیان هەیە.

### ١- ڕەخنەی پێچەوانە Adverse criticism

تاکاتێکی زۆر درەنگیش، ڕۆژنامەوانە شارەزاکان کۆکبوون لەسەر سەرکۆنەکردنی ئەوانەی لەبواری پەیوەندییە گشتییەکاندا کاردەکەن و تاوانبارکردنیان بەوەی کەئەوانە کەسانێکی بەدفەڕو داگیرکەر و لەخۆبایی و ساختەچین.

ئێستا ئەو بڕیارە هەموارکراوە، بەشێکی هۆکاری ئەو هەموارکردنەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەمەحاڵە بەبێ یارمەتیدانی ئەوانەی لەبواری پەیوەندییە گشتییەکاندا

کاردەکەن بتوانرێ ڕووماڵی ئەو هەموو هەواڵانە بکرێ. بەشێکی دیکەش بۆ بەرزبوونەوەی ئاستی کەسانی کارکردو لەبواری پەیوەندییە گشتییەکاندا دەگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی ئەوانە لەبنەڕەتدا لەبواری ڕۆژنامەوانیدا کاریانکردووە و هێز و تواناشیان لەئەنجامدانی کردەوە وروژێنەر و بوێرەکاندا خۆی نواندووە، بەڵام بەم دواییانە پیاوانی پڕوپاگەندەچی و ڕیکلامکەر جێیان گرتونەتەوەو لەبنەڕەتدا سەرکەوتنیان بەندە بەقەبارەی ئەو ڕووبەرەی کە پڕوپاگەندە و ڕیکلامەکانیان لەستوونی ڕۆژنامەکاندا داگیریدەکەن.

بەڵام حاڵی حازر بەرچاوترین ئەو جۆرە کەسانە بەشداربووی زیرەکن لەداڕشتنی سیاسەتدا و سەبارەت بەو کەسانەش کەکاریان بۆدەکەن وێنە و دیمەنی تەواویان لەمزردا کۆبۆتەوە و هەیە، لەبری کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی شۆرەت و ناو بانگیشدا لەوانەیە ڕازی نەبن لەڕۆژنامەوانیدا هیچ شتێك دەربارەی خاوەن کارەکانیان بڵاوبکرێتەوە، هەروەها ئەوان بایەخ بەکێشە ناوخۆییەکەسیی و ئەخلاقییەکان دەدەن، وێڕای گرنگیدان بەڕیکلام و بەرهەمهێنان و بەبازاڕکردن و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی.

ئەوانە بەو پێگە باڵایانەی کە گرتوویانە، لەوانەیە هەندێك کەس پێیان وابێ وەکو کەسانێکی دەمامکدار و دەوڵەمەند زۆر مەترسیدار بن و بە پیاوانی فشار و ئەندازیاری فێڵبازیش وەسفیانبکەن و چەندین زاراوەی دیکەی لەو جۆرەشیان بخەنە پاڵ.

## ٢- هەڵوێستی بەرگریکردن In Defense

وەکو بەرگریکردنێك لەخۆیان، سەدان هەزارو بەڵکو ملیۆنەها کەس لەوانەی کە لەبواری پەیوەندییە گشتیەکاندا کاردەکەن، دووپاتی دەکەنەوە کەچالاکی و کارەکانیان بەهای کۆمەڵایەتیی گرنگیان هەیە.

بەپێویستی دەزانم برگەی یەکێك لەبابەتەکانم بەناونیشانی (چەمکی پەیوەندییە گشتییەکان) بکەم بەنموونە: (( پەسنی کرێکارانی بواری پەیوەندییە گشتییەکان دەکرێ، چونکە بازرگانیی و پیشەسازییان لەسەرکۆنەکردنی رای گشتیی دوور خستۆتەوە و مۆرکێکی مرۆییشیان بە کاروبازرگانیی بەخشیوە و بوونەتە یارمەتیدەر بۆ دۆزینەوەی ئەدەب و خورەوشتی تایبەت بۆیان، لەوەش گرنگتر بوونەتە یارمەتیدەر بۆ دۆزینەوەی ویژدانێك بۆ ئەنجامدانی ئەو دوو پیشەیە و هەموو لایەنێکیان فێرکردووە کە هەر کەسێك خزمەتی باشتر پێشکەش بکات، قازانجی زیاتری دەست دەکەوێ.

ئەوان پەیوەندییە گشتییەکان بەئەنجامدانی کردەوەی دروست و رەخساندنی دەرفەت بۆ خەڵك بۆ زانینی ئەو کردەوە راستەو پیادەکردنی ئەو یاسا زێرینە لەکردەوە رۆژانەکانیاندا پێناسە دەکەن.

بۆ ئەوان، پەیوەندییە گشتییە سەرکەوتووەکان، مانای ئەوەیە مرۆڤ رۆژانە زەوقی دروست و رووخۆشی و موجامەلکردن پیادە بکات بەجۆرێك لەگەڵ ئەو بەرنامە هەمیشەییەدا بگونجێ کەمەبەست لەدوایەوە روونکردنەوەی بەرژەوەندیی کەسییە، لەرێگەی ئەنجامدانی کارە باو گونجاوەکانەوە کەنەوەك بەتەنیا ناو بانگێکی باش بەدەستدێنن بەڵکو وەك دراوسێیەکی باش وایان لێدەکات شایستەی ئەو بەناوبانگییەی بێ)).

هەر لەبواری بەرگریکردن لەپەیوەندییە گشتییەکاندا، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بەشێوازەکانی بەکۆگەیاندنەوە هەیە، گومان نییە لەوەی هەر هەواڵێك کەلە هەر شێوازێکی ڕاگەیاندندا بڵاودەکرێتەوە، هەڵگری بەهایەکی پڕوپاگەندەییە بۆ کەسێك یان لایەنێك.

هەروەها ڕووبەڕووبوونەوەی نابەجێ و تەنانەت کارە ئابڕووبەرەکانیش وادیارە زیان بەقارەمانە نیشتمانپەروەرەکان ناگەیەنن، بەتایبەتیش لەجیهانی هونەر و کات بەرسەربردندا.

خوێنەران خاوەنی بیرێکی کورت و لاواز و ناوردبینن، کاتێکیش ڕوودەکەن ریفراندۆمەکان، زیاتر ئەو ناوانەیان بەدڵەکە پێشتر بەرگوێیان کەوتوون تەنانەت ڕەچاوی ئەوکارە ئابڕووبەرانەش ناکەن کەشێوازەکانی ڕاگەیاندن لەبارەیانەوە بڵاویانکردوونەتەوە.

وەرزشە ڕێکوپێك و گونجاوەکان پڕۆژەی بازرگانین و توانیویانە لەڕێگەی ئەو لاپەڕانەوە کەبۆ وەرزش تەرخانکراون، پڕوپاگەندەی بێ بەرامبەر (بێ پارە) بۆ خۆیان بەدەستبهێنن، هەمان شت سەبارەت بەشانۆ و خانەکانی بڵاوکردنەوە و هۆڵەکانی تایبەت بە پێشکەشکردنی نمایشە مۆسیقیەکان و کاری هونەری پێشکەشکردنی نمایشە مۆسیقیەکان و کاری هونەری دیکە کە بێگومان بەتەواوەتی پڕۆژەی خێرخوازی مرۆیی نین.

لەوکاتەوە کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا جۆن رۆکلفەر، ئیڤی لی بەکری گرتووە، سیاسەتی بەکارهێنانی پەیوەندییە گشتییەکانیش ڕووی لەزیادبوون کردووە، بەئاڕاستەی هاوکاری زیاتر لەگەڵ شێوازەکانی ڕاگەیاندندا، زیاتر لەپشت بەستن بەئامێری دیاریکراو و سپاردنی ئەرکی پشتگوێخستنی هەواڵە نەویستراوەکان پێیان و کۆسپ خستنەسەرڕێی کۆششی ئەو پەیامنێرانەی کەلە پێناوی دەسکەوتنی ئەو هەواڵانەدا کاردەکەن.

بۆیە ئەمڕۆ لەنووسینگەی پەیوەندییە گشتیەکاندا، لەهێڵی ئاسنی و کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانی و دامەزراوە پیشەسازییەکاندا لەکاتی ڕووودانی ئاگرکەوتنەوە و ڕووداو و کارەساتەکاندا یارمەتییەکی گەورە پێشکەشی پەیامنێران دەکرێ، ئەمە لەکاتێکدا نەوەیەك بەر لەئێستا بارودۆخ تەواو پێچەوانەی ئەوە بوو کەئەمڕۆ لە ئارادایە.

بەشی هەواڵەکانی فەرمانگەی پەیوەندییە گشتییەکان بڕێك هەواڵ و دەقی تەواو بۆ ئەو وتارانە دابین دەکات کەکەسایەتییە گرنگەکان دەیاندەن، هەروەها زانیاریی ی دەربارەی کۆنگرە و کۆبوونەوەکان و ئەو پلانەنانەی پەیوەندییان بەگۆڕینی سیاسەت و پرۆسەکانی هەریەکە لەدامەزراوە گشتیی و تایبەتەکان و هی تریشەوە هەیە، ئامادە دەکات، ئەو هەواڵانەی کە هیچ ڕۆژنامەیەك ناتوانێ لەڕێگەی پەیامنێرانییەوە پەیدایان بکات. بۆیە دەکرێ بوترێ، شێوازەکانی ماس میدیا، ئێستا، تارادەیەك لەژێر ڕەحمەتی ئەو کەسانەدان کە لەپەیوەندییە گشتیەکاندا کاردەکەن، ئەوانەی ئاگاداری هەموو ئەو ڕووداوو و هەواڵانەن کە لەنێو چین و توێژە بەرفراوانەکانی کۆمەڵگادا ڕوودەدەن و هەن.

## ٣- مەترسییەکان Dangers

مەترسی گەورە لەوەدایە تا چ پلەیەك ئەوانەی لەبواری پەیوەندییە گشتییەکاندا کاردەکەن بەربەست لەنێوان پەیامنێر و سەرچاوە ڕەسەنەکانی هەواڵدا دروست دەکەن، ئەگەر هەموو هەواڵەکانیش لەڕێگەی ئەو بڵاوکراوە هەواڵیانەوە دەسگیربێن کە بەئاگاداری و بایەخی زۆرەوە ئامادەکراون، ئەو کاتە ڕۆژنامەوان دەبێتە تەنیا کەسێکی چالاکی ئاڵۆگەڕکەری هەواڵ. ڕۆژنامە و گۆڤارە باشەکان شتی زیاتر لەوبڵاوکراوە و بەیاننامانە دەگرنە خۆیان کە ئامادەن بۆ دابەشکردنیان بەسەر ڕۆژنامەکاندا و پاش ئەوەی لەلایەن نووسەرانیشەوە ناونیشانی گونجاویان بۆ

دادەنرێ بڵاودەکرێنەوە. ئەو کەسەش کەلەبواری پەیوەندییە گشتیەکاندا کاردەکات هەرچەندە هاریکار و ماقووڵ بێ ، بەڵام بۆ ساتێکیش ئامادەنییە ئەوە لەیاد بکات کەپابەندبوونی سەرەکیی بۆخاوەن کارەکەی خۆیەتی ئەمە لەکاتێکدا پەیامنێری ڕۆژنامەگەریی لەسیستمێکی دیموکراسییدا خزمەتێکی گشتیی پێشکەشدەکات، لێرەوە دەبێت بناغەیەکی بابەتیانە بۆ ئەو ڕووداني پێکدادانەی لەنێوان بەرژوەندییەکاندا لەکاتێکەو بۆکاتێکیتر دێنەکایەوە ئێستا بڵاوکراوە هەواڵییەکان بەچاکی ئامادە دەکرێن و دەنووسرێن و دەکرێ پشتیان پێ ببەسترێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە شتی فرێدراو و نادیار هەن تەنیا لەڕێگەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان ڕۆژنامەوان و سەرچاوەی ڕەسەنی هەواڵدا نەبێ ڕاست ناکرێنەوە.

کۆنگرە ڕۆژنامەگەرییەکانیش، بەتایبەتی ئەوانەی سەرۆك و بەرپرسە گەورەکان سازیاندەکەن، لەوانەیە ببنەمایەی دڵتەنگی و ناڕەزایی، بەو پێیەی تیایاندا ڕێگە بە ڕۆژنامەوانانی ئامادەبوو نادرێت بەقووڵی لەوکێشانە بکۆڵنەوە کەدەخرێنەڕوو، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا هەموو پەیامنێرێك بەئاراستەکردنی تەنیا یەك پرسیارەوە دەبەسترێتەوە، بۆئەوەی دەرفەت بەزۆرترین ژمارە بدرێ پرسیار بکەن.

لەنێو بارودۆخێکی لەو جۆرەشدا مەحاڵە ڕۆژنامەوان بتوانێ قووڵ و هەمەلایەن بێ،و چونکە تەنها بە پرسیارکردن دەربارەی ڕووداو — ڕاستیەك بەستراوەتەوە، تەنانەت ئەگەر بارودۆخی باشتریشی بۆ هەڵبکەوێ، بەڵام بەرپرسی پەیوەندییە گشتییەکان بەسەرشانی ئەو کەسایەتیەدا دەخولێتەوە کە کۆنگرە ڕۆژنامەگەرییەکە سازدەکات بۆئەوەی لەزیادەڕۆیی و پێلێپەلکێشان ئاگاداری بکاتەوە و وتەکانیشی بۆ ڕاستبکاتەوە، لەبەرامبەریشدا زۆرجار ڕۆژنامەوانان هەست بەناڕەزایی و دڵتەنگی دەکەن بەوپێیەی لەکەرامەتییان دراوە، بەرامبەر بەو جۆرە بارودۆخانەش دەردەکەوێ کەخزمەتی ڕۆژنامەوان بۆ سەرنووسەر و جەماوەر مەسەلەیەکی زۆر زەحمەتە.

بەگوێرەی دید و بۆچوونی ئەوانەی کەلەبواری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا کاردەکەن، ئەوان مەبەستیانە بەهاو مەبەستی پاکی ڕۆژنامەوانان بناسن، بەو پێیەی سنووری کارەکانیان تەنیا لەچوارچێوەی خولقاندنی زۆرترین ئاستی دەربڕینی یارمەتییدا ناوەستێ، بەڵکو بەشێوازی دیکە ژیان ئاسانتر دەکن.

لەمیانەی کۆنگرە و کۆبوونەوە گرنگەکانیشدا بەزۆری ژوور و نووسینگە و ساردەمەنیی و کورسی و تەلەفۆن و ئامێری دیکەی یارمەتیدەر بۆ ڕۆژنامەگەریی ئامادە دەکرێ. شێوازەکانی ڕاگەیاندنیش سەبارەت بەو پلەیە جیاوازن کەتیایاندا ڕێگە بەکارمەندانیان بدەن یارمەتی لە کەسانی بواری پەیوەندییە گشتییەکان و بەرپرسە فەرمییەکان و هی تر وەربگرن، هەندێك ڕۆژنامەڕازی نابن بە وەرگرتنی کتێب یان بلیتی ئامادەبوونی یارییە وەرزشییەکان یاخود نمایشە شانۆییە بێ بەرامبەرەکان، هەروەها ئەو دیاریانەش ڕەتدەکەنەوە کەبەبۆنەی ئاهەنگەکانی لەدایکبوون و هی ترەوە پێشکەشیان دەکرێن.

هەندێك ڕۆژنامەی دیکەش ڕێگە بەمەدەدەن، بگرە پێشوازی لەچاودێری و یارمەتی پەیوەندییە گشتییەکان دەکەن کە خۆی لەبانگهێشتکردن بۆ گەشتی ناوخۆیی و دەرەکیدا دەنوێنێو پەیامنێری تازەکاریش پێویستە بەڕوونی هەڵوێستی ڕۆژنامەکەی بەرامبەر بەو بابەتە بزانێ.

ئەو خەڵاتانەی کەلەبوارێکی دیاریکراودا بەباشترین بابەت و نمایشکردن دەبەخشرێن، زیرەکترین و کەڵەکەبازترین ئە ڕێگایانەن کەلە پێناوی زیادکردنی کاریگەری لەسەر هەڵسەنگاندنی هەواڵ و بڕیار لەسەردانی بەکاردەهێنرێن، لەوحاڵەتەشدا بڕیار بڕیاری خەڵاتبەخش دەبێ.

هەندێك ڕۆژنامە خواخوایانە گەورەترین ژمارە لەو جۆرە خەڵات و بڕوانامانە بەدیوارەکانیاندا هەڵواسن و هەندێکی دیکەش هیچ بایەخێکیان پێ نادەن.

لەوانەیە لەڕێگەی زیادەڕۆیی لەدووپاتکردنەوەیەکی دیاریکراودا ویست و خواستێکی گەورە ببوژێتەوە و گەشە بکات، زیاتر لەهەڵسەنگاندنێکی بابەتیانە و

هاوسـەنگی ڕووداوەکـانی ڕۆژ. بەواتایـەکی دیکـە، لەوانەیـە بـۆ ڕازیکردنـی خەڵاتبەخشەکان کۆششێکی ئەنقەست بدرێ و ئەمە خۆی لەخۆیدا دەبێتە مایەی زیانگەیاندنێکی زۆر بەخستنەڕوو و پێشکەشکردنی هەواڵ بەشێوازێکی گونجاوانە.

## چوارەم : نهێنییە حكومییەكان
## Government Secrets

بەگوێرەی بۆچوونی: مافی جەماوەرە كە بزانێ و ئاگادار بێ ، هەموو ئاستە حكومییەكان سانسۆرێكی توندتر لەوەی كارمەندانی بواری پەیوەندییە گشتیەكان لەكەرتی تایبەتدا دەیسەپێنن، جێبەجێدەكەن.

هەر لەسەردەمی ئیدارەی (ترومان)ەوە، دەسەڵاتدارە فیدراڵییەكان بەرپێز بەندكردنی زانیاریییە نادیارەكان، هەركەسەو بەپێی پلەی نهێنی خۆیان ئاراستەكراون.

ئەو بڕیارە لەنێوەندی ڕۆژنامەو بڵاوكەرەوە ڕێكخراوو كۆمەڵەكانی نووسەرە ئەمەریكییەكاندا ناڕەزاییەكی زۆری لێكەوتەوە، ئەوەبوو یەككگرتووی سیگما دیلتاكی و چەند گرووپێكی دیكەی نووسەران داواین لەئەنجوومەنی نوێنەران كرد كۆبوونەوەیەكی تایبەت سازبكەن و تیایدا گفتوگۆ دەربارەی ئەو بڕیارە بكەن و یاسایەكیش دەربكەن كە ئاشكراكردنی بێپاسا و ناماقووڵی زانیارییەكان قەدەغە بكات، لەحوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦دا كۆنگرێس دانی بەلیستی یاسای ١١٦ دا ناو لەمانگی تەمووزی ١٩٦٦یشدا سەرۆك جۆنسۆن ئیمزای كرد، ئەو یاسایە دانی بەمافی جەماوەر و ڕۆژنامەگەرییدا نا، بەوەی لە بەیاننامە و سسیتم و دۆسیەكانی

دامەزراوە فیدراڵییەکان بۆکڵنەوە، داننانیش بەوەی کەهەندێك جۆری ئەو زانیاریی‌انە پەیوەندیان بەئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە، مەسەلەیەکی چاوەڕوانکرا بوو.

بەم جۆرە ئەو یاسایە و ئاستی کاریگەریتی لەجێبەجێکردندا بوو مایەی وروژاندنی چەند شتێك کەدەوەستنە سەر چۆنێتی شیکردنەوەی لەلایەن ئەوانەی یاسا ناچاریان دەکات لەگەڵ ڕۆژنامەواندا یارمەتی زیاتر بنوێنن.

لەژێر سایەی ئەو هێزە پاڵنەرشدا کەهەڵچوونی واشنتۆن هێنایەکایەوە، لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کەچەند ڕەگەزێکی جیاواز لەناو دەوڵەت و دامودەزگاکانی حکومەتە خۆجێییەکاندا مومارەسەی سانسۆر دەکەن، بەهاندانی هەندێك دامودەزگای ڕۆژنامەوانیی و ئەنجوومەنە ڕۆژنامەوانییە حکومیەکانیش، حکومەتی هەندێك ویلایەت چەند یاسایەکیان دەرکرد و تایاندا ڕێگە لەئەنجوومەنی شار و دامودەزگاکانی فێرکردن و هی تریش دەگیرێ کەهەموو کۆبوونەوەکانیان بەئاشکرا ببەستن، هەروەها چەندین یاسای دیکەش داڕێژران بەمەبەستی فراوانکردنی مافی ڕۆژنامەوانان لەلێکۆڵینەوە و بەدواداچوون و بەکارهێنانی هەموو جۆرە دۆسیە و مەحزەرە گشتییەکان، بەو پێیەش مەرجەکان تاڕادەیەکی زۆر لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازن، بۆیە ڕۆژنامەوانیی تازەکار دەبێ بێگومان بێ لەوەی هەموو ئەو مافانە دەزانێ کەهەیەتی، ئەمە وێڕای دەرککردن بەو سیفەتانەی کە سەبارەت بەو جۆرەکێشانە پێی بەخشراون، زانیارییەکانی لەسەرچاوە فەرمییەکانەوە دەسگیر بکات نەك ڕازیبێت بەقسەکردن لەگەڵ هەندێك فەرمانبەری بیرۆکراتیدا. لێرەوە دەکرێ بڵێین: کاتێك پەیامنێر خەریکی ئاشکراکردن و دەرخستنی هەواڵەکان و ئەو هەواڵانەشە کەلەدوای هەواڵەکانەوە دەوەستن. لەڕاستیدا دەبێتە بریکارێکی باوەڕپێکراو بۆ دیموکراسیی و خۆبەختکەرێك لەپێناوی ڕاستیدا، کەسێك کەهەرگیز کۆمەڵگای ئازاد بەبێ بوونی ئەو ناتوانێ بەردەوام بێ و بوونی هەبێ – مەبەستمان: مافی جەماوەرە لەوەی تێ بگات و بزانێ.

## پێنجەم: بۆچوونی شرۆڤەكاری
## The Interpretative View Point

كاتێك پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی خەریكی كۆكردنەوەی زانیارییە دەربارەی ڕووداوێك، هەوڵ دەدات وەڵامی چەند پرسیارێكی وەك (كێ، چی، لەكوێ، كەی ، بۆچی، چۆن)ی دەست بكەوێ، لەڕووی پراكتیك و بۆ هەر ڕاپۆرتێكی هەواڵییش، چوار پرسیاری یەكەم بەبنەڕەتی دادەنرێن، لەبەشی سێیەمی ئەم كتێبەدا دەچینە سەر ئەو گرنگییەی كەدەبێ ئەو پرسیارانە لەبارودۆخە جۆراو جۆرەكاندا پێیان بدرێ، بەشێوەیەكی سەرپێیی، دەكرێ بوترێ هەموو چیرۆكە هەواڵیەكان بەپلەیەكی گرنگ ڕەگەزی (بۆچی) و (چۆن) ناگرنە خۆیان، تائەو ئاستەی بایەخ و گرنگیی ڕۆژنامەوان ڕابكێشرێ، بەڵكو واقیعی پراكتیكی دوپاتی دەكاتەوە كەپێچەوانەی ئەمە ڕاستە. پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی كەلەزۆربەی چیرۆكە هەواڵیەكاندا خەریكی گەڕان و كۆڵینەوەیە لە (بۆچی)، لەڕاستیدا پرسیاری (بۆچی) دەكات، تەنانەت ئەگەر ئەو وەڵامەی دەستی دەكەوێ بەشێك لە (بۆچی)یش پێكبهێنێ.

ڕۆژنامەوانیی تازەكار كەدەخوازێ بگاتە ئەو لوتكانەی لەبەشی یەكەمدا ناومان بردن، دەبێ دەرك بەو ڕاستیە بكات هەر كاتێك تیایدا كارێكی قووڵ و هەمەلایەن و دروست ئەنجامبدات، كەخۆی لەجێبەجێكردنی زنجیرەیەك گفتوگۆ و دیمانە دەربارەی ڕووداوێكی بچووك و ساكاریشدا بنوێنێ، ئەوا لەڕووی پراكتیكییەوە خۆی

ڕادەهێنێ و ئامادەکات بۆ ئەوەی لەئایندەدا کاری زەحمەت و ئاڵۆزتر جێبەجێبکات، بەڵکو لەبەرامبەر پرۆسەی کۆکردنەوە هەواڵدا شێواز و چوارچێوە و باری هزریی خۆی دەبوژێنێتەوە و پێشی دەخات.

ئەوەی باسی لێوە کرا، دەکرێ لەم نموونەیەی خوارەوەدا بیخەینەڕوو:

*- پۆلیس کارتەر دیڤیسی تەمەن چواردە ساڵەی کوڕی جۆرج دیڤیس و خانمەکەی دەسگیر کرد کە لە ٤٥١٣، شەقامی کۆراڵ ستریت دەژین.

* لەبەرچی ؟

*- چونکە لە خوێندنگای دواناوەندیی تایلۆر جۆنیەری ١٢١٦ی شەقامی مارشاڵدا بەچەقۆ لەمامۆستاکەی داوە، مامۆستاکەش خاتوو ڤیڤیان هیلەری تەمەن ٤٨ ساڵە و لە ٥١٤١ لەشەقامی ڤاکونیر ئەڤینۆ دەژی.

* خوێندکارەکە بۆ وای کرد؟

* - دەسدرێژییەکە ڕاستەوخۆ دوای ئەوە ڕوویداوەکە مامۆستا بەخوێندکارەکەی ڕاگەیاندووە لەزمانی ئینگلیزیدا دەکەوێ.

بەڵام هەرزەکاری تر لەخوێندنیاندا سەرناکەون و لەگەڵ ئەوەشدا پەنا بۆ توندوتیژی نابەن بەرامبەر بەمامۆستاکانیان، هۆی چییە ئەو مێرمنداڵە جیاوازە؟ وەکو هەوڵێك بۆ زانینی هۆکارەکەی ئێستا پزیشکی دەروونی لەنەخۆشخانەدا خەریکی پشکنینی ئەو مێرمنداڵەیە.

کاتێك ڕۆژنامەوان چاوەڕێی ڕاپۆرتی پزیشکی دەروونی دەکات، دەتوانێ زانیارییی دیکە دەست بخات: بارودۆخ و دەرەنجامی ڕووداوەکە، بارودۆخی قوربانییەکە، لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس و ... تاد، پرسیار ئاراستەی بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگا بکات و دۆسیەکانی تایبەت بەهەڵسوکەوتی کارتەر لە خوێندنگادا بپشکنێ، جگە لەمە پرسیارکردن لەهەڤالانی پۆل لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی تیشکی زیاتر بخاتە سەر ڕووداوەکە، هەروەها دەکرێ لەڕێگەی سەردانی ماڵی کارتەر و دراوسێکانی و لەمیانەی گفتوگۆکردن لەگەڵ دایك و باوك و کەس و کار

دراوسێ و هاوڕییان و هەموو ئەوانی پەیوەندییان پێوە هەیە، هێماو بەڵگەی زیاتری پەیوەندیدار بەوەڵامی پرسیاری (بۆچی) بەدەست بهێنرێن.

پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی بەو پێیەی دیراسەی بیرکردنەوەی تازەی کردووە لەبوارەکانی زانستی دەروون و زانستی دەروونی کۆمەڵایەتیی و تەندروستی دەروونی و کۆمەڵایەتییدا، توانای ئاڕاستەکردنی پرسیاری قووڵ و کاریگەری هەیە، چەند دەیەیەکی کەم بەر لەئێستا، ئەو پەیامنێرە توانای پێشبینییکردن و زانینی ئەگەرەکانی هەبوو، وەکو زۆربەی کەسانی تریش، دابەشبوونێکی تەواو لەنێوان مێرمنداڵە باش و خراپەکاندا هەیە کەتاڕادەیەکی زۆر ویستی ئازادانەیان دیار دەکات، بەڵام ئەو هەڵوێستەی ئاسانتر دەینواند، پێی وابوو ئەو لاوەی کەلەڕووی کۆمەڵایتییەوە نەیتوانیوە خۆی بگونجێنێ، قوربانیی جۆرە کۆنترۆڵکردنێکی شەیتان و جنۆکەکانە، لەهەموو حاڵەتەکانیشدا توندترین جۆرەکانی سزادانی تاکە ڕێوشوێن بووە کەبەگونجاو زانراوە.

پۆلیس بەگوێرەی فەلسەفەی ((دەسگیرییان بکە و بیانکوژە)) کاری دەکرد و لەلایەن ڕۆژنامەوانانیشەوە هان دەدرا، ئەو ڕۆژنامەوانانەی کەڕەنگدانەوەی قێزی زۆربەی خوێنەرانیان بوون بەرامبەر بەو جۆرە هەڵسوکەوتە نابەجێیانە.

تەنیا لەماوەی یەك سەدەشدا هەڵوێستی زۆربەی خەڵکی فەرمیو دادوەر و بەخێوکەر و ڕۆژنامەوانان هی تر ڕووی لەگۆڕان کرد. ئێستاش دان نراوە بەوەی لای ئەو مێرمنداڵە شتێك هەیە هەڵەیە و وای لێدەکات هەڵسوکەوتێکی وەك ئەوەی کارتەر کردی، بنوێنێ، پزیشکە دەروونییەکانیش هێشتا دوو دڵن بەڵکو ڕازی نین تەنیا دوای پێشکەشکردنی ڕاپۆرتە فەرمییەکانیان بەلایەنە فەرمیە پەیوەندیدارەکان نەبێ، لەگەڵ پەیامنێراندا گفتوگۆ دەربارەی ئەو حاڵەتانە بکەن، لەهەمان کاتدا پەیامنێران نابێ بەپشت بەستن بەلێکۆڵینەوەکانیان جۆری نەخۆشی دیارییبکەن، بەڵکو دەتوانن چەند ڕاستیەکی گونجاو و دروست بڵاوبکەنەوە، وەك ئەوەی ئاماژە بکەن کەمێرمناڵی باسکراو هەست بەچەوسانەوە دەکات یان لەخانەوادەیەکی وێراندا

دەژێت، یان سەربەخانەوادەیەکی دەوڵەمەندە و جگەلە بایەخ و چاودێری دایک و باوک، هەموو شتێکی بۆ فەراهەمکراوە.

بۆچی هەندێك مناڵ لەژینگەکانیان دوا دەکەون و تێکدەچن، لەکاتێکدا هەندێك منالّی تر لەهەمان ژینگەدا وایان بەسەر نایەت؟ وەلاّمی ئەو پرسیارە تایبەتە بەپزیشکی دەروونی تایبەت بە دیراسەکردنی هەڵوسەکەوتی منالاّنەوە، لەوانەشە بۆی دەربکەویّ ئەو مێرمنالّەی کەبەپێی پێوەرەکانی گرووپ هەڵسوکەوت نەکات منالّە، هەرئەوەش کێشەی منالاّنی دیکەیە کە دەچنە ریزی ئەو باندانەی کەکردەوەی دژ بەکۆمەلّ ئەنجامدەدەن.

هاندەری مرۆیی بابەتێکی زۆر ئالّۆزە بەنیسبەتی لێکۆڵینەوەی زانستی و، دووپاتی دەکاتەوە کەمنالّ لەناوەوە و دەرەوەی مالّ وشوێنی دیکەدا ڕووبەڕووی چەندین کاریگەریی دەبێتەوە، ئەو کاریگەریانەش بەشێوازی جۆراو جۆر کاردەکەنە سەر منالاّنی جیاواز، دارمانی خێزان و لەبەریەك هەڵوەشانەوەی و هەژاری و گەڕەکە پیس و هەژارەکان و هی تریش وەلاّمی ئاسانن بۆ ڕوونکردنەوەی هەلّوێستە ئالّۆز و تێکهەلّچووەکان.

ئەگەر دیمەنی ماقوولّ و ڕوونیش سەبارەت بەحالّەتی یەك لایەنی (فردی) دەرکەوت، ئەو کاتە پەیامنێری بەتوانا دەتوانیّ بەردەوام بیّ لەبەدواداچوون و لەسەر ئاستی جۆراوجۆری لێکۆلّینەوە و پشکنینیشدا توانای دەبیّ بپرسیّ: لەبەرچی؟

کاتێکیش سەرژمێرییە کۆمەلاّیەتییەکان ئاماژەیان بەبوونی پەیوەندی لەنێوان هۆکارە جیاواز و هەمەڕەنگەکانی وەك: ژیان لەنێوەندی هەژار و پاشکۆی ئەتنیکی و ئاینی و نەتەوەیی و بارودۆخی ئابووریی و فاکتەری تردا کرد، ئەو وەختە پێویستە ڕۆژنامەوان بپرسیّ: لەبەرچی؟ دەربارەی ئەوەیّ پەیوەندی بەهەموو ڕووداو یان حالّەتێکی یەك لایەن (فردی) یاخود هەموو فاکتەرێکەوە هەیە، پەیوەندیی هۆکار و دەرەنجام چییە؟ چۆن جۆری ئەو هەڵوسکەوتە شیدەکردێتەوە کەلەو پەیوەندییەوە

دروست دەبێ؟ لەبەرچی (ئەنجام) توندوتیژی، یان هەر هەڵسوکەوتێکی هەڵەی تر بووە، نەوەك خۆکوشتن؟

ڕەنگدانەوەی ئەندامیی یان بایۆلۆژیی هەستکردن بەدڵتەنگی و نائارامیی، بەبێ ڕەچاوکردنی هۆکار لای کەسە جۆراو جۆرەکان چی دەبێ؟ یان نواندنی توندوتیژی هەڵسوکەوتێکی دروستە و لای ئەو گرووپەوە کەمرۆڤ دەیەوێ ڕێزگرتنی بەدەست بێنێ، دەبێتەمایەی ڕەزامەندی؟ یاخود هۆکارەکەی بۆ بوون و مومارەسەکردنی توندوتیژی دەگەڕێتەوە لەبوارەکانی دیکەدا، لەنێوەند و دەوروبەر و تەنانەت لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتیشدا؟ هەندێك کێشە هەن بایەخی گرنگیان بۆ پسپۆڕانی جۆراوجۆری زانستە کۆمەڵایەتییەکان هەیە و ڕۆژنامەوان ناتوانێ کارو لێکۆڵینەوەکانیان زیاد و کەم بکات، بۆیە واباشترە پەنا بباتە بەر زانیارییەکانیان یان داوای یارمەتی و ئامۆژگارییان لێبکات، لەوەش گرنگترو ڕۆژنامەوان لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا ناتوانێ بەرفراوانیی زۆر بنوێنێ، یەکەم، بەهۆی بەکارهێنانی ڕۆژنامەوانیی خێرا و دووەم، لەپێناوی پێشخستنی تێگەییشتنی گشتیدا، لەکاتێکدا ئەگەر دەرکیکرد کە ڕووداوە گۆشەگیرەکان لە واقیعدا گۆشەگیر نین.

مەحاڵە و پێویستیش ناکات پەیامنێر لێکۆڵینەوەی بەرفراوان و قووڵ بۆ لایەنە جۆراو جۆرەکانی هەموو ڕووداوێك بکات، وەکو ئەو ڕووداوەی کارتەر دیڤیز کردی ڕووبەری دیاریکراوی ڕۆژنامەش بۆ ڕووداوی لەوجۆرە بەهیچ شێوەیەك ڕێگە بەئەگەری چارەسەری ورد و دورو و درێژو شیکردنەوەی قووڵی لایەنە جۆراو جۆرەکانی هەموو ڕووداوێك نادات.

ڕۆژنامەوانە بەبەردەوامی ئەو شارەزاییە کۆدەکاتەوە کەلە قۆناغی پراکتیکیدا دەستی دەکەوێ و لەکاتی ڕووماڵکردنی ڕووداوەکانیشدا ڕەنگدانەوەی دەردەکەوێ. ئەگەر ڕۆژنامەوان نەیتوانی سوود لەو دەرفەتانە وەربگرێ کەلەسەرەتای ژیانی

پراکتیکیدا بۆی هەڵکەوتوون، ئەو کاتە نەوەکەی لەهەمان ئەو ژوورەدا سەردانی دەکات کە تیایدا دەستی بەکارەکەی کردووە.

چارەکەسەدەیەك لەمەوبەر سیدنی کوبرێ نووسیویەتی:

هەنگاوە ئایندەییەکانی رۆژنامەگەریی ئەمەریکی چین، ئەگەر بیەوێ ببێتە دامەزراوێکی کۆمەڵایەتیی کاریگەر و هاوچەرخ؟ ئەو بابەتانەی رۆژنامە لەبنەرەتدا چارەسەریاندەکات، خاوەنی مۆرکی دەروونیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتین، بۆیە بەزیادەڕۆیی دەزانرێ کاتێك بەشێوەیەکی ساکارانە پەناببرێتە بەر چارەسەرکردنیان وەك ئەوەی شتێکی رۆتینیی ئاسایی و رۆژانە بێ. لایەنە جۆراو جۆەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دەبێ بەشێوەیەکی بەرنامە بۆدارێژراو دیراسە بکرێن و لێیان بکۆڵرێتەوە، نەك بەوشێوە تەماشاکردنە ساکار و رووکەشییانە.

جەستەی مرۆڤ بریتییە لە سسیتمێکی ئاڵۆز و تێکهەڵچووی دەماریی و فیزیۆلۆژی، کاتێکیش ئەو سسیتمە دووچاری دارمان یان وەستا دەبێتەوە تەنیا ئەو کەسانە نەبێ کەراهێنراون و شیانراون، هیچ کەسێکی دیکە ناتوانێ چاکی بکاتەوە و رای بهێنێتەوە.

ئەو مادە (بابەت)ەش کە هەواڵیی لێدروست دەکرێ خاوەنی هەمان ئەو سیفەتانەیە کەجەستەی مرۆڤ هەیەتی، بەو پێیەی سەر بەهەڵسوکەوتی مرۆییە و پێیەوە بەندە، بۆیە پەیامنێرە راهێنراو وشیاو و تایبەتمەندەکان و ئەوانەی بەتەواوی شارەزای زانستە کۆمەڵایەتیەکانن، بەتەنیا دەتوانن زیرەکانە رووداوەکان چارەسەر بکەن و شرۆڤەیان بکەن.

ئێستا هەواڵ بەتەواوەتی لەهۆڵەکانی زانکۆوە دێ و دەچێتە هەموو بوارێکی پەیوەندیدار بەپیشەسازیی و سیاسەتەوە، هەمان ئەو شتە بۆ لەبواری رۆژنامەگەرییدا نەبێ؟

# ڕێکخستنی ڕاستییەکان
# Organizing The Facts

یەکەم : ئاڕاستە هاوچەرخەکان

دووەم: شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە.

سێیەم : پێشەکی

چوارەم: بۆدی

١- شێوەی لولپێچی (حلزونی).

٢- یەکێتی

٣- بەبڕگەکردن

٤- بابەتەکان

٥- بەدوایەکداهاتنی کاتیی

پێنجەم: تێبینییەکانی پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی

تائەوكاتەش کەپەیامنێر لەئەرکی کۆکردنەوەی ڕاستییەکان(Facts) سەبارەت بەڕووداوێکی دیاریکراو دەبێتەوە، دەستدەکات بەبیرکردنەوە لەوشێوازەی کەبەهۆیەوە ڕووداوو ڕاستییەکان لەچیرۆکێکی هەواڵیدا ڕێکبخات، ئەزموون و شارەزایی پەیامنێریش چەند زۆرتربێ ئەوەندە پرۆسەکە میکانیکی و نەستیانە بەڕێوەدەچێ کاتێکیش ڕۆژنامەوان زانیاریی تازەی دەستدەکەوێ دەست بەهەموارکردن و گونجاندنی هزرە پێشووەکان کەپەیوەندییان بەبابەت یان هزرە سەرەکییەکەوە هەیە دەکات، (ئەوانەی لەمیانەی جێبەجێکردنی پرۆسەکەدا سەریان هەڵداوە و ئاشکرا بوون).

## یەکەم : ئاراستە هاوچەرخەکان
## Contemporary Trends

هاوکات لەگەڵ تەواوبوونی جەنگی دووەمی جیهانیدا، توێژینەوەی زۆر دەربارەی شێوازە تەقلیدییەکانی ڕێکخستنی چیرۆکی هەواڵیی سەریان هەڵداو سەرنووسەرانی ئاژانسی ئاسۆشێتد پرێسیش لەچەند کۆنگرەیەکی ساڵانەدا بایەخێکی تایبەتییان بەو ڕێگە جۆراو جۆرانەدا کەوا لەچیرۆکی هەواڵیی دەکەن بۆ خوێنەران زیاتر بگونجێن، مەبەستیشیان لەمە سەرخستنی گۆڤارە هەواڵییەکان بوو لەوەی بتوانن بەشێوەیەکی زیندووتر هەواڵەکان بخەنە ڕوو، مەبەستی دووەمیش کەلەوانەیە گرنگتر بێ و خۆی لەبڵاوکراوە هەواڵییە ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنییەکاندا دەنوێنێ، ئەوانە دەریانخستووە چۆن دەکرێ کرۆکی چیرۆکی هەواڵیی بەژمارەیەك وشەی کەمتر پێشکەش بکرێ لەو ژمارەیەی کە ڕۆژنامەیەکی تەقلیدیی ئاسایی لە پێشەکی چیرۆکی هەواڵیدا بەکاری دێنێ.

سەندیکای ڕێکخراوە ڕۆژنامەوانییەکان و هەندێك ڕۆژنامەی گەورە ژمارەیەك شارەزای بواری توانای خوێندنەوە (Readability)یان بەکارهێنا بۆئەوەی مومارەسەی ڕۆژنامەوانیی ئەو ڕێکخراو و ڕۆژنامانە شیبکەنەوە، مەبەستیش لە (Readability)، واتە بابەت بەکەڵکی ئەوە بێت بەئاسانی وتوانای کەمتر بخوێنرێتەوە.

لەبەرامبەریشدا هەندێك ڕۆژنامەوانیی تەقلیدی و بەناوبانگ خۆشحاڵییان بەرامبەر بەجۆر و شێوازەکانی ئەو چەمکە دەربڕی، بەڵکو لەمەزیاترو لەنێو خوێنەراندا دەستییان کرد بەگلەییکردن لەبڵاوکردنەوەی نەزانی و پشت گوێخستنی شێوازەکانی نووسینی ڕۆژنامەوانیی، هەندێکی دیکەش پێیان وابوو دەبێ لەزیادبوونی تێگەیشتنی – ڕۆژنامەوانان بۆلایەنە دەروونیی و ئامارییەکانی پرۆسەی پێکگەیاندن (لەوەلام) بکۆڵرێتەوە.

بەو پێیەش چەند نەوەیەکە تەنیا ئەو شەش پرسیارە بەخوێندکارانی بواری ڕۆژنامەوانیی وتراون، بۆیە وەك چەند پرسیارێکی سواو دێنەبەرچاو، بەهەر حاڵ و بەبێ ڕەچاوکردنی شێوازی بەکارهێنراو لەنووسین و قسەکردندا، بەڵام دەبێ ویست و خواستی خوێنەر و گوێگران لەزانینی(کێ و چی و کەی و لەکوێ و بۆچی و چۆن) سەبارەت بەڕووداوەگرنگەکان بهێنرێتەدی.

ئەوەی لەژێر کاریگەریی هێنانەدی توانای خوێندنەوەدا (Readability) و بەهۆی ئەو دەرئەنجامانەی کە لێکۆڵەران لەو بوارەدا پێی گەیشتوون، بریتیە لەو سستییە گەورەیەی کەلەبەکارهێنانی ڕێسا توند و پەیوەندیدارەکاندا بەپێکهاتەی چیرۆکی هەواڵیی جێبەجێدەکرێن. نەوەیەك لەمەوبەر دەبوایە لەبڕگەی یەکەمی چیرۆکی هەواڵیدا باس لەو شەش پرسیارە ناسراوە بکرێ، بەڵام ئەمڕۆ لەپێشکەشکردن و خستنە ڕووی ئەو پرسیارانەدا ئازادییەکی زیاتر بەنووسەر دەدرێ.

## دووەم: شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە
## The Inverted pyramid Form

سەرەڕای ئەو تاقیکردنەوە چڕوپڕو زۆرانەی ئەنجام دراون، بەڵام زۆربەی هەرەزۆری چیرۆکە هەواڵیەکان هێشتا بەپێی ڕێسای تەقلیدی دەنووسرێنەوە، ئەو ڕێسایەی دەخوازێ بەشی یەکەم (ئینجا ئەگەر تەنها برگەیەك بێ یان نیو دەرزەن یاخود زیاتر لەو برگانەی تەنیا ڕستەیەك دەگرنە خۆیان)، کورتەیەکی تەواوی چیرۆکەکەی تێدا بێ.

جیاوازی سەرەکیی و بنەڕەتیی لەنێوان نووسینی هەواڵ لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و شێوازەکانی تری نووسینی یان دانان(composition)، وەك بابەت و شیعر و شانۆ و ڕۆمان و کورتە چیرۆك لەوەی خوارەوەدا دەمێنێتەوە:

داهێنەرانی ئەو شێوازانە لەنووسین و دانان، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا، دەست بەباسکردنی و وردەکارییە بچووك و لاوەکییەکان دەکەن و تاکۆتایی دەسبەرداری لووتکە دەبن، بەڵام نووسەری هەواڵ پێچەوانەی ئەو پلانە دەنوێنێ. هەرکاتێکیش لیستێکی ڕووداوەکان بدرێتە دەستی ڕۆژنامەوان بۆئەوەی لەسەر شێوازی چیرۆکێکی هەواڵیی ڕۆژنامەوانیی ڕێکیان بخات و دایانبڕێژێ، تێبینی دەکرێ گرنگترین ڕووداو یان لووتکەی چیرۆکەکە هەڵدەبژێرێ و لەپێشەوە دایدەنێ، دواتر

نۆرەی ئەو ڕووداو دێ کەلەڕووی گرنگییەوە پلەی دووەم داگیر دەکات پاشان ڕوداوی سێیەم و ... بەم جۆرە.

شێواز (قاڵب، فۆرم The Form)ی تەقلیدی بەکارهێنراو لەنووسینی هەواڵەکاندا بەشێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە ناودەبرێ، وتراویشە لەماوەی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا دۆزراوەتەوە، ئەوکاتەی بۆ یەکەم جار پەیامنێران تەلگرافیان بەکارهێناوە.

ترسی ئەو پەیامنێرە جەنگیانەش لەوەی راپۆرتەکانیان بەجارێك بڵاونەکرێنەوە، وای لێکردن زۆرترین بڕی زانیارییی لەبڕگەی یەکەمدا کۆبکەنەوە.

چەند دەساڵێکیش دواترو ئاژانسە ڕۆژنامەگەرییەکان کەچیرۆکە هەواڵیەکانیان لەرێگەی بروسکەوە دەنارد توانیان ئەو شێوازە تەواو و کامڵبکەن.

بەرلەبەرکاهێنانی ئامێری چاپکردنی وشە لەدوورەوە ( کە ئامێرێکی تەلگرافییە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وشە چاپ دەکاتTeletypewriter) لەناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، کەم واهەبوو بەجارێك چیرۆکە هەواڵییە بەرچاوو گرنگەکان بنێردرێن، بەڵکو سەرەتا چەند برگەیەك لەژمارەیەك چیرۆکی هەواڵی گرنگ دەنێردران پاشان برگەکانی تر، لەمیانەی ناردنی ڕۆژانەشدا ژمارەیەکی گەورەی برگە سەرەتاییە نوێ یان جێگرەوەکان (پێشەکییەکان – Leads) و زیادە و کەمکردنیان تێدا بەدیدەکرا، بەمەش هەواڵەنووسراوە خۆجێییەکان لەسەر شێوازی ئاژانسەکانی هەواڵ ئامادەدەکران. بەچەند ڕێگەیەکی هەمە جۆریش بەرگری لەبەکارهێنانی قاڵبی هەرەمی هەڵگەڕاوە کرا لەنووسینی هەواڵەکاندا کەبەرچاوترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

## ١- ئاسانکردنی خوێندنەوە To Facilitate Reading

ئەو بابەتە نووسراوانەی کەڕۆژنامەیەکی ئاسایی دەیانگرێتە خۆیان، ئەگەر لەشێوەی کتێبدا چاپبکرێن مجەلەدێکی زلیان لێ دەردەچێ، بێگومان خوێنەری

ڕۆژنامەی ئەمریکیش کاتێکی وای بەدەستەوە نییە ڕۆژانە ئەوەندە بخوێنێتەوە، لەهەمان کاتدا بایەخیش بەهەموو ئەو بابەتانە نادات کەڕۆژنامەکان بڵاویان دەکەنەوە، بۆیە ئەگەر لووتکە (ڕەگەزی گرنگ و بەرچاو)ی هەربابەتێك لەسەرەتاکەی دابێت، ئەو وەختە خوێنەر دەتوانێ بەخێرایی ئاگاداری ناوەڕۆکی هەواڵ و بەرچاوترین ڕەگەزەکانی بێت.

خۆئەگەر خوێنەر بایەخ بەبابەت یان ڕووداوەکان بدات، ئەو وەختە بەدوای خوێندنەوەی درێژەی ئەو هەواڵانەدا دەگەڕێ کەسەرنجی ڕادەکێشن، بۆئەوەی بشزانرێ مەسەلە چییە، دەتوانێ پەنا نەباتە بەر خوێندنەوەی هەموو بابەتەکە.

## ٢- تێرکردنی ویست و خواستەکان To Satify Curisity

ئەمە شێوازی سروشتی گێڕانەوەی هەر هەواڵێکە، یەکێك کەلەوەختی مەلەوانیدا بخنکێ و کەسێکی دیکەش ئەگەر بیەوێ ڕووداوەکە بگێڕێتەوە، هەرگیز لەوەوە دەست پێناکات کەچۆن کەسی خنکاو لەگەڵ چەند هەڤاڵێکیدا خۆیان ئامادەکردووە بچنە سەر دەریا، بەڵکو بەر لەهەمووشتێك خاڵە گرنگە کە دەگوازێتەوە — خنکانی جۆن لەکاتی مەلەوانیدا، پاشان بەدوورودرێژی باس لەشتەکانی تر دەکات کە پەیوەندییان بە (چۆن و کەی و لەکوێ)ی ئەم ڕووی داوەوە، هەیە.

## ٣- ئاسانکردنی ڕێکخستن و دەرهێنان

## To Facilitate Makeup

لەماوەی پرۆسەی ڕێکخستن و یەکلاکردنەوەی بابەتە ڕۆژنامەگەرییەکاندا، لەوانەیە دەرهێنەر ناچار بێ بڕگەی چەند بابەتێکی هەواڵیی لابدات، ئەگەر لەکۆتایی چیرۆکە هەواڵییەکەشدا شتی کەم بایەخ بەدی کرا، دەرهێنەر بەبێ زیان گەیاندنی بە چیرۆکەکە دەتوانێ لایان بدات. دەرهێنەریش دەبێ هەستبکات کە ئازادە و تەنانەت

بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ نووسەرانی تردا دەتوانێ دوا برگەکانی بابەتە هەواڵییە ئاساییەکان لابدات.

## ٤-ئاسانکردنی دانانی ناونیشان
## To Facilitate Headline Writing

لەپێناوی بەخشینی بیرۆکەیەك سەبارەت بەناوەڕۆکی چیرۆکی هەواڵی، دەبێ ناونیشان وشە بنەڕەتییەکان (Key words) یان وشەی تری پێویستا بگرێتە خۆی، چیرۆکیش ئەگەر بەباشی نووسرا بێ، ئەو کاتە نووسەری ناونیشان بۆ دۆزینەوەی وشەی گونجاو تەنها پێویستی بەخوێندنەوەی یەك یان دوو برگە دەبێ.

چەند ساڵێك لەوەو پێش کۆمەڵەی نووسین، کە گەورە نووسەرانی ئاسۆشێتردپرێس دەگرێتە خۆی، بڕیاریدا ئەم هەواڵەی خوارەوە بەباشترین هەواڵ دابنرێ لەناو ئەو هەواڵانەدا کەلەو ساڵەدا بڵاوکراونەتەوە، هەواڵەکە بەپێی شێوازی هەرەمی هەڵگەراوە نووسراوە، لەداڕشتنی دووەمی هەمان هەواڵیشدا شێوازی بەدوایەکدا هاتنی کاتیی (Chronological Order) بەکارهێنراوە.

## شێوازی نووسین لەڕۆژنامەدا

جۆدێت ئان ڕۆبیرت، منداڵێکی خاوەن دووچاوی شین و تەمەن حەوت ساڵ و کچی پارێزەر و سەرکردەیەکی کرێکاری لەبالتیمۆرو ئەمڕۆ لەماڵی نەنکیدا رفێنراوە و دەسدرێژی کراوەتە سەر و تامردن لێی دراوە، پۆلیس لاشەی منداڵەکەی بەڕووتی دۆزیوەتەوە، بەشێوەیەکی توند و دڕندانە لێی دراوە و فرێدراوەتە دارستانێکی بچووك، ئەمە پێنج کاتژمێر پاش ئەوەی دایکی (خاتوو شیرلی ڕۆبرت) هەواڵی دیارنەمانی کچەکەی ڕاگەیاندووە.

بەهۆی شتێکی رەقەوە بەتوندی لەسەری منداڵەکە دراوە، پارچە قوماشێکی ئاوریشمیشی بەتوندی لە ملیەوە ئاڵێنراوە، لەدووری هەشت پێشەوە کراسی نووستنی لۆکەیی سپی و پڕ لەخاڵی سوورەکەی جۆدێت دۆزراوەتەوە.

جەستەی جۆدێت خەڵتانی خوێن و قوڕ بوو، ئەوەش مانای وایە لەپێناوی ڕزگارکردنی ژیانیدا ئازایانە بەرگری لەخۆی کردووە.

سەرچاوەکانی پۆلیس ڕایانگەیاند کە دەوروبەری کاتژمێر یەکی بەیانی بکوژ توانیویەتی دزە بکاتە ماڵی هاری ڕۆزنبێرگ و لەگیرفانی پانتۆڵەکەیدا کلیلی ئۆتۆمبێلەکەی دزیوە و منداڵەکەشی ڕفاندووە کەلە سالۆنی ماڵەکەدا لەسەر کەروێتەیەك نووستووە.

بەهۆی دەنگی ئۆتۆمبێلەوە، خاتوو رۆزنبێرگ بەئاگاهاتووە و بۆی دەرکەوتووە کەمنداڵەکە نەماوە و دەرگای دەرەوەی ماڵیش کراوەتەوە.

کاتژمێر یەك و دە خولەکی سەر لەبەیانی بانگی پۆلیس کراوە و دوای چوار کاتژمێر و دەخولەکیش پۆلیس لەشوێنێکی لماویی نزیك کەنداوی بسکاین ئۆتۆمبێلەکەی رۆزنبێرگی بەبەتاڵی دۆزیوەتەوە، وەك دیار بوو تایەکانی لەلمدا چەقیبوون و شۆفێرەکەش هەوڵی دەرهێنانی لەگەڵ دابوو، دواتر تەرمی جۆدێت لەشوێنێکی نزیك ئۆتۆمبیلەکە دۆزراوەتەوە.

## دارشتنی دووەم: شێوازی بەدوایەکدا هاتنی کاتیی

کاتژمێر یەکی سەرلەبەیانی ئەمڕۆ، خاتوو رۆزنبێرگ لەدەنگی ئۆتۆمبێلێك بەئاگاهاتووە کە بەخێرایی لەگەراجی ماڵەکەی دەرچووە ، بەپەلە ڕووی کردۆتە سالۆنەکەیان و بۆی دەرکەوتووە کەنەوەکەی: جۆدێت ئان رۆبریتی تەمەن حەوت ساڵ لەسەر کەروێتە کە نەماوە و دەرگای دەرەوەی ماڵەکەش کراوەتەوە.

خاتوو رۆزنبێرگ پەیوەندی بە کچەکەی خۆی (شیرلی رۆبرت)ی دایکی کچە ڕفێنراوەکە کە ژنی (شیرلی رۆبرت خێزانی سەرکردەیەکی کرێکاری و پارێزەرە لەبالتیمۆر)ەوە کردووە، ئەوکاتە مێردەکەی لەسەردانی دایك و باوکی دابووە.

کاتژمێر یەك و دەخولەکی بەیانی، خاتوو رۆبرتی دایکی منداڵە ڕفێنراوەکە هەواڵی ڕفاندنی کچەکەی بەپۆلیس ڕاگەیاندووە.

سەرچاوەکانی پۆلیس ڕایانگەیاند کە ڕفێنەر خۆی گەیاندۆتە ماڵی ناوبراو و توانیویەتی لەگیرفانی پانتۆڵی ڕۆزنبێرگدا کلیلی ئۆتۆمبێلەکەی بدزێ، پاشان منداڵەکەی بردووە و ڕایکردووە.

دوای چوارکاتژمێر و دەخولەك، پۆلیس ئۆتۆمبێلەکەی ڕۆزنبێرگی بەبەتاڵی لەشوێنێکی لماویی لەنزیك کەنداوی بسکایندا دۆزیوەتەوە، تایەکانی لەلمدا چەقیبوون و بەئاشکراش شوێن پێی شۆفێر بەدیدەکرا کەهەوڵی دەرهێنانەوەی دابوو.

لەنزیك شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکە و لەدارستانێکی بچووکدا تەرمی جۆدێت بەڕووتی دۆزرایەوە، لاشەکەی خەڵتانی خوێن و قوڕبوو بوو، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆئەوەی کە لەپێناوی ڕزگارکردنی ژیانیدا ئازایانە بەرگریکردووە، جۆدێتی خاوەن دووچاری شین، دەسدرێژی کراوەتە سەر و بەشتێکی ڕەقیش لێی دراوە، هەروەها پارچە قوماشێکی ئاوریشمیی بەتوندی لەمل پێچراوە و لەدووریی هەشت پێ لەتەرمەکەیەوە کراسی نووستنە لۆکەیی و سپی و پڕ لەخاڵی سووری جۆدێت دۆزراوەتەوە.

ڕاپۆرتی یەکگرتووی نووسەران ئاماژەی بەپێویستی تێبینیکردنی ((زۆر خاڵ و هێمای وردی وەك کراسی نووستنی لۆکەیی سپی و پڕ لەخاڵی سووررو کەلەدووری هەشت پێ لەتەرمەکە دۆزراوەتەوە) کردووە.

ژمـارەی کراسـەکانی نووسـتن چـەندە کەلـە و کراسـە دەکـەن .. هەشـت پێیەکـەش .. پێویسـت بەلێکدانـەوە و هەڵسـەنگاندنی ناکـات، چـونکە ڕۆژنامـەوان لەپێناوی تۆو لەجیاتی تۆش ئەو شتانەی دیوە.

هەمان شت سـەبارەت بەچـەند وردکارییـەکی دیکـەی وەك: دزەکردنـی بکـوژ بـۆ ماڵەکە لەکاتژمێریەکی بەیانی، و کاتژمێریەك و دەخولەکی سـەر لەبـەیانی بـەپۆلیس ڕاگەیەنراوە، دوای چوار کاتژمێر و دەخولەك ئۆتۆمبێلەکـە دۆزراوەتـەوە ... نـەوەك (( دواتـر ئۆتۆمبێلەکـە دۆزرایـەوە)). کـەم کـەس مشـتومڕ لەگـەڵ ئـەو پـەیامنێرەدا دەکەن کەناوی خۆی نەهێناوە و شارەزایی چـل سـاڵی تـەواوی هەیـە و یـەککگرتووی نووسەرانیش وتەکـەی گواستۆتەوە کـە تیایـدا وتوویـەتی (( نووسـینی ئـەم هەواڵـە باشترینی ئەو شێوازانەیە کەبەدرێژایی ژیانم خوێندومنەتەوە)).

ڕاپـۆرتی یـەککگرتووی نووسـەران ئامـاژە بـەوەش دەکـات کـەهێزی هەواڵەکـە لەبنەڕەتدا دەرەنجامی ئەوەیە کەکارێکی نووسـراوانەی نائاسـایی پـێش پرۆسـەی نووسینی هەواڵەکە کەوتووە.

بەواتایەکی تـر: لەپەیوەندیکردنـدا پلانـی گـرنگتر ئەوەیـە شـتێکت دەسـتبکەوێ کەشایستەی گواستنەوە و گەیاندن بێ. ڕاپۆرتی ناوبراو ئاماژەی بەڕاسـتیەکی دیکـە کردووە: ڕووومالکردنی هەمەلایـەن و قـووڵ و تـەواو ئـەو بناغەیەیـە کەڕۆژنامـەوانیی باشی لەسەر بونیات دەنرێ، هـەروەها ڕوونیشـی کردۆتـەوە کەبـەکارهێنانی وشـە و ڕسته و برگە کورتەکان ( سەرەڕای ئـەو ئاشـکراییەی کەلەوانەیـە بـەدیبهێنن) بـەلام نـاتوانن لـەخۆڕا درێـژە دادڕی و زیـادوتن بـەڕاپۆرتی ڕۆژنامـەوانیی ببەخشـن، هـیچ ئەلتەرناتیڤێکیش لەڕووماڵکردنی هەواڵیی گونجاو تر نییە، ئینجا شـێوازی نووسـینی بەکارهێنراو هەرچۆنێك بێ.

## سێیەم : پێشەکی The Lead

هەواڵی پێشوو بەپێی شێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوەی تەقلیدیی نووسرابوو، ئەو شێوازەی دەخوازێ تەواوی ناوەڕۆکی چیرۆکەکە لەبڕگەی یەکەمدا بەکەمترین ژمارەی وشە بخرێتە ڕوو، برگەداهاتووەکانیش چارەسەری لایەنە جۆراوجۆرەکانی پێشەکی دەکەن دیارتر و ئاشکراتریان دەکەن، یان درێژەی زیاتر دەخەنە ڕوو کەپەیامنێر پێی وایە گرنگن، بەوپێیەش کەزیاتر لە نیو سەدەیە ئەمە تاکە شێوازی نووسینی هەواڵ بووە، بۆیە پێشەکی هەواڵ بەبڕگەی یەکەم دەناسرێ کە هەموو ڕەگەزە (شەش پرسیارەکە) پێویستەکان لەپێناوی دیدەنیکردنی تەواوی ڕووداوە بنەڕەنیەکاندا، دەگرێتە خۆی.

کارێکی لەو جۆرەش بووەمایەی دۆزینەوەی برگەی سەرەتایی دوورودرێژ و چڕوپڕ، دەکرێ بەم جۆرەی خوارەوە پێشەکییەك بۆ ئەو هەواڵە دانبرێ کەلە پێشەوە باسمان لێوەکرد:

تەرمی ڕووت و بەتوندی لێدراوی جۆدێت رۆبرتی خاوەنی دووچاوی شین و تەمەن حەوت ساڵ و کچی پارێزەر و سەرکردەیەکی کرێکاری لەبالتیمۆرو لەنێو دارستانێکی بچووك لەنزیك کەنداوی بسکاین، کاتژمێریەکی بەرەبەیانی ئەمڕۆ لەلایەن پۆلیسەو دۆزرایەوە، دوای ئەوەی لەماڵی نەنك و باپیریەوە ڕفێنرابوو، دەسدرێژی کراوتەسەر. لەپێناوی خۆدوورخستنەوەش لەوبڕە زۆرەی ڕووداو و زانیارییەکان

لەبڕگەی پێشەکیدا و بەمەبەستی زیادکردنی توانای هەواڵ بۆ خوێنەران، هەندێك ڕۆژنامە شێوازێکی تەواو پێچەوانەیان بەکارهێناکە دەوەستێتە سەر بناغەی بەکارهێنانی ڕێسای (( ئەو ڕستەیەی یەك ڕووداو دەگرێتە خۆی))و، دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە ببێتە مایەی نووسینی پێشەکی بۆ هەواڵی پێشوو: کچێکی تەمەن حەوت ساڵ ڕفێنرا و دەستدرێژی کرایە سەر و لێیدرا.

ئە کچە جۆدێت ڕۆبرتی خاوەن دووچاوی شینە لەبالتیمۆر، باوکی پارێزەرو سەرکردەیەکی کرێکارییە، پۆلیس تەرمی کچەکەی لەدارستانێکی بچووك ، لەنزیك کەنداوی بسکاین دۆزیوتەوە، تەرمەکەی ڕووت بووە و بەشێوەیەکی دڕندانەش لێی درابوە.

کاتژمێر یەك و دەخولەکی بەرەبەیان دایکی منداڵەکە (شیرلی ڕۆبرت) پۆلیسی لەدیارنەمانی کچەکەی ئاگادارکردۆتەوە، ئەمەش چوار کاتژمێر و دەخولەك لەدۆزینەوەی تەرمەکە لەلایەن پۆلیسەوە بووە.

ئاستەمە بتوانی لەهەواڵێکی لەو جۆرەدا بەوردی ژمارەی ئەو بڕگانە دیاریبکەیت کەیەك ڕستە دەگرنە خۆیان و پێشەکی یان یەکەی یەکەمی هەواڵ پێکدەهێنن. هەموو ڕستەیەك لەڕووی هزرییەوە بەوشە یان ڕووداوێکەوە دەبەسترێتەوە لەو ڕستەیەدا کەلەپێشییەوە دێت و پێویستی بەنیو دەرزەن و زیاتر هەیە بۆ خستنەڕووی هەموو ئەو زانیارییانەی پێشتر لەنیوەی ئەو قەبارەیە و کەمتریدا کۆدەکرانەوە. ئەگەرچیش ئەو شێوازە نووسینە کەمتر دەڵێ و بەوشەی زیاتر بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێبینی دەکرێ کەلەخوێنەران نزیکترە. داڕشتەی ڕەسەنی هەواڵی پێشوو بریتی بوو لە ڕێگەچارەیەکی مامناوەندی لەنێوان هەردوو شێوازە کۆن و نوێیەکەدا.

بەوپێیەش کەشێوازی هەرەمی هەڵگەراوە تائێستاکاری پێدەکرێ، تەنانەت لەشێوازی بڕگە بڕاوەکانیشدا، وەك ئەوەی لەهەولای پێشوودا بەدیمان کردوتیایدا ڕووداوەکان بەپێی بایەخ و گرنگیان ڕێکخرابوون، بۆیە دەکرێ (پێناسەی) تەقلیدی

پێشەكی هەواڵ بەم جۆرە دیاریكرێ: پێشەكی هەواڵ ئەو یەكە سەرەتاییەیە كە ئەركی هەموو هەواڵەكە بەلاَم بەشێوەیەكی كورت جێبەجێدەكات.

**پێشەكییەكی باش، هەرچەندە فشاریشی خرابێتە سەر، دەبێ ئەم سیفەت و بنەمایانەی خوارەوەی تێدابەدیبكرێ: -**

١- وەلامی هەموو ئەو پرسیارانە بگرێتە خۆی كەخوێنەر لەكاتی گوێگرتن بۆ گفتوگۆیەك بیەوێ بەدەستی بكەوێ، ئەمەش ئەوەی خوارەوە دەگرێتەوە:

هۆكار و دەرەنجام (چۆن و لەبەرچی و چی) و (كێ و لەكوێو كەی)، ئەم رەگەزانە بەشەش پرسیارەكە ناو دەبرێن و پێویستا نییە لەهەر پێشەكیەكدا هەموویان بخرێنە روو بەلاَم نابێ تیایاندا هیچ رەگەزێكی گرنگ لابدرێ (بروانە بەشی چوارەم).

٢- سیفەتی سەرەكیی و گرنگی هەواڵ (ئەگەر هەبێ) دەربخرێ، (بروانە بەشی پێنجەم).

٣- سەرنجی خوێنەر رابكێشێت وای لێبكایت پاشماوەی هەواڵەكە بخوێنێتەوە، (بروانە بەشی شەشەم).

٤- پابەندبێت بەرێساكانی نووسینی هەواڵیی باش، (بروانە بەشی حەوتەم).

٥- ئاماژە بەسەرچاوەی هەواڵ بكات یان ئاشكرای بكات، (بروانە بەشی هەشتەم).

٦- ئەو کەسانە دیاریبکات کەلەهەواڵەکەدا ناوین هاتووە یان باس لەو پەیوەندییانە بکات کەبەهەواڵی پێشووترەوە دەیانبەستێتەوە. (بڕوانە بەشی نۆیەم).

## هەواڵەکەی پێشوو (سەبارەت بەڕفاندنی منداڵەکە) تەواوی ئەو مەرج و پێداویستیانەی خوارەوەی بەدیهێناوە:

- کێ : جۆدێت ئان رۆبرت.
- چی : کوژراوە.
- کەی: ٧ی تەمووز - مێژووی ئەمڕۆ (یەکی بەیانی) دواتر پێش خرا.
- لەکوێ: مەیامی ماڵەکەیان، دارستانی نزیك کەنداوی بسکاین.
- چۆن: ڕفێنرا و دەسدرێژی کرایەسەر و تامردن لێی درا.
- سەرچاوە: پۆلیس و کەسوکار، سەرچاوەی ئاشکرای زانیارییەکانن.
- دیاریکردنی ناسنامە: منداڵێك تەمەنی حەوت ساڵە، کچی پارێزەر و سەرکردەیەکی کرێکارییە لەبالتیمۆر.
- سیفەتی بەرچاو: لەماڵی نەنك و باپیری ڕفێنراوە.

## چوارەم: بۆدی The Body

لەمیانەی کۆششکردن بۆ کورتکردنەوەی ڕستەی یەکەم لەهەواڵدا، بەجۆرێك وای لێ بکرێ کەمترین ژمارەی وشە بگرێتە خۆی، ئەرکی بنەڕەتی بۆتە هی ڕستە و ئەو برگانەی ڕاستەوخۆ لەدوای ڕستەی یەکەمەوە دێن، ئەرکەکەش بریتیە لەڕوونکردنەوە و درێژەپێدانی ئەو ڕووداو و ڕاستیانەی کەلە ڕستەی یەکەمدا هاتوون سستی نواندنیشی لەجێبەجێکردنی ڕێسای (پێشەکی دەبێ وەلامی شەش پرسیارەکە بگرێتە خۆی) بووەمایەی ئەوەی برگەداهاتووەکان بەزۆری چەند ڕووداوێکی پەیوەند بەبابەتەکەوە بگرنە خۆیان و دواتریش بەپاساوی کورتکردنەوە لەپێشەکی دوورخرانەوە.

ئەو ناوە ئەکادیمیانە گرنگنین کەلەبەشەکانی هەواڵ دەنرێن، هەروەها بەبێ تێکهەڵچوونی یەکە جۆراوجۆرەکانی، مەحاڵە بتوانرێ پلانێك بۆهەواڵ دابنرێ، ئەگەر مەبەستیش بێ دەتوانیت ئەو هەواڵە توندڕەوە لە نووسینی کورتی وەك (( کچێکی تەمەن حەوت ساڵ ڕفێنرا و دەسدرێژی کرایە سەر و تامردن لێی درا) دا بەپێشکی ناوزەد بکەیت و ئەوەش کەلە هەواڵەکە دەمێنێتەوە بەناوە تەقلیدیەکەی خۆیەوە بە(بۆدی) ناوی ببەیت، جگە لەمە دەتوانیت سووربی لەسەرئەوەی لەوانەیە پێشەکی ژمارەیەك ڕستەی پێویستا بگرێتەخۆ بۆ دیاریکردنی ڕەگەزە سەرەکییەکان (شەشە پرسیارەکە).

لەهەردوو حاڵەتیشدا، بەزۆری ژمارەیەك برگەی زیاد دەمێننەوە کەدەکرێ (بۆدی) یان بە (بەشی دووەمی بۆدی) ناوببرێن. ئەگەر درێژەی تازەش بۆهەمان رستە و برگە زیاد بکرێ، بەمەرجێك ببنەهۆی بەرفراوانکردنی پێشەکی، ئەو کاتە بەوردی دەستنیشانکردنی سەرەتای یەکەی کۆتایی هەواڵ دەبێتە مەسەلەیەکی زەحمەت.

## ١- شێوازی لولپێچی Sprialing

لەوانەیە شێوازی لولپێچیی کەبەشێکی فراوان لەلوتکە دەگرێتە خۆی، لەشێوازی هەرەمی هەڵگەڕاوە زیاتر لەو ڕێگەیە بچێت کەتیایدا چیرۆکی هەواڵیی هاوچەرخ و باش نووسراو ئاشکرا دەبێو دەردەکەوێ، ئینجا چ لەڕێگەی ئاماژەیەکی پێگەیی دیاریکراوەوە بێ یان لەمیانەی پەیوەندییەکی هزریەوە کەتیایدا هەر برگەیەکی داهاتو بەباشی نووسرابێتەوە و لەبرگەی پێش خۆشیەوە هەڵقوڵابێ. لەنموونەی داهاتوودا تێبینی بکە چۆن هەمو برگەیەکی داهاتوو بەشێوەیەکی وردتر برگەکانی پێش خۆیان دەستنیشان دەکەن (ئەو وشانەی هێڵیان بەژێردا کێشراوە)، جگە لەوە هەندێك زانیارییی دیکەش دەگرنە خۆیان:

ئارۆن ل. ئەنگستراد، کەبەم دواییانە بۆ بەرژەوەندی شارکۆتایی بەتوێژینەوەیەك دەربارەی خزمەتگوزاریە مەدەنییەکان هێناوە، لەسەرەتای مانگی تەمووزدا لەبەڕێوەبەرایەتی شاردا کارێکی هەمیشەیی دەستدەکەوێ، ناوبراو دەبێتە ڕاوێژکاری لیژنەی خزمەتگوزارییەکانی شار کە دەسەڵاتی دانانی ئەو ڕاسپاردانەی هەیە کە دەخرێنە خانەی جێبەجێکردنەوە، ڕاسپاردەکان لەپرۆسەی هەڵبژاردنی کارمەندانی شار و باشکردنی پەیوەندی نێوان کارمەنداندا (پشکنینی واقیعیانەتر) دەگرنە خۆ، ئەمڕۆ جۆن س. کریستۆفەری سەرۆکی ئەنجومەنی شار هەواڵیی ئەو دامەزراندنەی ڕاگەیاند و وتی:

یەکێك لەئەرکە سەرەتاییەکانی ئەنگستراد ئەوەیە کە بەڕێوەبەرێك بۆ ئەوانە دابمەزرێنێ کەلەشاردا کاردەکەن، ئەنگسترادی بەناوبانگ لەبواری بەڕێوەبردن و خزمەتگوزارییەکانی شاردا پایەی بەڕێوەبەری کاروباری کرێکارانی ڕەتکردبووەوە کەبەم دواییانە خرابووە بەردەمی.

## ٢- یەکێتی Unity

ڕێگەی کارپێکراو بۆ هێنانەدی یەکێتی شێوازیی (اسلوبی) هەواڵ، لەکاتێکدا برگەکانی هەمەجۆر دەبن و بەدوای یەکدادێن، دەوەستێتە سەر بناغەی بەکارهێنانی وشەو ئامارەکانی پێکگەیاندن، بڕوانە لەنموونەی خوارەوەدا چۆن زیرەکانە بەکارهێنانی ئامڕازەکانی پێکگەیاندن بۆتە هۆی خولقاندنی زۆریی و هەڵڕژان، هاوکات چۆن وای لەنووسەر کردووە ڕاستیی نوێ پێشکەش بکات. ئەو هەواڵە دەکرێ لەکۆتایی هەر برگەیەکدا ببڕدرێ بەڵام سەرەڕای ئەوەش یەکەی شێوازیی تەواوی خۆی دەپارێزێ.

### لەئاسۆشێتد پرێسەوە

لەکۆتایی هەڵچوونەکانی زستاندا، ڕووبارە بەهێزەکان چەند بەشێکی ناوەڕاستی ئالاباماى باشوور و جۆرجیا و میسیسیپییان داپۆشیوە و بەدوای خۆشیاندا زەرەروزیانێکی زۆریان بەجێ هێشتووە کەبەملیۆنەها دۆلار مەزەندە دەکرێ.

بێجگە لەناوچەکانی دەوروبەری (جاکسۆن ومایس)یش، ڕووبارە هەڵڕژاوەکان دەشتە کشتوکاڵیەکانیان داپۆشیوە و ڕوویانکرۆدتە خاڵی هاوبەشی پاککردنەوەیان کەکەنداوی مەکسیکە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا مەترسی لافاوی زیاتر هەڕەشە لەدانیشتوانی ویلایەتە نزم و تەنانەت مامناوەندییەکانیش دەکات ... دەبێ چەند

ڕۆژێکی دیکە چاوەڕوان بکەین تا ڕووبارە هەڵچووەکان دەگەڕێنەوە ڕێڕەوە سروشتیەکانی خۆیان.

## ئالاباما لەلووتکەدایە

بۆنموونە، ئێوارەی سێ شەممە، ئاستی لافاوی ڕووباڕی ئالاباما لە(سالمی)ی ناوەڕاستی ئالابامادا، گەیشتە ٥٨,٣ پێ ، بەڵام چاوەڕێ ناکرێ تا ٩ی ئادار ئاستی بەرزبوونەوەی ئاوی لافاو بۆ — ٤٥ پێ — دابەزێتەوە.

لەهەریەکە لە (سالمی) کە گەورەترین زیانی بەرکەوتووە، هەروەها مۆنتگمری و دیمۆپۆلیس و ئالادا، دروست وەك بارودۆخی جاکسۆن و میس و ناوچەی خۆرئاواو کۆلۆمبس و گادا، هەزاران کەس کەلەبنەکەکانی پێشوازیکردنی پەنابەراندا کۆبوویوونەوە پێیان وایە کەدەبێ چەند ڕۆژێکی دیکە چاوەڕێ بکەن تائەو ئاوەی ماڵەکانیانی داپۆشیوە دەچێتەوە ئاستی ئاسایی خۆی.

لەپێناوی سووککردنی دڵەڕاوکی و نائارامیش لە نێو پەنابەرانی مۆنتگمریدا، کەهەندێکیان شەوی پێنجەمیان لەپەناگەکاندا بەسەردەبەن، خاچی سوور چەند بەرنامەیەکی کات بەسەربردنی بۆ ئامادەکردوون، بەپێی لێکدانەوەی سەرەتاییەکانیش، ئەو زیانانەی بەرشوێنە گشتییەکان کەوتوون، ئێستا گەیشتۆتە دە ملیۆن دۆلار، ئەمە تەنیا ئەو زیانانە دەگرێتەوە کەبەر ڕێگاوبان و پرد و شوێنەکانی سەریەشارەوانی کەوتوون و پەیوەندیان بەو زیانانەوە نییە کە بەماڵ و کارگە و کێڵگەکان گەیشتوون.

## نغرۆبوونی ڕانەمەڕێك

لەناوەڕاستی ئالابامادا، دروست لەهەردووکەرتی مۆنتگمری و ئیلمۆردا، ئاژەڵ بەخێوکەرێك ڕایگەیاند کەڕانەمەڕێکی ٢٥٠٠ سەری کەنرخەکەی بەنێو ملیۆن دۆلار دەخەملێنرێ، لەمیانەی ئەو لافاوەدا نغرۆ بووە.

هاوکات لەگەڵ شۆڕبوونەوی ئاوی ڕوباری (سولن بیرل) بەرەو ناوچەی جاکسۆن و میسدا لە ڕۆژی سێ شەممە و چوارشەممەو گەیشتنی بۆ قووڵایی سێ میل لەهەندێك ناوچەدا، ٨٧٠کەس لەدانیشتوانی ئەو ناوچانە ناچار بوون ماڵەکانی خۆیان جێبهێڵن و لەبنکەکانی پەنابەراندا کۆببنەوە.

Tampa Tribune

## ٣- کەرتکردن بۆ برگەی سەربەخۆ Block paragraphing

لەچیرۆکە هەواڵییە دووردرێژەکاندا و بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئاخۆ پێشەکییەکەی لەیەك برگە یان لەچەند برگەیەکی درێژ پێکهاتووە، یاخود ڕاستەوخۆ یان لوول پێچین، دەبێ ئەو برگانە بەجۆرێك بنووسرێن کەهەریەکەیان بابەت (بیرۆکە)یەکی لاوەکی بگرنە خۆیان.

ئەو جۆرە برگەیکردنە جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە خوێندکارانی ئەدەبی ئینگلیزی فێری بوون، بەڵکو باشترە، چونکە برگەکانی ڕۆژنامە (لەبەرگرنگیی شێوازیی دەرەوە)، دەبێ کورت بن، کەواتە پابەندنین بەپەیڕەوەی شێوازی – دەرەکیی توند، کەدەخوازێ هەموو برگە (یان بابەتێك) بیرۆکەیەکی تەواو بگرێتە خۆ، لەوەش زیاتر دەکرێ بوترێ پرۆسەی بەبرگەکردن لەڕۆژنامەدا دەبێتە هۆی پارچە پارچەکردنی یەکێتی بیرەکە بۆ چەند بیرۆکە (یان بابەت)ێکی لاوەکی بەواتایەکی تر نووسەرانی هەواڵ برگەکانیان برگە برگە دەکەن.

ئەو جۆرە برگەیی کردنەش (paragraphing) ئەوەیە کەبەبرگەیی کردنی سەربەخۆ ناودەبرێ، لەنووسینی هەواڵەکانیشدا سوودێکی زۆری هەیە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا ڕێگە بەزیادکردن و لادانی چەندین برگە دەدات بەبێ ئەوەی هیچ پشێوی یان شێواندێك لەچیرۆکی هەواڵیدا ڕووبدات. هەندێك جار لەژێر ڕۆشنایی گەیشتنی زانیاریی تازەدا و بەمەبەستی زیاد و کەمکردنی برگەی دیکە، بەپێویست دەزانرێ

سەرلەنوێ چەند برگەیەکی دیاریکراو دابڕێژرێتەوە، بۆ نموونە، لەنموونەی داهاتوودا تێبینی چۆنیەتی زیادکردنی زانیاریی تازە بکە بەبێ ڕوودانی هیچ کێشەکی جیدی.

ئەو برگانەی هێڵیان بەژێردا کێشراوە، دوای نووسینی هەواڵ زیادکراون، لەوەش زیاتر ، دەکرێ هەندێکیان لەشوێنی تری چیرۆکی هەواڵیدا زیادبکرێن. ژمارەیەك برگەی ئاساییش هەن یان ئەوانەی هێڵیان بەژێردا کێشراوە، دەکرێ لەناو هەواڵدا شوێنیان بگۆڕدرێ بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی تێکدان یان لاوازکردنی کاریگەریی هەواڵەکە، لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا ئەو زیادکردنانە لەلایەن نووسەری جۆراوجۆرەوە ئەنجام دەدرێ.

((دوێنێ ئاگر بەربوویە ئامێرێکی هارێنی دانەوێڵە لەخانوی ژمارە ٧٠٠، لەشەقامی وێست جیرۆمی ڕۆژئاوای فۆرت ئەلستۆندا و ، بووە هۆی وێرانکردنی ٣٥ ئامێری تایبەت بەئاگر کوژاندنەوە بۆماوەی ٣ کاتژمێر ڕووبەڕووی گڕی ئاگرەکە بوونەتەو لە کۆمپانیای نۆرس مانیفکشرنگ کۆمپانییدا. زیانەکان بە ٢٢٥هەزار دۆلار خەمڵێنراون. خانووەکەکە لە پارچەی دارو ئاسن دروستکرابوو توانیویەتی تا کاتژمێر یەکی بەرەبەیان خۆی ڕابگرێ، بەڵام پاتریك ئۆهارای گەورە ئەندازیاری بەڕێوەبەرایەتی ئاگر کوژێنەوە ڕایگەیاند کە پەیکەری باڵەخانەکە بەتەواوی سووتاوە.

یەکێك لەپیاوانی ئاگر کوژێنەوە بەهۆی بزمارێکەوە بەسووکی بریندار بووە، بەڵام هەرلەوێ چارەسەرکراو گەڕایەوە سەرکاری خۆی، تائێستاش باس لەوە نەکراوە کەکەسێکی تر دووچاری هیچ ئازارێك بووبێتەوە.

ئاگرەکە کاتژمێر نۆ و پەنجا خولەك لەلایەن (والدۆ ئۆزنایك)ەوە ئاشکرا کراوە، ناوبراو دانیشتووی باڵەخانەی ژمارە ٢٧٠٠ ی شەقامی هازل ئەفینۆیە و لەگەڵ منداڵەکانیدا لەشەقامی جیرمی ئەفینۆدا بەرەو شەقامی هۆرل بێرد ڕۆیشتووە.

ئۆزنایك هەواڵەکەی بەئیمرسۆن هودناتی پیاوی ئاگرکوژێنەوە ڕاگەیاندووە و شوێنەکەشی بە یەکەم ئۆتۆمبێلی ئاگر کوژێنەوە نیشانداوە.

لەپێناوی ڕێکخستنی هاتوچۆی ناوچەکەشدا، فەرمانگەی پۆلیس ١٦ ماتۆڕسکیل و دوو ئۆتۆمبێلی بەئامێری بێ تەلەوە ناردووە، بەمەبەستی پێکشەشکردنی پشتگیری و ئابلۆقەدانی ئاگرەکەش، تیمێکی دیکە لەپیاوانی ئاگرکوژاندنەوە بەپەلە ڕوویان کردۆتە باڵەخانەی بەرامبەر لەشەقامی جیرمی ئەفینۆ.

((موت –Mott) ی سەرۆکی تیمی ئاگرکوژاندنەوە و پیاوەکانی چواردەورەی ئامێرە سووتاوەکەیانداوە کەبەرزاییەکەی پێنج نهۆمە، (موت) بەپیاوانی خۆی ڕاگەیاندووە کە بۆ ڕێگەگرتن لەبڵاوبوونەوەی ئاگر و بەرتەسککردنەوەی سنوورەکانی، لوولەی ئاوەکانیان ئاڕاستەی باڵەخانەکە بکەن.

گڕی ئاگر لەسێ ئۆتۆمبیلی ئاگرکوژانەوە نزیکبۆتەوە بەڵام هیچ زەرەرێکی پێ نەگەیاندوون، پیاوانی ئاگرکوژاندنەوە دەستیانکردووە بە ئاوپرژێنکردنی دیواری باڵەخانەکانی دەوروبەری بۆ ڕێگەگرتن لەبڵاوبوونەوەی ئاگرەکە)).

## ٤- بابەتەکان Themes

دەکرێ هەندێك چیرۆکی هەواڵیی دەربارەی بابەتێکی (مەسەلە –Theme) ناوەندی کەبەتەواویش ڕوونەکرابێتەوە، بنووسرێ. چیرۆکە هەواڵیی داهاتوو، بۆ ڕوونکردنەوەی گرنگیی ئەو هەواڵانە نووسراوە کە لەلایەن جەماوەروە بایەخیان هەیە، ئەو ئامانجەش لەمیانەی برگە بەدوایەکدا هاتووەکانەوە بەدیهێنراوە کەبەدەوری لایەنە جۆراو جۆرەکانی چیرۆکە هەواڵیەکەدا دەخولێتەوە.

(( دوێنێ ج.ر.ماکدۆنالدی سەرۆکی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی (جەنەڕال کابل کورپریشن) ڕایگەیاند کە کارگەی تامبا بەمەبەستی ناردنە دەرەوە، نیازی وایە داواکارییەك بەبڕی ٤,٨ملیۆن دۆلار ، تەلی تەلەفۆن بەرهەم بهێنێ، ماکدۆنالد پێی وایە ئەمە گەورەترین داواکارییە کە بەمەبەستی ناردنەوە دەرەوە لەفلۆریدا بەرهەم

بهێنرێ و ئەمەش بەبەڵگەیەك دەزانێ بۆئەوەی لەبواری بازرگانیی دەرەكیدا، فلۆریدا دەبێتە ویلایەتێك كەئەركی جیدی جێبەجێدەكات.

## زیادەیەك بۆ سەر لیستی مووچە

جێبەجێكردنی ئەو داواكارییە مانای بەكارهێنانی ۱۲۰ كرێكاری زیادەیە، ئەوانە بۆماوەی ساڵێك لەو كارگەیەدا كاردەكەن كەكەوتۆتە شەقامی (قەشە ئان)، جگە لەوە ئامێری تازە لەكارگەی تامبا دەبەسترێن و ژمارەیەك كرێكاری تازەش بەكاردەهێنرێنو ڕادەهێنرێن.

هەموو كەلوپەلی پێویست بۆ جێبەجێكردنی داواكارییەكە لەڕێگەی بەندەرەكەیەوە دەگەنە تامبا، هەروەها بەرهەمی ئامادەش لەڕێگەی هەمان بەندەرەوە باردەكرێ.

بەڕێز ماكدۆنالد جەختی لەسەر ئەوە كردەوە كەجۆری كرێكارە تەڕدەستەكان لەكارگەی تامباو كەمیی خەرجیەكانی بەرهەم لێرە، ئەو هۆكارانە بوون كەبوونە هۆی سەرنەكەوتنی تامبا لەململانێكەدا.

بەمەبەستی جێبەجێكردنی داواكارییەكە، كارگەی ناوبراو بڕێكی زۆری تەلی تەلەفۆن بەرهەمدێنێ، بەجۆرێك ئەگەر بەدەورەی زەویدا ڕابكێشرێ، بەشی ئەوە دەبێ دەجار سووڕ بخواتەوە.

هەریەكە لە (جەنەراڵ كابل) و (ئۆتۆماتیك كوربوریشن ئینتەرناشناڵ) كەپشتگیریی تەواو لە (جەنەراڵ میكفۆن ئەندئەلیكترۆنیك كوربوریشن)ەوە وەردەگرێ، بەشێوەیەكی هاویەش گفتوگۆیان دەربارەی داواكاریەكە ئەنجامدا.

Tampa Tribune

## ٥- بەدوایەکدا هاتنی کاتیی Chronological

ئەمە ڕێگەیەکی بەرفراوانی دیکەیە بۆ ڕێکخستنی ئەو مادەیەی کەلەدوای پێشەکی دێت، بەلای کەم بۆ ژمارەیەك لەو بڕگانەی کەدەکرێ چەند ڕاستیەکی تازە (بەپێی شێوازی بڕگە سەربەخۆکان) یان ژمارەیەك بڕگە زیادبکرێن، ئەو جۆرە ڕێکخستنەش لەچیرۆکە هەواڵییەکاندا زۆر کاریگەرە، بەتایبەتیش ئەوانەی کەتیایاندا ڕووداو بەو جۆرە پێشکەشدەکرێ کە نموونەی خوارەوە ڕوونی دەکاتەوە:

دوێنێ دزێك هەڵیکوتایە سەر لقی دەزگای ئیستوود کەتایبەتە بە دابینکردن و قەرزدان و دەوروبەری ٧ هەزار دۆلاری دزی، ئەمە لەکاتێککدا ڕوویداوە کەدەیان کڕیار لەکاتی نیوەڕۆدا بەو باڵەخانەیەدا سووڕانەتەوە کەدەکەوێتە ١٨ – جیفری ستریت.

دزەکە کاتژمێر ١٢,٤٥دەقیقە چۆتە ژوورەوە کە گەرمەی کارکردن بووە، لەوکاتەشدا نووسینگەکە چۆڵ بووە، خاتوو ڤرجینیا کول کەیەکێك بووە لەوچوار کرێکارەی کەلە نووسینگەکەدا کاردەکەن لەو پیاوەی پرسیوە ئاخۆ دەتوانێ یارمەتی بدات.

ئەویش بەم جۆرە وەڵامی داوەتەوە:

(( بەڵێ دەتوانی یارمەتییەکی زۆرم بدەیت))، لەو کاتەشدا پیاوەکە لەسەر مێزێك وەستاوە کەبەرزاییەکەی چوار پێ بووە و دەمانچەیەکی تۆزاوی و کۆنی بەدەستەوە بووە.

دواتر دزەکە هاواری کردووە:

((بگەڕێنە دواوە .. بگەڕێنەوەدواوە.، گێل نیم و یەکەمجار تەقە لە خانمەکە دەکەم، لەزەنگی ئاگادارکردنەوە نزیکنەکەونەوە)).

جۆزیف و یرکزی جێگری سەرۆك وتی ئەو لەکۆتایی نووسینگەکەدا دانیشتووە و نەجووڵاوە، چاوەڕێی کردووە کەبزانێ پیاوەکە دواتر چی دەکات.

کابرای دز لەسەر مێزەکە هاتۆتە خوارەوە و خۆی فڕێداوەتە دوای پەنجەرەی پارە وەرگرتن و داواشی لەهەر چوار کارمەندەکە کردووە کەلە ژووری دواوە کۆببنەوە، هوار جاکوبی کۆکەرەوە (الخازن) و رۆبرت ئیڤانزی خەرجکەر (الصراف) یشیان لەگەڵدا بوون.

کاتێکیش کەدزەکە خەریکی کۆکردنەوەی کارمەندان بووە لە دواوەی ژوورەکەدا، یەکێکی تر بەناوی والتەر ماتیر (٢١٣٠ – شەقامی ئونیس ئەڤینو)، هاتۆتە ژوورەوە، داوای لەمیش کردووە کەلەگەڵ ئەوانی تردا ڕوویکاتە ژوورەکەی دواوە.

دزەکە دەرگای ژووری لەسەر داخستوون، پاشان دیسان گەڕاوەتە پێشەوەی نووسینگەکە و ئەو بڕە پارەی دزیوە کەلەناو سێ چەکمەجەکەدا بوون.

کاتێك ئیڤانزی خەرجکەر (اصراف) گوێبیستی داخرانی دەرگای دەرەوە بووە لەژووری دواوە ڕووەو دەرگای دەرەوە چووە بۆئەوەی بزانێ دزەکە کام ڕێگەیەی گرتۆتە بەر، وەك دەرکەوت پیاوەکە بەخێرایی لەنێو هاتوچۆکەراندا وون بووە، بۆیە ئیڤانز نەیتوانی بیبینێ.

جۆزیف ویکز گوتی: خەملاندنە سەرەتاییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەئەو بڕە پارەیەی کابرا دزیویەتی ٦٨٢٩ دۆلار بێ، بەڵام ئەو پێی وایە کەدوا لێکدانەوە ئەوە دووپاتدەکاتەوە کەپارەی دزراوە لەوە زیاترە و لەوانەیە خۆی لە ٨٥٠٠دۆلار دابێ.

جێگری سەرۆکی نووسینگەکە وای بۆ دەچێ کەدزەکە کەسێکی پرۆفیشناڵ نەبووە و بەختیش یاوەری بووە، ئاماژەشی بەوە دا لەدزی پرۆفیشناڵ و خاوەن ئەزموون لەوانە بوو بۆماوەی چەند ڕۆژێك چاودێری نووسینگەکەی بکردایە، لەو ماوەشدا تێبینی دەکرد کە گەرمەی کار و لوتکەی قەرەباڵغی نووسینگەکە لەنێوان کاتژمێر ١٢,١٥ و ١,١٥ دەقیقەدا دەبێ، واتە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ کەزۆرکەس دەیقۆزنەوە و تیایدا ڕوو لەنووسینگەکە دەکەن.

ویکز ئەوەشی گوت کەچەکدارەکە کەسێکی وەرزشەوان بووە و لەشێوازی جموجۆڵیدا لەنێو نوسینگەکەدا ئەمەی بەدیکردووە، هەروەها گوتی: دزەکە لەسەرەتای سالانی بیستی تەمەنیدا بووە و درێژی نزیکەی (٥) پێ و شەش ئینج بووە، کێشەکەشی دەوروبەری ١٤٠ پاوەند بووە و سەرپۆشێکی شینی پۆشیوەو کراسێکی سەوز و پانتۆڵێکی خاکیشی لەبەردابووە.

ئەوەی دەبێ لێیدووربکەوینەوە ئەوەیە کەپێشەکی تەنیابکرێ بە ((قولاب یان ڕستەیەك بۆ هەڵواسین یاخود وشککردنەوەی جل و بەرگ))، بۆ نموونە پێشەکیەکی وەك : ((جۆن ف . جیتزی ئەندامی ئەنجوومەنی تەشریعی شار ئەمڕۆ ڕایگەیاند کەهنری بروزی سەرۆکی شارەوانی درۆزنە))، باشترە لەوەی بڵێین ((ئەندامێکی ئەنجوومەنی یاسادانانی شار سەرۆکی شارەوانیی بەدرۆزن وەسف دەکات))، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو پێشەکیەیی خوارەوە لاوازترە کەدەڵێ :

((ئەمڕۆ جۆن ف . جیتزی ئەندامی ئەنجوومەنی یاسادانان شار هنری ر. بروزی سەرۆکی شارەوانی بەدرۆزن تۆمەتبار کرد، کاتێك ڕایگەیاند کەلەناوچەی ڕۆژئاوادا هیچ مولکێکی نەبووە)). ئەگەر ڕووشیدا بەهۆی هەڵەیەکی گەورەوە ڕستەی پێشەکی بەتەنیا دەرکەوت، ئەوکاتە لەوانەیە ببێتە مایەی ئیحراجبوون و زیاتریش. بەواتایەکی دیکە، لەکاتی کورتکردنەوەدا سنوورێك هەیە و واباشە نەبەزێنرێ، لە زۆربەی کاتەکانیشدا کورتکردنەوە ناڕاشکرایی و دیارنەکردنی ورد دەسەپێنێ، ئەمەش ماندووبوونی زیاتر دەخاتە سەر ئەو خوێنەرەی کەلە چیرۆکی هەواڵیدا بەدوای ڕووداوو ڕاستییەکاندا دەگەڕێ.

## پێنجەم : تێبینییەکانی پەیامنێر The Notes

مەرجی پێویست و بنەڕەتیی بۆ ڕێکخستن و گردکردنەوەی چیرۆکی هەواڵیی بەشێوەیەکی گونجاو، دووبارە ڕێکخستنەوەی ئەو تێبینیانەیە کە پەیامنێر لەکاتی ڕووماڵکردنی ڕووداوێکدا تۆماری کردوون. سەبارەت بەپەیامنێری خاوەن ئەزموونی دەوڵەمەند و دوورودرێژ مەسەلەی ئەوەی هەواڵەکە لەڕێگەی تەلەفۆنەوە بگەیەنێتە ئەو نووسەرەی کە ئەرکی داڕشتنی هەواڵ (Rewriter Man)ی پێسپێردراوە بەهۆی پشتبەستن بەو تێبینیانەی کەلە تیانووس یان لەکاغەزەکانیدا تۆماری کردوون، خۆی لەخۆیدا مەسەلەیەکی ئاساییە و پەیامنێری ڕۆژنامەوان ڕۆژانە ئەمەدەکات.

لەوکاتەدا کەپەیامنێر خەریکی کۆکردنەوەی ئەو ڕاستی و زانیارییانە دەبێ کەپەیوەندییان بەڕووداوی ڕووماڵکراوەوە هەیە، دەبێ سەرەتا سیمای سەرەکیی یان گرنگترین ڕەگەز دەستنیشان بکات بۆئەوەی لە پێشەکیدا دایبنێ، دواتر دڵنیابێ لەوەی کەوەڵامی هەموو ئەو پرسیارە سەرەکیانەی داوەتەوە کەپێویستیان بەوەڵام هەیە، لەقۆناغی سێیەمیشدا دڵنیابێ لەوەی کەخاوەنی بڕێکی تەواو و پێویستی سەرچاوە و زانیاریی وردە، ئینجا ئەو پەیامنێرە دەبێ بڕیار لەسەر ئەوە بدات کەئاخۆ ئەو لایانانە چین کەلە پێشەکیدا هەن و پێویستیان بەفراوانکردن هەیە

لەبەشی یەکەمی بۆدی هەواڵداو دەبێ چۆن بیانخاتە ڕوو، لەکۆتاییشدا پەیامنێر دەبێ زانیارییەکانی دیکە ڕێکبخات کەمەبەستیەتی هەواڵەکە بیانگرێتە خۆی.

زۆر کەمیش ڕێکدەکەوێ (بەڵکو لەوانەیە هەر ڕوونەدات)، کەپەیامنێری ڕۆژنامەوان ڕووداوەکان بەگوێرەی هەمان ئەو ڕێکخستنە ڕێکبخات کەلەکاتی دوانووسینی هەواڵدا دەیگرێتەبەر چونکە هەرکاتێك ڕۆژنامەوان زانیاریی زیاتری دەربارەی ئەو ڕووداوە دەستبکەوێ کەڕووماڵدەکات، ئەوکاتە ڕاستیەك یان زیاتری دەچێتە مێشکەوە بۆئەوەی ببێ بەپێشەکی.

ژمارەیەکی زۆر کەمی ڕۆژنامەوانان هەن ( لەوانەیە یەکێکیشیان نەبێ ) بەبێ ڕەچاوکردنی شارەزایی و ئەزموون، کەبەر لەنووسین و داڕشتنەوەی هەواڵ بەو هەموو تێبینیانەدا نەچنەوە کەتۆماریانکردوون، زۆرجاری واهەیە پەیامنێری لاو پێی وایە کەپێویستە تێبینیەکانی خۆی بەژمارە تۆماربکات (بەگوێرەی گرنگییان).

لەمیانەی پێداچوونەو بەو شێوازەی کەپەیامنێر لەکاتی ڕووماڵکردنی ڕووداوی جۆدیت ڕۆبرتدا لەکۆکردنەوەی زانیارییە پەیوەندیدارەکاندا گرتویەتیە بەر دەکرێ پێویستی دووبارە ڕێکخستنەوەی ئەو تێبینیانە بەدیبکرێ، ئەگەر پەیامنێری ڕۆژنامەوان لەبارەگای پۆلیس بوایە، ئەوکاتە یەکەم زانیاریی کەبەدەستی دەکەوت بریتی دەبوو لەمەی خوارەوە: —

(( خاتوو شیرلی رۆبرت پەیوەندی کرد بۆ ئەوەی بەپۆلیس ڕابگەیەنێ کەکچەکەی لەماڵی دایك و باوکی (کەئەدرەسەکەی داوە بەپۆلیس) ڕفێنراوە، ئینجا چ ئەو وەختە یان لەکاتی گەیشتنی پۆلیس کەبەیاوەریی ڕۆژنامەوانان ڕوودەکەنە ماڵی ناوبراو، دایکەکە بەدورودرێژی باس لەشێواز و دابونەریتی منالەکە دەکات دواتر دایکی منالەکە و دایك و باوکی خۆشی چۆنیەتی دیارنەمانی مندالەکە و بارودۆخی ژوور و قەنەفەی بەتاڵ و دەرگای کراوەی دەرەوەیان ئاشکرادەکرد، بەڕێز ڕۆزنبرگ

و خێزانەکەی وەسفی ئۆتۆمبێلەکەشیان کرد: کۆمپانیای بەرهەمهێن، جۆرو ڕەنگ، ژمارەی مۆڵەت، ژمارەی ئامێری ژمێرەر(العدّاد) و نیشانەی دیکەش.

لەمیانەی لێکۆڵینەوە لەئاماژە و بەڵگەکانیشدا، پیاوانی پۆلیس و هەرسێ پەیامنێری لاو و خەڵکی ناوچەکەش پرسیاریان دەربارەی سەردانی دایك و منداڵەکەی بۆ مەیامی دەکرد، دەیانویست بزانن ئەو خێزانە ڕۆژی پێش ڕووداوەکەیان چۆن گوزەراندووە، بەتایبەتیش لە دەمەو ئێوارەداو چیانکردووە، هەروەها سەبارەت بەرۆبرتیش پرسیاریان دەکرد، ئاخۆ هیچ کامێکیان لەگەڵ کەسێکدا دوژمنداری و ناحەزییان هەیە، مەبەستیان بوو بزانن جۆدیت چاوی بەکێ کەوتووە و لەگەڵ کێ ئاخاوتووە و یاری لەگەڵ کێداکردووە و چووە بۆ کوێ و ...تاد.

بەرلە دۆزینەوەی تەرمەکە، ڕۆژنامەوانان دەستیان دەکرد بەتۆمارکردنی تێبینیەکانی خۆیان دەربارەی ئەو چالاکیانەی پۆلیس ئەنجامی داون: ئەرکی گەڕان و پشکنین بەکێ سپێردراوە، ژمارەیان چەندە، ڕوویان لەکێ کرد، ئایا هیچ ئاگادارکردنەوەیەك نێردراوە لەگەڵ هەرجۆرە بەڵگەیەك کە پێیان وابووبێ گرنگن ...تاد.

ڕۆژنامەوانان زۆربەوردی پرسیاریان دەربارەی چۆنیەتی دۆزینەوەی تەرمەکە کرد، ئاخۆ ئەمە بەرێکەوت بووە یان بەپێی پلانێکی ئامادەکرابووە.

دەبێ ڕەچاوی ئەوەش بکرێ کەئەم نموونەیە بۆ ئاژانسێکی دەنگوباس نووسراوە، واتە بۆ شاری دیکەی غەیری مەیامیش ئامادەکراوە بۆبڵاوکردنەوە. ڕوداوەکەش لەشاری مەیامی ڕوویداوە دەبێ بەشێوەیەکی دوورودرێژتر بخرێتەڕوو، ئەمەش پێویستی بەزیادکردنی دیکەهەیە کەبایەخی خوێنەرە ناوخۆییەکان ڕادەکێشێ.

دەکرێ ئەوەی سەرەوە بەم جۆرە کورت بکرێتەوە:

هەنگاوی یەکەم لەنووسینی باش و گونجاوی هەواڵدا بریتیە لەڕووماڵکردنی باش، هیچ هەواڵێك نییە خۆی خۆی بنووسێتەوە، سەرەتا دەبێ دەستبکرێت بەکۆکردنەوەی ئەو مادەیەی کە پەیوەندیی بەڕووداوەکانەوە هەیە. ئەو کەسەی نازانێ چۆن چاودێریی و تێبینی بکات و زانیاریی کۆبکاتەوە، هەرگیز ناتوانێ ڕاپۆرتێکی هەواڵیی باش بنووسێ.

# دەرخستنی بنەمایەکی گرنگ
# Playing up the Feature

یەکەم : بەها هەواڵییەکان

١- کات ٢-نزیکیی ٣- دەرکەوتن و ناوبانگ ٤- دەرەنجامەکان

٥- بایەخی مرۆڤایەتیی

دووەم: شەش پرسیارەکە:

(١) کێ (٢) چی (٣) بۆچی (٤) کوێ (٥) کەی (٦) چۆن

سێیەم: ئامرازە ئەدەبیەکان .

(١) ڕستەی کورتکراوە (٢) دەربڕینە مەرجییەکان (٣) دەستەواژەکان

(٤) پێشەکیەکی کراوە

(٥) پێشەکیەکی سرکەرانە (٦) پێشەکیەکی سەرسوڕهێنەر

چوارەم: بوونی زیاتر لەڕەگەزێکی گرنگ:

١- هەواڵێکی سەربەخۆ

٢- پێشەکییەکی چڕوپڕ

٣- پێشەکییەکی هەڵواسراو

٤- چوارچێوەکان

٥- پێشەکیی ١، ٢، ٣، ٤

تاکە ڕێگەیەك نییە بۆ نووسینی هەر چیرۆکێکی هەواڵیی ، بەڵکو دەکرێ چەند ڕۆژنامەوانێکی هاوئاست خودی لیستی زانیارییەکان بەچەند شێوازێکی جۆراوجۆر بنووسن و دابڕێژن، بۆیە تەنانەت دادوەرێکیش لەوانەیە پێی وابێ کە هەرگیز نەتوانێ باشترین شێواز دیاریبکات.

یەکەم و گرنگترین هەنگاو لە بواری نووسینی هەواڵدا هەڵبژاردنی پێشەکییە، ئەم هەڵبژاردنەش پێویستی بەڕاهێنان لەسەر دادگایکردنی نووسراوەکان هەیە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو لایەنەی کە دەبێ جەختی لەسەر بکرێتەوە، یان لە زانیارییە بەردەستەکاندا بەر چاوبخرێ، هەرگیز ئەمە هەموو شتێك نییە کە بەشی یەکەمی هەواڵ وەلاّم بێ بۆ زۆرترین ژمارە لە پرسیارەکانی :

کێ؟ چی؟ کەی؟ لە کوێ؟ بۆچی؟ چۆن؟ ئەمەش بەگوێرەی مەرج وڕێساکانی نووسینی هەواڵ، ئەو بنەمایانە دەبێ وا ڕێکبخرێن بەجۆرێك دەرخستنی (توندکردن، جەختکردنەوە، Emphasis) گونجان بەو بنەمایانە ببەخشێت کە بایەخی زیاتریان هەیە.

ئەوەی مۆرکی گشتیی ( ڕەنگ، شێواز ، شێوەزار ton) بە چیرۆکی هەواڵیی دەبەخشێت و ئەوەش کە ئەو مۆرکە دیاریدەکات، هەمان ئەو بنەما گرنگەیە ( The Feature) کەلەپێشەکیدا دەردەخرێت و جەختی لەسەر دەکرێتەوە، ئەمەش بەزۆریی لەڕستەی یەکەم و تەنانەت لەبڕگەی یەکەمی ڕستەی یەکەمدا ئەنجام دەدرێت. بەخشینی توندی گونجاو بەبنەما جۆراو جۆرەکان لە چیرۆکی هەواڵیدا شێوازی شرۆڤەکاریی ساکارو پێوانەییە کە ماوەیەکی دوورودرێژ بەر لەبەکارهێنانی وشە بەمەبەستی ئاشکراکردنی بەکاردەهێنرا، ئەو ڕۆژنامەوانەش کە لەو بوارەدا خۆی ڕادەهێنێت و پەرەبەخۆی دەدات، بێگومان مەشق بەخۆی دەکات و بۆئایندەش بەچاکی خۆی ئامادەدەکات .

## یەکەم : بەها هەواڵییەکان News valus

بەبێ ڕەچاوکردنی ئیعتیباراتە سیاسییەکان، بەو پێیەی کەلەهەڵسەنگاندنی هەواڵ و بڕیارلەسەردانیدا هۆکاری یەکلایکەرەوەیین، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامەو شێوازەکانی دیکەی پەیوەندی جەماوەریی، وێڕای ئەو ناکۆکی و جیاوازییانەش کەلەنێوانیاندا بەدیدەکرێن، بەلاًم بۆدیاریکردنی، گرنگیی هەواڵیی و جیاکردنەوەیان لەنێو هەزاران بەڵکو ملیۆنەها ڕووداودا خاوەنی پێوەری (criteria) لێکچوون لەڕوی دەرونییەوە دەکرێ ئەو پێوەرانە زیاتر لاوەکی یان هەڵەبن، بەلاًم لەگەڵ ئەوەشدا لەئەنجامی چەندین ساڵ ئەزموون هەڵبژێردراون، بۆیە ئەوانە بەڕاست و چەوتیانەوە (جگە لەوانەی کە بێ ماناو شایستەی فەرامۆش کردنن) لەهەموو هۆڵەکانی نووسینی هەواڵدا بلاًوبونەتەوەو چەکەرەیان کردووە .

سەرەرای بوونی جیاوازی سەبارەت بەڕێکخستن و ناونان و دەرخستنیش، بەها هەواڵییە دیارو یەکلاییکەرەوەکان، کە نووسەرو دانەری کتێبەکانی فێرکردنی ڕۆژنامەوانیی لەبارەیانەوە کۆکن، ئەمانەی خوارەوەن :.

١. کات ...... Timeliness

٢. نزیکیی ....... Proximity

٣. دەرکەوتن ...... prominecee

٤. ئەنجامەکان ...... Consequences

٥. بایەخی مرۆڤایەتیی.......... Humaninterest

## ١- کات : Timeliness

هەموو ڕۆژنامەوانێك ئەو ڕاستیە باش دەزانێ کەدەڵێت: ((هیچ شتێك لەڕۆژنامەی دوێنێ مردووتر نییە))، ئەمڕۆش لەوانەیە بەڵکو دەبێ ئەمەی خوارەوەشی بۆ زیادبکرێ: ((یان هەواڵی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی کەکاتژمێرێك لەمەوبەر پێشکەشکراون)) بێگومان ئەو خێراییەی کەهەواڵی پێ دەگوازرێتەوە بۆتە هۆی زیادکردنی گروتینی ئەو کەسانەی کەپەیوەندیان بەکاری پەیوەندیکردنەوە هەیە بۆ دەسگیرکردنی ((دوا پێشهاتەکان بەرلەهەموو شتێك))، هەروەها بۆ دەرخستنیان و جەختکردنەوە لەسەریان.

لەم بارەیەوە ڕێساکە بریتیە لەوەی کەهەمیشە بەپێی توانا والەهەواڵ بکەیت تازەبێ و دواپێشهاتەکانیش بگرێتە خۆی، ئەمە بەر لەناردنی بۆچاپخانە یان بڵاوکردنەوەی، ئەگەر بکرێ خۆت لەوشەی (دوێنێ) دووربخەیتەوە تەنیا لەڕاپۆرتەکانی بەیانی زوودا نەبێ.

لەڕێگەی لادانی ((کەی)) لەپێشەکیدا دەکرێ کاریگەری (دوادەقیقە) وەدی بهێنێ، وەك چۆن لەم نموونەی خوارەوەدا کراوە:

((دادوەرێك لەسیرکیت ماوەی ٦٠ ڕۆژی وەك مۆڵەت بەخاوەنەکانی باڵەخانەیەکی کۆن بەخشی، بەمەبەسی نوێکردنەوەی، ئەگەرنا مۆڵکدارێتیی دەدرێتە دەوڵەت، ڕۆژی سێ شەممەی ڕابردوو ئەو بڕیارە لەلایەن دادوەر ئارنیست ل. ئیبرهواتزەوە درا کەپەیوەندی بەو باڵەخانە سوورەوە هەیە کە لەپێنج نهۆم پێکدێ و کەوتۆتە ٢١٢ شەقامی ئشبیری)).

بەڵام لەکاتی بەکارهێنانی شێوازی نادیار و بپشتبەستن بەگواستنەوەی ڕاگەیاندن و وتەکان، ئەوا دەکرێ ئەم شێوەی خوارەوە بەکاربهێنرێ:—

((لەکاتی شەودا ڕیزی ئۆتۆمۆبیلەکان دوورخایەوە، بەو پێیەی کەبۆ دابەزاندنی ڕێژەی ڕووداوەکان لە میل تاون بەپێویست دەزانرێ، ئەمەش بەپێی بۆچوونی سکۆت ئیدایکی ئەندازیاری هاتوچۆ)).

((ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی پیادە لەماوەی شەودا دووچاری ڕووداو بوونەتەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئۆتۆمۆبیلە ڕیزبووەکان ڕێگەی بینیان لەشۆفێرەکان گرتووە، دوێنێ لەبەردەمی لیژنەی جێبەجێکردنی بەڕێوەبەرایەتی یانەی میل تاوندا، ئیدایکی ئەندازیار ئەمەی ڕاگەیاند.

## ٢- نزیکیی : Proximity

ئەو ڕووداوەی کەلە ناوچەی دابەشکردنی ڕۆژنامەیەکدا ڕوو دەدات بایەخی زیاتری هەیە لەڕووداوێکی هاوشێوە کە لەدەرەوەی ئەو ناچەیەدا ڕوودەدات. ڕۆژنامە پێویستی بەهەواڵێکی دەرەکی زۆرگرنگ هەیە بۆئەوەی بتوانێ هاوسەنگ بێ لەگەڵ هەواڵێکی ناوخۆیی مامناوەند لەڕووی بایەخەوە. خوێنەرانیش زۆر بایەخ بەناوی ئەو کەس و شوێنانە دەدەن کەلەلایەن ئەوانەوە ناسراون، هەروەها گرنگی بەو هەڵوێست و لایانەنەش دەدەن کەلەوانەیە کاریگەرییان هەبێ بۆ سەریان، ئەوان بەر لەهەموو شتێك دەیانەوێ بزانن لەکۆمەڵگای خۆیاندا چی ڕوودەدات.

سەرنووسەران پێیان وایە کە هەواڵی ناوخۆیی دەبێ پێگەی یەکەمی هەبێ، ئەمە لەکاتێکدا ئەو ڕۆنامەیەی کەلەپایتەختدا دەردەچێ ( Metropolitan Newspapers) بەشێوەیەك لەشێوەکان هەست بەپێویستی بڵاوکردنەوەی هەواڵە نێودەوڵەتییەکان دەکات زیاتر لەڕۆژنامە یەکەمە ناوخۆییەکان. یەکێك لە دەرەنجامە گرنگەکانی ئەمەش زیادبوونی ئاستی خێراییە لەقەبارە و ژمارەی ئەو ڕۆژنامە ناوخۆییانەی کەلەبنەڕەتدا بۆ ڕوومالکردنی هەواڵە ناوخۆییەکان تەرخان کراون.

خەڵك حەز ناکەن تەنیا دەربارەی ئەو ڕووداوانە بخوێننەوە کەلەناوچەکەیاندا ڕوودەدەن، بەتایبەتیش ئەوانەی شارەزایی پێشوەختیان لەبارەیەوە نییە، بەڵام بێگومان بەدوای ئەو ڕاپۆرتانەدا دەگەڕێن کەپەیوەندییان بەڕووداوە ئاسایی و ناسراوەکانەوە هەیە، ئەوان دەخوازن ناوەکانیان بەچاپکراوی لەڕۆژنامەدا ببینن، هەروەها پێشیان خۆشە ئەو بابەتانە بخوێننەوە کەڕۆژنامەکان دەربارەی بارودۆخ و ڕووداوەکان دەینووسن، ئەو ڕووداوانەی کەتازە خەریکە شتێکیان لەبارەوە دەزانن. ئەگەر کەسێك چاوەڕێی ئەوەبکات کەناوی خۆی یان هی ناسیاوێکی لەڕۆژنامە بڵاودەکرێتەوە، ئەوکاتە لەڕۆژنامەدا بەرلەهەموو شتێك بەدوای ئەو بابەتەدا دەگەڕێ کەناوەکەی تێدایە، بەڵکو بەپەلەیە بۆ خوێندنەوەی ئەو ڕاپۆرتەی کەڕۆژنامە سەبارەت بەکۆبوونەوەیەك بڵاوی دەکاتەوە کەخۆی تیایدا ئامادەبووە. یان دەربارەی ئەو ڕووداوەی کەبینیویەتی یاخود یاریەکی وەرزشی کەئامادەی بووە. لەڕووی لۆژیکییەوە پێچەوانەی ئەمە دەبێ ڕاست بێ ، واتە پێویستە سەرەتا ئەوە بخوێنێتەوە کەهیچی لەبارەوە نازانێ، بەڵام ئەمە ناکات، سەرنووسەرانیش ئەوە دەزانن. ڕۆژنامەکانیش ئەگەر هەستبکەن کەدەرفەت یان هەر ئەگەرێك بۆ بایەخدانی ژمارەیەکی گەورەی خوێنەران بەهەواڵێك لەئارادایە، ئینجا ئەو هەواڵە چەند بچووك و لاوەکیش بێ، بێگومان بڵاویدەکەنەوە.

ئەو ڕاستەیش پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو هەڵوێستە نابەجێیەی کەدەڵێ: تەنیا لادێییەکانن کە حەزیان لەزۆر بڵێیە (Gossip) ڕاستیەکەش بەتەواوی پێچەوانەی ئەمەیە. ئێمە لەڕۆژنامەیەکی نیۆیۆرکیدا ئەوە ناخوێنینەوە کە ماری تایلۆر ڕۆژی پشووی هەفتە لەگەڵ کەسوکاریدا لەنیوهافن بەسەر دەبات، چونکە خاتوو تایلۆر ئەوەندە بەناوبانگ نییە، بۆیە تەنیا ئەوانەی دەیناسن بایەخ بەهەواڵیی سەردانەکەی دەدەن، بەڵام ئەگەر ئەمە ڕوویدا و ناوەکە ئەلیزابێت تایلۆر بوو، ئەوکاتە ئەگەرێکی زۆر هەیە کەهەواڵەکە بڵاوبکرێتەوە. لەڕۆژنامەکانی پایتەختدا هیچ پڕوپاگەندەیەك دەربارەی کەسایەتییە بەناوبانگەکان نییە (ئەگەر لاوەکیی و بێبەهاش بن) بەکەڵکی

بڵاوکردنەوە نەیەن، هەروەها خوێنەری هیچ ڕۆژنامەیەکی شارنشین بۆی نییە گاڵتە بەخوێنەرانی ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی ناوخۆیی بکات بەهۆی ئەوەی کەدەیانەوێ بزانن هێنری جۆنز کۆگای بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی بەڕەنگی سوور سواغداوە. ڕۆژنامەوانان هەمیشە هەوڵدەدەن لەهەواڵەکانیاندا ڕەگەزە ناوخۆییەکان و تازەترین پێشهاتەکان بخەنە ڕوو، بۆ نموونە: -

(( ڕۆبرت براونی ئیمزاکەری ژمارە ۸۹ لەتیپی ئەمەریکی، بەشاندێکی پەنجا کەسی بەشداری لە کۆنگرەی ساڵانەی دەیەمی تیپی ئەمەریکی لەویلایەتدا دەکات، کەبڕیارە ڕۆژانی دووشەممە و سێ شەممە و چوارشەممە لەنیلزفایل ئەنجامبدرێ، لەنێوان شاندەکەشدا ۳۵ یان ئەندامی تیپی مۆسیقان)).

ئەم داڕشتنە باشترە لە :

(( کۆنگرەی ساڵانەی دەیەمی تیپی مۆسیقای ئەمەریکی لەڕۆژانی دووشەممە و سێ شەممە و چوارشەممە لە نیلزفایل سازدەکرێ، پێگەی خۆجێیی سەر بەو تیپە نوێنەرایەتی دەکرێ...)). ڕۆژنامەکان بەزۆری دووبارە ئەو هەواڵانە دادەڕێژنەوە کەلە ئاژانسەکانی هەواڵ یان پەیامنێر و بڵاوکراوە هەواڵییەکانەوە پێیاندەگەن و چەند بنەمایەکی گشتیی (وەك پێشەکی داڕشتەی دووەمی هەواڵیی پێشوو) دەگرنە خۆیان، لەپێناوی بەجێهێنانی بایەخ و گرنگیی خوێنەرە ناوخۆییەکان. بەواتایەکی دیکە، ڕۆژنامەکان مرۆکێکی ناوخۆیی (Localizing) بەهەواڵیی نیشتمانی دەبەخشن، وەك ئەم نموونەیەی خوارەوە: (( مانگرتنی گشتیی نیشتمانیی کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانیی کاردانەوەیەکی سنووردار،یان لەوانەیە هیچ کاریگەریەکی نەبێ بۆ سەر خزمەتگوزاریی پۆستە لەلینکولن، کینت لویسی بەڕێوەبەری پۆستە ئەمەی ڕاگەیاند، ناوبراو گوتی: چەند گەشتێکی ئاسمانی کەبەشداریان لەمانگرتنەکەدا نەکردووە، پۆستە لەلنکۆڵنەوە دێنن، هەندێك کێشە و گرفت لەبنکەکانی گواستنەوەی نیشتمانیش وەك دینییفر و کانساس سیتی و ئوماها ڕوودەدەن و دێنە پێشەوە، بۆیە گەیشتنی پۆستەی نیشتمانی ئاسمانی بۆماوەی

٢٤ كاتژمێر دوادەكەوێ. باركردنی پۆستە لەڕێگەی هێڵەكانی فڕۆكەوانییەوە ئەنجام دەدرێ كەنەكەوتۆتە ژێر كاریگەری مانگرتنەكەوە و زۆر لەو هێڵانە دەستیان كردووە بەبەكارهێنانی ژمارەیەكی زیاتر لەفڕۆكەكانیان، بەڵام ولیام هاتگنی یارمەتیدەری بەڕێوەبەری گشتیی پۆستە لەویلایەتە یەككرتووەكان ڕایگەیاند كەناكرێ پلانی فریاكەوتن جێبەجێبكرێ، بۆیە چەند گەشتێكی ئاسمانی زیاتر ڕەتدەكرێنەوە.

پۆستەی ئاسمانیی سەربازیی ئەو یەكانەی كە لەباشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ئەورووپادا خزمەتدەكەن وەك جاران وان، بەوپێیەی كۆمپانیاكانی فڕۆكەوانیی گرێبەندە سەربازییەكانی خۆیانیان پاراستووە.

Lincoln Journal

### ٣- ناوبانگ Prominence

لەوانەیە هەموو تاكەكان بەیەكسانی دروستكرابن، بەڵام هەندێكیان لەوانی تر بەهای هەواڵیان زیاترە، دوورنییە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەو پلە و پایانەی هەیانە یان بۆ بەها خۆشگوزەرانییەكانیان، یاخود ئەوان لەڕابردودا بەشێوەیەكی نائاسایی هەڵسوكەوتیان كردووە، هەرئەمەش وای لێكردوون گرنگی و بایەخ بەهەرشتێك بدەن كەئەنجامی دەدەن.

ئەوەی بۆ خەڵك دەشێ، بۆ شوێن ڕێكخراوەكایش دەشێ كاتێك ئەگەر هەموو توخمەكانی تر یەكسان بن، هەواڵێكی وەك ئاگر یان تاوانێك كەشایستەی بڵاوكردنەوە بێت، بایەخی زیاتری دەبێ ئەگەر لەناوچەی خوێنەردا ڕوویدات. بێگومان خوێنەر خاوەنی گرنگیی و بایەخدان بەهەموو شوێنەكانی دیكە نییە، هەروەها گومان نییە لەوەی كەمەڵبەندە زەبەلاحەكانی كۆبوونەوەی مرۆیی وەك نیویۆرك و لۆسئەنجلۆس بەسەر شار و شارۆچكەكانی تردا زاڵن، لەنێوان ئەو دوو

شارەشدا هەندێك كەس بایەخی هـەواڵی زیاتری هەیە لەهەنـدێكی دیكـە، هۆكـاری ئەمـەش بـەزۆری دەگەڕێتـەوە بۆئـەوەی كەئەمانـە بوونەتـە پەیوەسـتی جـۆرێكی تایبەتی هەواڵ. لـەنێوان ئـەو شاروشارۆچـكە بچووكانەشـدا ڕۆنـۆ و لاس ڤیگـاس و هۆلیوود و تیاجوانا و مۆنتی كارلۆن.

بۆ نووسەری كاروباری شار، هەواڵیی هەموو ئەوانە گـرنگن كەلەوانەیـە بەشـداری بكەن، بۆیە هەوڵدەدات بەگوێرەی توانا و ئەو قەبارەیەی بۆ بڵاوكردنەوەی هەواڵەكە تـەرخانكراوە، نـاوی هـەرە زۆریـان بهێنـیٚ و بـەكاربێنیٚ، لەزۆربـەی حاڵەتەكانیشـدا ڕۆژنامـەكان لیسـتی دووردودریٚ بـەناوی ئەنـدامانی شـاندی كۆنگرەكـان و میـوان و بانگهێشـتكراوان بـۆ ئاهـەنگ و بۆنـە كۆمەڵایەتییـەكان و ...هتـد بڵاودەكەنـەوە، پـەیامنێرانیش وا ئاڕاسـتەدەكرێن كـەزۆرترین ژمـارەی نـاو ئامادەبكـەن، هـەروەها ئاگادار دەكرێنەوە كە ناوەكان تەواو بن و بەدروستیش بنووسرێن، زۆر كەمیش ڕێك دەكەویٚ كەدوا ناوەكان بـەپێی پێویسـتی بن، بـەڵكو شـێوازەكانی پەیوەنـدیگرتنی جەماوەریی دەبیٚ ناوی ئەو كەسـە بەتـەواوی بـەكاربهێنن، وەك چـۆن خـۆی لـەكارو لەكۆمەڵگادا بەكاری دێنیٚ.

لەوانەیە بەڵگەی ژمارەكـانی تەلـەفۆن یـان شـار، نـاوی تـەواوی كەسـێك بگرێتـە خۆی، لەكاتێكدا ئەو كەسە تەنیا پیتی یەكەم یـاخود چـەندپیتی یەكـەمی ناوەكـەی بەكاربێنیٚ، تەنانەت لەوانەیە نازناوێكیشی هەبیٚ، كەواتە گونجـاوترین ڕێگـە ئەوەیـە كەلەكەسی پەیوەندیدار بپرسیت.

ئەگـەر كەسـێكی ناسـراو لەسـەر ئاسـتێكی بـەرفراوان لەهەواڵێكـدا دەربـارەی ڕووداوێك دەركەوت، ئـەوا ئـەو ڕووداوە لەوانەیـە ببێتـە سـیفەتی دیـار یـان ڕەگـەزی بنەڕەتی لەهەواڵدا، وەك چۆن لەم نموونەیەی خوارەوەدا هاتووە:

(( سـتیت — لویـل ج. هیتزمـون و شـەش كەسـی دیكـەش، ئێـوارەی دوێنـیٚ بریندار‌بوون، لەكاتێكدا ڕیزێك لەكورسییەكانی ماندەران لەیاری تۆپی باسكەی نێوان میلیتاون — ڕاشفیلدا داڕمان)).

## ٤- دەرەنجامەكان Consequences

ناوبانگی كەس و شوێن و شتی بڵاوكراوە لەهەواڵەكاندا، ئەوانەی لەدەرەوەی چوارچێوەی ناوخۆییدا ڕوودەدەن، بەتەنیا نابنە هاندەر بۆئەوەی ڕۆژنامەكان لەبری هەواڵە ناوخۆییەكاندا بڵاویانبكەنەوە، بەڵكو گرنگیی هەواڵ — ڕووداو خۆی لەخۆیدا پاڵ بەڕۆژنامەكانەوە دەنێ كەبڵاویانبكەنەوە.

دەكرێ ئەمە بەمجۆرەی خوارەوە ڕوونبكرێتەوە: ئەو هەواڵانەی كەلەواشنتۆن یان كۆلۆمبیاوە دێن بێگومان لەشیكاگۆ و سان فرانسیسكۆ هەواڵیی لاپەڕەكانی یەكەمن، وەك دیاریشە ئەو شوێنەی لاپەڕەكان بۆ كەسایەتی گرنگ یان ئەندامانی كۆنگرێس و تەنانەت وەزیرانیش تەرخانكراوە، ئەمەش لەبەرئەوەی چونكە ئەو كێشەیەی ئەو كەسایەتیانەی پێوە بەستراونەتەوە پەیوەندی بەبەرژەوەندییە ژیارییەكانی خوێنەرانەوە هەیە لەسەرتاسەری وڵاتدا. پرۆژەی هەریاسایەكیش كەلەلایەن كۆنگرێسەوە تاوتوێ بكرێ بۆ هەموو هاوڵاتییەكی ئەمەریكی گرنگە و بایەخی خۆی هەیە، لەزۆربەی كاتەكانیشدا هەواڵە سیاسییە نیشتمانییەكان بایەخ و گرنگی زیاتریان دەبێ لەهەواڵە سیاسییە ناوخۆییەكان، لەسەردەمی ئەتۆمیدا! عەقڵییەتی یەكانگیریی بۆتە زەرورەتێك بۆ جیهان.

هەواڵە پەیوەندیدارەكان بەو ئاڵۆگۆڕانەی كەلەكەش و هەودا یان جل و بەرگدا ڕوودەدەن، یان ئەوانەی پەیوەندییان بە پەتاو تاعونەوە هەیە، هەواڵیی گرنگن، بەوپێیەی كۆمەڵگای ناوخۆیی بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ دەكەوێتە ژێر كاریگەرییانەوە، ئەمە ئەگەر ڕاستەوخۆ نەبێ.

مانگرتنی كرێكارانی كانەكانی دەرهێنانی خەڵوزیش لەویلایەتێكی دوور لەوانەیە ببێتە هۆی دابەزینی ڕێژەی وزەی ناوخۆیی، هەروەها لەئایندەیەكی نزیكدا مۆدێلێكی تازەی ئۆتۆمبێل لەبازاڕە ناوخۆییەكاندا دەخرێتە ڕوو بۆ فرۆشتن، یان داهێنانێكی زانستیی گرنگ سەرهەڵبدات و ببێتە مایەی ئەگەری گۆڕینی شێوازی

بیرکردنەوەی خوێنەر سەبارەت بەمەسەلەیەکی ماددی — فیزیۆلۆژیی. گرنیگدان بەو جۆرە هەواڵانە گرنیگدانێکی زۆر کەسی و ڕاستە، وێڕای بەخشینی مۆرکی ناوخۆییش، بەڵام لەسەر ئاستی نیشتمانیدا هەواڵەکان گرنگیی و بایەخی خۆیان دەبێ، ڕۆژنامەکانیش لەڕێگەی لێکۆڵینەوە و دەرخستنی گۆشەی ئایندەیی (سبەینێ) و کاریگەری لەسەر هەواڵە ناوخۆییە جەخت لەسەر کراوەکانەوە کاریگەریی و ئاسەواری هەواڵ دەردەخەن. ئەم شێوازەش لەوانەیە والەهەواڵ بکات لەکاتی خۆیدا بێ و بایەخیشی دەربکەوێ، دواتر جەختکردنەوە زیاتر لەسەر ئەنجامەکان دەبێ نەوەك لەسەر هۆکارەکان، هەروەها دەبێتەوە مایەی ڕوونکردنەوەی کاریگەریی لەئێستا یان لەئایندەی چاوەڕوانکراودا.

((ڕێگە بەپیاوانی پۆلیس و ئاگرکوژێنەوە و ئەوانی دیکەش دەدرێ کەلە خزمەتگوزاریەکانی شارەوانیدا کاردەکەن، لە دەروبەری شار بژین، ئەمەش بەپێی بڕیارێکە ئەنجوومەنی شار چوارشەممە دەریکردووە. پارەی سواربوونی پاسە ناوخۆییەکان لەلەندەن زیاد دەکات.

ڕۆژی سێ شەممە لیژنەی هێڵی ئاسنینی لەنبراسکا بڕیاری زیادکردنی کرێی سواربوونی شەمەندەفەری بە ڕێژەی ٥٪دا، ئەمەش لەیەکی ئابەوەجێبەجێ دەکرێ. ئەو گۆڕانکارییە دەبێتە مایەی زیادکردنی کرێی سواربوونی گەنج لە ١٥– ٢٠ سنت و بۆ منداڵ لە ١٢– ١٥ سنت)).

## ٥- بایەخی مرۆیی Human Interest

گرنگیدان بەبوونەوەرە مرۆییەکان و ڕووداوەکان مانای ئەوە دەگەیەنێ کەزۆر لە پیاوان و ئافرەتان لە هەندێك هەڵوێستدان دەکرێ ڕووبەڕووی هەر کەسێکی دیکە ببنەوە، هەر ئەوەشە کەبە بایەخی مرۆیی ناوزەدی دەکەین، بەمانای گرنگیدان بەمرۆڤ و هەموو ئەوانەشی کەپەیوەندیان بەمرۆڤەوە هەیە.

بایـــەخی مرۆیـــی و گرنگیـــدان بـــەژیان و خۆشـــگوزەرانیی ئـــەوانی تـــر و بەرجەستەکردنی ڕەگەزی مرۆیی وامـان لێدەکات کەبەبایـەخ و سـۆزەوە دەربـارەی لەدەسـتدانی ژیـان و مـاڵ و موڵکـەکان بخوێنینــەوە، بەتایبـەتیش لەکۆمـەڵگا زۆر دوورەکـان لەئێمـەوە کاتێـك لەباشـووری ئیتالیـا یـان لـەژاپۆن بوومەوەلەرزەیـەك چـەندین مـاڵ وێـران دەکـات و خـەڵك دەکـوژێ، ئـەو وەختـە ئەگـەرێکی لاواز هەیـە کەڕاستەوخۆ کار لەژیانمان بکات، تەنیا بـەهۆی بانگەشـەی خاچـی سـوورەوە نـەبێ بۆئەوەی یارمەتیی‌و کۆمەك بۆ قوربانیان کۆبکەینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئـەرکی سەرشـانمانە کـەئاگاداری ئـەو کارانـە خـودابین، بـەو پێیـەی بوونـەوەری مرۆیـی هاوشێوەی ئێمە بەدەستیەوە دەناڵێنن.

هەر ئەو بانگەشە کەسییەشە کـە سەرنووسـەران مەسەبەسـتیانە، کاتێـك دەڵـێن هەواڵێك هەیە سەرەڕای ئـەوەی کـە هـیچ ڕەگـەزێکی دیکـەی بـەهای هـەواڵیی وەك: کات، دەرکەوتن، گەورەیی، ئاسەوار و دەرەنجام ناگرێتە خۆی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مایەی سەرنج و بایەخی خوێنەرە. ئەگەر بەوردیش بـدوێین، دەکـرێ بڵـێین هـەموو ئەوەی پەیوەنـدی بەمرۆڤـەوە هەیـە مایـەی سـەرنج و بایـەخی تـەواوی خوێنەرانـە، بەوپێیەش خوێنەران لەڕووی سەرقاڵی و بایەخ و خواستنەوە جیاوازن، بۆیە هەندێك لەوهەواڵانەی بۆ هەندێك خوێنەر بانگەشەی کەسیی Personal Appeal دەگرنە خۆیان ، ناتوانن سەرنجی خوێنەرێکی دیکە بوروژێنن.

هەر خوێنەرێك، هەرچەندشت بەهەنـد هەڵنـەگرێ و گۆشـەگیربێ، بـەڵام خـاوەنی هەندێك بایەخ و سۆزە بەرامبـەر بـەژیان و خۆشـگوزەرانیی بوونـەوەرە مرۆییـەکانی دیکە، ئەو بایەخە خەڵکانی توندڕەویش دەگرێتەوە کەهەمیشە خەریکی گاڵتـەجاڕین بەرامبەر بە ژیانی ڕۆژانە.

گرنگیدان بەو ڕاپۆرتە هەواڵییانـەی کەپەیوەنـدیان بـە کارەسـات و لەدەسـتدانی ژیـان و مـاڵ وموڵکـەوە هەیـە، بایـەخێکی سـۆزدارییە، لەوانەشـە هۆکـاری دیکـە لەئارادابن و ببنەمایەی بایەخدان بەهەواڵیی ئاگرکەوتنـەوە و دارمـان و ڕووداوەکـانی

هاتوچۆو هی تر، بەڵام کەباس لەکەسانێك دەکرێ کەدووچاری هەڵوێستی نابەجێ بووبنەوەو ئەوا بەهەمان شێوە بایەخێکی سۆزدارانەیان پێ دەدرێ، لەلایەکی دیکەوە نەخۆشی و نزیکبوونەوە لەمردن و مەینەتی و لەدەستدانی موڵك و ڕووداوی دیکەی لەوجۆرە دەبنە هۆی خولقاندنی هەڵوێستی سۆزدارانە لەنێو نێوەندەکانی خوێنەراندا.

لەبەرامبەریشدا ڕاپۆرتە پێکەنیناویی و دڵرفێنەکانی دەربارەی پیاو و ئافرەتی نموونەیین، لەنەستی سۆزداریی خوێنەر دەدەن. ئەمەریکییەکان حەزیان لەپێکەنینە، دڵیشیان بە هەرشتێکی سەرسوڕهێنەر و نابەجێ خۆش دەبێ، لەهەموو چیرۆکە هەواڵییە پێکەنیناویەکانیشدا کەسێك هەیە هەست بەدڵتەنگی دەکات، بەڵام ئەمە شتێك لەئاستی گاڵتەجاڕیی هەڵوێستەکە دوورناخاتەوە زیاتر لەو هەستەی کاتێك مرۆڤ ئەو ئازارە دەزانێ کەبەر ئەو کەسە کەوتووە کەلەتوێکڵی مۆزێك هەڵخلیسکاوە و کەوتۆتە سەرزەوی، ئەمەش لەوانەیە بەس بێت بۆ دەرکەوتنی زەردەخەنەیەکی قەتیسماو کەلە سەرلێوی مرۆڤێکەوە دەربکەوێ، ڕوداوی لەو شێوەیە، جۆرە نامۆییەکیشیان پێوە دیارە، خەڵك لەهەموو شوێنێك و ئەمەریکییەکان بە تایبەتی، خۆشحاڵن بەوەی کەهەست دەبزوێنێ و شێوازی ((باشترین)) دەگرێتە خۆی. کەسانی نائاسایی و شوێنە نامۆکان و ڕووداوە ورووژێنەرەکان، هەموویان پێکەوە داوەت و بانگەشەیان بۆ ئێمە تێدایە، کاتێکیش کەناتوانین چاومان بەو کەسانە یان بەو شوێنانە بکەوێو یاخود توانای تێپەڕبوونمان بەو ئەزموونانەدا نەبێ، ئەو وەختە دەخوازین زۆریان لەبارەوە بخوێنینەوە، بەڵکو لەئەنجامی خوێندنەوەی چیرۆکە هەواڵیەکانەوە، ئەوانەی دەربارەی ڕووداو و چیرۆکە خەیاڵیەکانن، خۆشییەکی دیکەی قەرەبوویی دەستەبەر دەکەین.

لەڕابردوودا، هەواڵیی تیۆرو داهێنانە زانستیەنوێکان بەنائاسایی دادەنران، بەڵام لەسەردەمی ئێستای ئەتۆمیدا توخمی (لەناکاوی) بەتەواوی لەناوچووە، بەڵام

بایەخدان بەپێشکەوتن هەرماوە، بەهەمان شێوە ڕەگەزی بایەخدانی خوێنەریش کەلە سەرەوەی هەموو ڕەگەزەکانی دیکەوەیە هەر بەردەوامە.

هەڵبژاردنی ڕەخنەگرانە بۆ لیستی گەورەترین چیرۆکی هەواڵیی کەلەماوەی ساڵێکدا بڵاوکراوەتەوە، ئاماژە بەوە دەکات کە هیچ ڕەگەزێك نییە وەکو ڕەگەزی بایەخی خوێنەر ئامادەیی یەکلایەنانەی خۆی بسەپێنێ. ئەمەریکییەکان (هەرئەمەش پێویستە هەبێت) حەز لە ململانێی گونجاو دەکەن و بەجۆرێکی واش دەڕواننە تەواوی ژیان وەك ئەوەی ململانێ (خەبات Struggle) یێك بێ، ڕەگەزێکی لەوجۆرەش زیاتر لەو چیرۆکە هەواڵیانەدا بەدی دەکرێ کەڕووماڵی یارییە وەرزشییەکان و تاوان و سیاسەت و کارەسات و پێشبڕکێکان دەکەن. ئەو هەواڵانەش کە ڕووداوەکانیان دەربارەی مرۆڤ لەدژی مرۆڤ یان مرۆڤ لەدژی سروشتن سەرنجی جەماوەرێکی بەرفراوان ڕادەکێشن و زیاتر هانی دۆڕاو، یان قوربانیی دەدەن.

ئەگەر هەر جۆرە ورووژانێك لەوهەواڵەی کەدەربارەی ململانێ بێ ، یان هەر چیرۆکێکی هەواڵیی دیکە دەربارەی هەمان بابەت بەدیکرا، ئەوا ئاستی بایەخ و گرنگیدان بەرز و توندتردەبێ، کات ناکاتێکیش سەرنجی تەواوی کۆمەڵ دەکەوێتە سەر ڕوداوێکی هەواڵیی دیاریکراو، وەك هەواڵیی کارەساتی داڕمانی کانێکی دەرهێنانی خەڵوز، کاتێك پیاوانی فریاگوزاری بەتەوسێکەوە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی کرێکاران تێکۆشاون.

نەخۆشیش بەهەمان شێوە، بەتایبەتی ئەگەر کەسێکی گرنگ و بەناوبانگ نەخۆش بکەوێ یان نەخۆشییەکە لەئەنجامی هۆکارێکی نامۆوە سەری هەڵدابێ، ئەوکاتە دەکرێ لەڕووی هەواڵییەوە ڕووماڵبکرێو و بگوازرێتەوە، بەمەرجێك تیایدا ڕەچاوی ڕەگەزی ورووژاندن بکرێ، هەڵمەتە سیاسیی و کێشە یاساییەکان و یارییە وەرزشیەکانیش جۆرە ورووژانێکیان تێد بەدی دەکرێ.

لەهەر چیرۆكێكی هەواڵیشدا، ئەوەی كەبەبایەخی مرۆیی ناوزەددەكرێ، ڕوو لەزیادبوون دەكات كاتێك تەوەری بنەڕەتی ئەو چیرۆكە منداڵ یان ئاژەڵ یان ئافرەتێك بێ، واش بەباشتر دەزانرێ كەئافرەتێكی شێوە جوان بێ. ئاگاداركردنەوە نادیار و شاراوەكان لەدژی بەدرەوشتی لاوان لەڕێگەی هەڵكەنراوە ئاسەوارییەكانەوە دۆزراونەتەوە و جەختیان لەسەر ئەوە كردۆتەوە كەهەرزەكار هەمیشە ڕووبەڕووی كێشەیەك دەبێتەوە، زیاتر لەوەش، هەر لەسەردەمی ئەسپ سوارییەوە ڕەگەزی مێینە نیگەرانی و جارسییەكی زیاتری پەیدا كردووە لەڕەگەزی نێرینە، كاتیش هەمووشتەكانی نەگۆڕیوە هێشتا ((مەشخەڵی گەنجان)) ڕۆڵ و كاریگەریی خۆی ماوە، ئەمەش ئەوە شیدەكاتەوە كەلەبەرچی لەهەمو كاتێك زیاتر ئافرەتە دەوڵەمەندە میراتگرەكان و ئەوانەی بۆ یەكەمجار دەچنە سەر شانۆ و ئەوانەش كەلە قوتابخانە تێكەڵەكاندا كاردەكەن گڕدەگرن و دەدرەوشێنەوە. ئەو پێشكەوتنەی كەلەبواری ڕۆژنامەگەریی و وێنەكێشانی ڕۆژنامەگەرییدا ڕوویداوە، بووە بەیارمەتیدەرێك بۆ كپكردنەوەی ئارەزووەكان لەبەخشینی زانیارییی ورد دەربارەی ئەوەی ئاخۆ كوڕ و كچە سەركەشەكانمان چی دەكەن و چۆنن.

بەپێی دیدوبۆچوونی هەواڵیی تەواو، ئەوەی بە ناوەڕاستەكانی تەمەن ناوزەددەكرێ، لەهەموو قۆناغەكانی دیكە مرۆڤ تیایدا زیاتر دووچاری نائارامیی و دڵتەنگی دەبێتەوە. قۆناغەكانی شیرەخۆریی و منداڵیی و هەرزەكاریش هەموویان گرنگیی لاپەڕەی یەكەمیان هەیە، وەكو ئەو كچە بچكۆلانەیەی چووە لای پارێزگار بۆئەوەی سەگە بچكۆلانەكەی بۆ ڕزگاربكات، یان ئەو ئافرەتە بەتەمەنەی كەبۆ یەكەمجار لەژیانیدا سواری فڕۆكە دەبێ.

سییەكان و چلەكان و پەنجاكانی تەمەن، ساڵانی كۆشش و ماندووبوونن بۆئەوانەی بەدوای شۆرەت و ناوبانگیدا دەگەڕێن. لەو ساڵانەدا مرۆڤ دەبێ شتێكی گرنگ ئەنجام بدات بۆئەوەی ناوی لەهەواڵەكاندا دەربكەوێ، یان دەبێ خاوەنی نووسینگەیەكی پەیوەندییەگشتییەكان بێ.

بایەخدانیش بەگیانەوەران تەواو وەك بایەخدانە بەمنداڵان و بەبەساڵاچووان، هەندێك جار خوێنەر جۆرە سۆزدارییەك پیشان دەدات، وەك چۆن بەرامبەر بەو و هەواڵە ڕوویدا کەپەیوەندی بەو سەگەوە هەیە کە ڕازی نەبوو گۆڕی خاوەنەکەی جێ بهێڵێ، بەڵام هەندێك جاری تر گیانەوەر دەبێتە مایەی ڕق و بێزاری، ئەو کاتەی گیانەوەرێکی ماڵی هێرش دەکاتە سەر کەسێك و ئازاری دەدات.

ئەو هەواڵانەی دەربارەی زیرەکیی نائاسایی هەندێك گیانەوەرن هەمیشە هەواڵیی باشن، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو زیرەکییە بۆ بەرژەوەندیی مرۆڤ و خۆشگوزەرانی خۆی بەکاربهێنرێ، ئەو چیرۆکانەی کەدەربارەی سیفەتە چاکەکانی وەك متمانە و ڕاستگۆیین، خوێنەر ڕادەکێشن و دەبزوێنن هەر جموجۆڵێك لەشانشینی گیانەوەراندا سەرنج ڕادەکێشن، بەهەمان شێوەش یارییەکانی ڕاوکردن.

پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی لاو دەبێ فێری چۆنیەتی جیاکردنەوەی تواناکانی بایەخی مرۆیی ببێ لە چیرۆکە هەواڵییەکاندا، هەروەها دەبێ بزانێ چۆن بەبێ شێواندن یان زیادەڕۆیی دەریانبخات. لێرەدا دوو نموونە دەربارەی پێشەکییە گونجاوەکانی هەواڵە واقیعیەکان (Factual News) دەخەینە ڕوو، هەریەکەیان بەهۆی زیرەکیی وشارەزایی نووسەران و توانای وەرگرتن و جیاکردنەوە و دەرخستنی ئەو لایەنانەی دەبنەمایەی وروژاندنی بایەخی مرۆیی بەم شێوەیە داڕێژراون: —

((تۆرنتۆ — ی. ب .جۆن برۆکی تەمەنی ٣٢ ساڵ، ڕۆژی سێ شەممە ڕەوانەی بەندیخانەی چاکسازیکرا، چونکە ڕقی لەئافرەتانە، ناوبراو بەوە تاوانبار کرا کەلەیانەیەکی ناوەڕاستی شاردا هێرشی کردۆتە سەر ژووری ئافرەتان و شێوازی ئافرەتێکیشی شێواندووە کەسەرقاڵی خۆجوانکردن بووە، ئەو خانمە بە پۆلیسی ڕاگەیاندووە کەجۆن هەڵیکوتاوەتە ژوورەکە هاواری کردووە: ڕقم لەئافرەتە، تۆش یەکێکی لەوان)).

Daltuth- News Tribune

(( ڕۆژی هەینی لەنزیك باخچەی ئاژەڵان لەدینیڤر چەند هاوارێكی ناڕەزایی بیستران، بەڵام لەڕاستیدا ئەو دەنگانە لەباڵەخانەی شارەوانییەوە سەرچاوەیان گرتبوو نەوەك لەباخچەی ئاژەڵان، هۆكاری ئەو دەنگەش پەیوەندیی بەپلانەكانی نیكلسۆنی سەرۆكی ئەنجوومەنی شارەوە هەبووە، ئەوانەی تایبەت بوون بە گواستنەوەی بەڕێوەبەرایەتی باخچەی ئاژەڵان بۆ دەزگای دینیڤر بۆ باخچەكانی ئاژەڵان كەبریتین لە كۆمەڵێك هاوڵاتی، كە بایەخێكی زۆر بەكێشەكانی باخچەكانی ئاژەڵان دەدەن و پێیان وایە دەتوانن باشتر لەشارەوانیی ئیدارەی باخچەكە بەڕێوەبەرن)).

ئەو دوونموونەیە دووپاتیدەكەنەوە كەدەكرێ پارێزگاری لەیاسا پەیوەندیدارەكان بەدارشتنی هەواڵەوە بكرێ، لەهەمان كاتیشدا خۆدوور لەپێشەكییە ڕەق و تەقە چەقبەستووەكان ڕابگیرێ.

## دووەم: شەش پرسیارەكە

## The Five W's and the H

بەزۆری (چی) یان (كێ) دەبنە ئەوسیمایەی دەلالەت لەو هەواڵە كورتە دەكەن كەتەنیا ڕووداوێك دەگرێتە خۆی (هەواڵی ئاسایی)، لەزۆربەی كاتەكانیشدا بە بەئاستەم دەتوانرێ شتی گرنگ دەستنیشان بكرێ، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی زۆربەی هەواڵەكان دەربارەی خەڵك و كار و كردەوەكانیان دەخوڵێنەوە. لەو كورتە هەواڵەی خوارەوەدا (بۆ نموونە)، زۆربەی زۆری خوێنەران لەبنەڕەتدا بایەخ بەو لاوە دەدەن كەوەك هاوڕێ، یان ناسیاوێك ئاماژەی بۆكراوە، هەروەها هەندێكی دیكە لەبنەڕەتدا بایەخ بەهەواڵەكە دەدەن، بەگوێرەی ئەو ئاسەوارانەی كەبەسەر قوتابخانە ناوخۆییەكاندا جێی دەهێڵێ. ئەگەر هەواڵ دەربارەی كەسێكی دیاریكراوبێ، بەزۆری بەناوی هەمان ئەو كەسەوە دەستپێدەكات وەك : —

((پیتەر ل.كلای، وەكو مامۆستای مێژوو لەقوتابخانەی دواناوەندی ناوخۆیی دەستی لەكاركێشایەوە، بۆئەوەی لەكۆلێژی بوستەردا وەك مامۆستایەكی بەشدار لەمێژوودا كاربكات)).

## ١- کێ The Who

لەم هەواڵەی خوارەوەدا (کێ؟) سیمای باڵا پێکدێنێ: (( جۆرج ل. روز وەك جێگری هەشتەوی سەرۆکی ئەنجومەنی ئەمەریکی بۆ بەکارهێنراوە مەدەنییەکان هەڵبژێردرا)).

بایەخدان بە (کێ؟)بەزۆری لەجۆری کەسی پەیوەندیدارەوە سەرچاوە دەگرێ (لەسەر بنەمای پلە و پایە، یان ئاین، یان ڕەگەز ، یان تەمەن ....تاد، یان لەسەر بنەمای ئەو بارودۆخەی کەلەهەواڵێکی دیاریکراودا نوێنەرایەتی دەکات، یان ژمارەی کەسە پەیوەندیدار و تێوەگلاوان)ی وەك : —

((ڕۆژی سێ شەممە پاسەوانێکی تایبەت تەقەی لەدزێك کرد کەهەوڵی دزینی خەزێنە ئاسنینەکانی دەدا، ئەم هەوڵەش لەدوای بەرگرگیکردنی دزەکە و هاوەڵەکەی هات کەدەیانویست لەدەست پاسەوانەکە هەڵبێن و دەسگیرنەکرێن)).

دوای زیادبوونی قەبارەی شارەکان، بەکارهێنانی (کێ؟)ی پێشتر نەناسراویش ڕووی لەبەرفراوانییکرد و ئەو کەسانەش کەناویان لەهەواڵەکاندا باس دەکرێ، بەگوێرەی کۆی ژمارەی دانیشتوان بۆ ژمارەیەکی کەمتر لەخەڵك دەناسرێن.

## ٢- چی The What

(چی؟) لە (کێ؟) بەبایەختر دەبێ کاتێك ڕووداوەکە گرنگ بێ، بەبێ ڕەچاوکردنی کەسانی دیاریکراو یان تێوەگلاو یان بەشداربووتیایدا، وەك : —

(( ئەمڕۆ لەئەنجامی بەرپابوونی توندوتیژیدا کەسێك کوژراو لەیەکێکی دیکەش درا، کاتێك مانگرتووان هەوڵی وەستاندنی کارەکانیان دەدا لەکۆمپانیای جۆنسۆن — سیمسدا) لاوە سەرشێتەکە، کەچەقۆیەکی قەسابیی پێ بوو، ئەمڕۆ لەلایەن پۆلیسەوە وەکو گومانلێکراو بەئەنجامدانی دووتاوان لەمیل تاون دەسگیر کرا)).

ئاژانسەکانی هەواڵ بەزۆری هەواڵەکانیان بەم جۆرە دادەڕێژن، ئەمەش لەبەرئەوەی لەدەرەوەی ئەو بازنە بچووك و ڕاستەوخۆیەی کەتیایدا ڕووداوەکە قەوماوە، ناوەکان بایەخێکی ئەو تۆیان نییە. نووسەری هەواڵ دەبێ هەمیشە بڕیار بدات دەربارەی ئەوەی چ ڕەگەزێك گرنگترە: ناوی کەس یان خودی ڕووداوەکە.

ئەو هەواڵەی کەدەربارەی ڕەگەزی (چی؟)یە بەزۆری بە (کێ؟) دەست پێدەکات وەکو ئاسانترین شێوازی ڕەوانبێژی، یان لەپێناوی دووپاتکردنەوەی سەرچاوەدا. لەم نموونەیەی خوارەوەدا تێبینی بکە کەسەرەڕای ئەوەی (کێ؟) لەپێشەوە دێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (چی؟) بەبایەخترە:

((سەرۆك جوزیف ی. جینینگ ئەمڕۆ ڕایگەیاند کە ئەنجومەنی شار توانای بەخشینی خەرجییە هەنووکەییەکانی هەیە، هەرچەندێك بن، ئەمەش سەرەڕای ئەوەی کۆی قەرزەکانی ئەنجومەن لەوەتەی ناوبراو سێ ساڵ لەمەوبەر ئە پلەیەی وەرگرتووە خۆی لە ٥٦٨ دۆلار داوە)).

## لەم نموونەی خوارەوەشدا بەهەڵە ڕەگەزی (چی؟) بە گرنگتر زانراوە:

((ڕۆژی هەینی چەند ڕاپۆرتێك لەبەشی باشووری میل تاون سەبارەت بە شێواندن و تێکدانی چەندین ئۆتۆمبیل گەیشتوون، دوابەدوای گەیشتنی ڕاپۆرتێك سەبارەت بەتێکشکاندنی شووشەی پەنجەرەکانی ئۆتۆمبیلی هەریەکە لە هابرکوت رود و لیساید درایف و ئەلکوت درایف و نورتون رود، جێگری سەرۆکی لێکۆڵەرەوان دەستی بەلێکۆڵینەوەکانی خۆی کردووە)).

لەهەواڵیی ڕووداو و کردەوەکانیشدا خوێنەران بەزۆری بایەخ بەدەرەنجامەکان دەدەن نەوەك ناو، وەك ئەمەی خوارەوە: —

(( سەر لەبەیانی ئەمڕۆ لەڕووداوێکدا دزێکی ئۆتۆمبیل کوژراو دوو دزی دیکە و گەنجێکیش بریندار بوون، گەنجەکە لەکاتی تەقەکردندا بریندار بووە)).

## ٣- بۆچی The Why

لەهەندێك حاڵەتدا هۆکار (نەوەك ئەنجام) دەبێتە سیمای باڵا لەهەواڵدا وەك ئەمەی خوارەوە : –

(( لەکاتی هەوڵدانیدا بۆ تێپەڕبوون لەئۆتۆمبیلێکی کرێ و بەخێراییەکی زۆر، دوێنێ شەو دووکەس زۆر بەتوندی برینداربوون، ئەمەش لەوکاتەدا ڕوویدا کە ئۆتۆمبیلەکەیان لەگۆڕەپانی واشنتۆن لەبوتر ئەفنیودا، دووجار خولی خواردبوو)).

## ٤- کوێ The Where

لەهەواڵە ڕابردووە پەیوەندیدارەکان بەکۆبوونەوە وتار و یاری وەرزشی و ڕووداوەکان و ... تاد دا، دەبێ (کوێ؟)بەوردی دیاریبکرێ، ئەمە جگە لە دیاریکردنی ژمارەی ژوور و ناونیشانی شەقام و ...تاد.

بەڵام لەهەواڵە ناوخۆییەکاندا پێویست ناکات بەبەردەوامی ناوی شار یان ناونیشانی شەقام باس بکرێن، وەك چۆن لەونموونەی خوارەوەدا هاتووە:–

((بەمەبەستی دڵنیابون لەسەلامەتییان، سبەینێ هەشت هێڵی تاقیکردنەوە بۆ پشکنینی ئۆتۆمبیل دەکرێنەوە)) لەوانەشە ڕەگەزی (کوێ؟) گرنگ و بەرچاو بێ وەك: ((لەماڵەکەی خۆیدا کەبۆ ٤٠٠ ساڵ دەگەڕێتەوە، تاقە کچی ژەنەڕاڵێکی ئینگلیزی بوو بەخێزانی قەرەجێك کەوەکو خزمەتکار لەکێڵگەکەدا کاریدەکرد)).

لەهەرچەندە لەو دوو نموونەی خوارەوەدا سەرەڕای ئەوەی (کەی؟) لەپێشەکیدا دێ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (لەکوێ؟) بەڕەگەزی سەرەکیی دەزانرێ: – (پارچە

زەوییەك کەڕوویەرەکەی ٣٠ ئیکترە و دەکەوێتە نێوان فوریست بولیفار و کیرود ئەفنیو، بەبڕی ٩٠هەزار دۆلار فرۆشرایە کۆمپانیای هیرکل ستیل)).

((لەئیمرۆ بەولاوە، لەبەرامبەر بە ٤٠ سنتدا بۆهەر ئۆتۆمبیلێك، ڕێگە بەوەستانی ئۆتۆمبیل دەدرێ لەو گۆڕەپانەی دەکەوێتە بەردەمی هۆڵی پیشانگاکانی نزیك باڵەخانەی شارەوانییەوە)).

کاتێکیش شوێنەکە لەو ناوانە ناسراوتر دەبێ کەپەیوەندییان پێیەوە هەیە، بۆ نووسینی هەواڵەکە دەکرێ ئەم شێوازەی خوارەوە بەکاربهێنرێ:

((ڕۆژی دووشەمە لەبەردەمی دادگای ناوچەدا، خاوەنی دوکانی فرۆشتنی مادە بێهۆشکەرەکان کە دەکەوێتە ٧١٧–شەقامی نۆیەم، دانی نا بەوەی کەبڕێك هیرۆیینی فرۆشتووە کەکێشەکەی ٥ ئۆنسە بووە، ئەو کەسە ناوی ئەندرۆسۆلبیرگە و تەمەنی ٤١ ساڵە، لە١٤١ ئۆك ستریت دەژێت، لەمانگی ڕابردووشدا لەلایەن پۆلیسی بنبڕکردنی مادە بێهۆشکەرەکانەوە دەسگیرکرابوو)).

## ٥- کەی The When

ئەوەی سەبارەت بە (کوێ؟) باسمانکرد، دەکرێ لەسەر (کەی؟) پیادەبکرێ، بەزۆری و بەشێوەیەکی نادیار لەپێشەکیدا دادەنرێ وەك: –

((چوار دز هێرشیان بردە سەر دوو کۆگا لەمیل تاون (سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە) و بەکەلوپەلە دزراوەکانەوە هەڵاتن کەبەهاکەیان بە ٢٣٠ هەزار دۆلار مەزەندەدەکرێ)).

لەهەندێك حاڵەتیشدا دەکرێ (کەی؟) بهێڵرێتەوە و لەبڕگەی دووەمدا دابنرێ وەك:

((ولیەم وایتی کۆمیسیار وەکو حەوتەم کەس لەو لیژنەیەدا دامەزرێنرا کەئەرکی بونیاتنانی نەخۆشخانەی شاری پێ سپێردراوە، دامەزراندنی ئەندامان لەمیانەی ئەو

دانیشتنەدا جێبەجێکرا کەپاش نیوەڕۆی ڕۆژی دووشەممە لەگەڵ کۆمیسیاردا سازکرا)).

دوورخستنەوەی ڕەگەزی (کەی؟) لەبڕگەی یەکەم شێوازێکی ئاساییە لەئاژانسەکانی دەنگوباسدا، بەتایبەتیش لەکاتی ئامادەکردنی هەواڵەکانی ڕۆژێکی دیاریکراودا، لە پێناوی بەکارهێنان لەو ڕۆژنامانەی کەبەیانی ڕۆژی دواتر دەردەچن.

دەکرێ (کەی؟) بابەتی هەمیشە باسلێکراو بێت وەك ئەمەی خوارەوە:

(( هەردوو بەساڵاچووە بووێرەکە، کەبۆماوەی دەڕۆژ بەتەنیا بەیەك پاکەتی بازلا و بڕێك شەربەت و زەرفێکی بچووکی شیری وشککراوە خۆیان ڕاگرت و بەرگریانکرد، دوای ئەو مەینەتی و برسیەتییەی کەدووچاری هاتبوون)) ئێستا لەنەخۆشخانەی میل تاون چارەسەر دەکرێن. هەروەها دەکرێ (کەی؟) لەهەواڵدا ڕەگەزی باڵا دەست و پڕ بایەخ بێ وەك:

((نیوەی ئەم شەو، دوایین وەختە بۆ مۆڵەتی ئەو ئۆتۆمبیلانەی هەڵگری مێژووی ساڵی (١٩٦٨)ن، کاتژمێر دوانزە و یەك خولەکی سبەینێش دەبێ مێژووی ساڵی ١٩٦٩ هەڵبگرن، دوێنێ بەڕێوەبەرایەتی گواستنەوە ئەمەی بەخاوەنی ئەو ئۆتۆمبیلانە ڕاگەیاند)). یەکێك لەنموونەکانی (پێشەکی کێ؟) بریتیە لە پێشەکی زەمەنی بەردەوام وەك ئەمەی خوارەوە:-

(( دوێنێ شەو، دوای مشتومڕێك کەپێنج کاتژمێری خایاند، دادگای باڵا بەتاوانبارکردن وەڵامی ئەو کێشەیەی دایەوە کە تایبەتە بەدزینی پارە و پول لە کۆمپانیایەکی پۆڵادا)).

نموونەیەکی هاوشێوە لەگەڵ پێشەکیی (کەی؟) بریتیە لەپێشەکی (لەوەختێکی دیاریکراودا) یان (دوای تێپەڕینی کاتێکی دیاریکراو) وەك ئەمەی خوارەوە: -

((دوای تێپەڕبوونی دووهەفتەی تەواو بەسەر ڕۆیشتنی(دیوك)ی ئێستردا، بڕیاری گەڕانەوەی دا.بۆ وڵاتی پیشووی و چل میلی بڕی بۆئەوەی بگەڕێتەوە کێڵگەی (تۆمسۆن میریدیت)ی خاوەنە پێشووەکەی)).

## ٦- چۆن The How

وەك پێناسەیەك دەکرێ بوترێ(چۆن؟) مانای درێژەی پێویست دەگەیەنێ بۆ ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی شتێك کەڕوویدا بێ، کاتێکیش ئەو دووروودرێژییە ڕەگەزی سەرەکیی بگرێتە خۆی، دەبێ بەئاگادارییەکی زۆرەوە پیادەبکرێ لەپێناوی دوورکەوتنەوە لەزیادکردنی ژمارەی وشەکاندا.

((مادیسۆن، وایس، ٢٥ی تەمووز – (أ، ب)– ئەمڕۆ لەڕێگەی دابەزینی ناچاری، فڕۆکەیەکی شەڕکەری سەربازیی گەڕایەوە پێگەکەی خۆی، فڕۆکەکە لەکێڵگەیەکی گەنمەشامیدا نیشتەوە و لەناو کێڵگەکەشدا هاتەدەر و ڕێگەی خۆی بڕی، لەنزیك پێگەی تڕۆی ئاسامانیشەوە شەقامێکی ئۆتۆمبیلی بڕی و گەیشتەوە فڕۆکەخانەکەی، ملازم جۆن کیورکلی تەمەن ٢٥ ساڵ (لەمادیسۆن) کەسەرکردەی فڕۆکەکەیە، هیچ ئازارێکی پێ نەگەیشتووەو لەڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ شوێنەکەی خۆی، سۆتۆری فڕۆکەکەی دووچاری گرفت بووتەوەو پاشان بەتەواوی کەوتووە)).

زۆرجار پێشەکیی هەواڵە وەرزشیەکان پێشەکی (چۆن؟) دەبەخشن وەك: –

((سانت پۆل (أ.ب) – بۆبی نیکولز دارە تازەکەی گۆڵفی بەکارهێناو توانی پێنج خاڵی گرنگ لەمینیسوتا گۆڵف کلاسیك تۆماربکات)).

## سێیەم : شێوازەکانی داڕشتن
## Rhetorical Devices

شارەزایی و زیرەکیی بەکارهێنانی شێوازە جۆراوجۆرەکان لەداڕشتندا، وا لە نووسەری هەواڵ دەکات کەڕەگەزی سەرەکیی لەهەواڵدا دەربخات:

### ١- ڕستەی کورتکراوە:

زۆربەی پێشەکیی هەواڵەکان، تەنیا چەند دەربڕین(Statements)ێکی کورتن و ژمارەیەك ڕستەی ئاسایی، یان لێکدراو دەگرنە خۆیان، لەناویاندا بڕگەی سەرەکیی پێشەوە داگیردەکەن، بڕوانە ئەم نموونانەی کە لەم بەشەدا خستمانەڕوو، چۆن لەهەواڵدا دەکرێ ڕەگەزی سەرەکیی بخرێتە ڕوو بەهۆی بەکارهێنانی ئەو شێوازە ئاساییانە لەنووسینی ئاشکرا و ڕاستەوخۆدا؟ وێڕای ئەوەی باسی لێوەکرا، لەم نموونەیەی خوارەوەدا تێبینی بکە: -

((پاسەوانێکی دارستانەکان — ٥٥ ساڵ— کەلەلایەن پۆلیسەوە بەشاردنەوەی چەندین تاوانبار ناسرابو، ڕۆژی چوارشەممە بەکوژراوی دۆزرایەوە)).

## ٢- دەربڕینە مەرجییەکان Conditional Clauses

زۆرجار بەئاستەم دەتوانیٚ ڕەگەزی سەرەکیی لەبڕگەی بنەڕەتیدا دابنریٚ، ئەمەش بەزۆری ئەو کاتانە ڕوودەدات کەئەو ڕەگەزە سەرەکییە لەگەڵ هەزری سەرەکیی هەواڵیدا بوونیان دەبیٚ و نووسەر دەبیٚ لەپیشەکیدا دایبنیٚ، ڕەگەزە سەرەکییەکان کەهاوکات لەگەڵ بارودۆخ و مەرج و ڕێکەوتەکان لەپێشەکی (کەی؟) و (لەکویٚ؟) و هی تردا بەدیدەکریٚن، دەکریٚ بەشێوەیەکی گونجاو بەم جۆرە دەربرخێت: پێشەکی بەڕستەیەکی ئاڵۆز یان ئاڵۆز – لێکدراو – دەست پێبکریٚ، بەمەرجێك بڕگەی مەرجی لەپێشەکیدا دابنریٚ.

لەم نموونانەی خوارەوەدا تێبینی بکە چۆن بڕگەی مەرجی ڕەگەزی سەرەکیی دەگرێتە خۆی، لەکاتێکدا بیرۆکەی سەرەکیی کەهۆکاری بڵاوبوونەوەی هەواڵەکەیە، هیشتا لەدەربڕینی بنەڕەتیدا ماوەتەوە: –

(( پۆل کریگی تەمەن ١٧ساڵ کە هێشتا خوێندکارە لەقوتابخانەی دواناوەندی، بەتاوانی خۆدزینەوە لەبەخشینی کرێی سواربوونی پاپۆڕ دەسگیرکراوە، ناوبراو لە بەشی شوێن گرتنی پێشوەختی ناو کەشتی (Justise) دا دەستگیرکراوەو لەپێناوی خۆڕزگارکردنیشدا هەوڵی سووتاندنی کەشتیەکەی داوە، کریگ ئەمڕۆ لەبەردەمی دەسەڵاتدارانی بەرپرسی کەشتیەکەدا دانی بەمەداناوە)).

ئەمە لەوانەیە زیاتر ببێتە مایەی دەرخستنی ڕەگەزی سەرەکیی لەوەی ئەگەر بڕگەکە پێچەوانە بکەینەوە بەم جۆرە: –

((پۆل کریگی تەمەن ١٧ساڵ کە خوێنکارە لە قوتابخانەیەکی دواناوەندیدا، ئەمڕۆ لێرە، لەبەردەمی بەرپرسانی کەشتیەکدا، دانی بەوەدا نا کەئاگری لە کەشتی (Justise) بەرداوە، بۆئەوەی خۆی ئازادبکات، ئەمەش دوای دەسگیرکردنی ناوبراو دیٚ بەتۆمەتی خۆدزینەوە لەبەخشینی کرێی سواربوونی کەشتیەکە، لەئەنجامیشدا لەبەشی شوێن گرتنی پێش وەختی ناوکەشتیەکدا دەسگیرکراوە)).

## ٣- دەستەواژەکان Phrases

ئەو دەستەواژەیەی کەچاوگ و بەرکار و ئەدمێربڵ و ناوی بکەر ئەو بگرێتە خۆی، دەکرێ بۆ دەرخستنی ڕەگەزی سەرەکیی بەکاربهێنرێ — ئەمەش لەوکاتەدا کەرێك بکەوێ ئەو ڕەگەزە یەکێك بێ لەشەش پرسیارە بەناوبانگەکە، ئەوجۆرە پێکهاتە زمانەوانیانەشدا، برگەی سەرەکیی (کێ؟) و (چی؟) دەگرێتە خۆی، هەروەها لەپێناوی دیارکردنی هەواڵ و بەستنەوەی بەهەواڵە پێشووەکان و بەمەبەستی دەستنیشانکردنی کەس و شوێن و ڕووداوەکان، دەکرێ ڕستەی پێچەوانە بەکار بهێنرێ. لەم نموونانەی خوارەوەدا بەکارهێنانی دەستەواژە تەواوەکان بەمەبەستی جۆراوجۆرەدەردەکەون: —

— (کەی ؟) : دوای لێکۆڵینەوەیەك کەلەلایەن پۆلیس و منداڵانەوە ئەنجام درا و سێ کاتژمێری خایاند، سەرلەبەیانی ڕۆژی چوارشەممە هەر چوار منداڵەکەی جیمس فیلمۆری تەمەن ٣٠ ساڵ لەماڵی دۆستێکی دۆزرانەوە، ڕۆژی یەکشەممە خێزانی فیلمۆر، هەر چوار منداڵەکەی ونکردبوو.

— (کوێ؟): بەئامادەبوونی ژمارەیەکی کەمی کەسوکارەکەی و لەکەناری ڕووباری ڕینگدا، تەرمی فیدرو فلادیك نێژرا، فلادیك لەگۆرانی و شیعرەکانیدا ئەو ڕووبارەی بەناوبانگتر کردبوو.

— ( بۆچی؟):پاش دواکەوتنیان بەهۆی ئاگادارکەرەوە پەیوەندیدارەکان بە گەردەلولەکانەوە، هەفتەی رابردو دەستبەکارکردن بۆ بونیاتنانی بارەگای سەرکردایەتی بەرگری شارستانی کرایەوە.

— (چۆن؟): بەپشت بەستن بەیاسای ساڵی ١٨٦٧ تا ئێستا هیچ یاسایەکی تر شوێنی نەگرتۆتەوە، ئەمڕۆ هنری بوچەر مافی بەخێوکردنی قازی لەباخچەی دواوەی ماڵەکەیدا لە ١٠ — شەقامی شیری لایندا مسۆگەر کرد.

– (بەستنەوە) Tie-Back: سەرەڕای ئەوەی لەڕابردوودا سێ جار شکستی هێناوە، گریس سلوینی تەمەن ٢١ ساڵە سەوزە فرۆش سبەینێ لەدەریاچەی مالیتسا هەوڵی شکاندنی ژمارەیەکی پێوانەیی لەمەلەوانیدا دەدات.

## ٤- پێشەکیی کراوە: The Cartridge Lead

ئەوکاتەی جاڕی شەر دەدرێ یان تەواو دەبێ، یاخود سەرۆك یان کەسایەتیەکی گەورە و ناسراو دەمرێ و لەبۆنەی گرنگی دیکەی لەوجۆرەدا، هەمیشە هەوڵدەدرێ بەکەمترین ژمارەی وشە ناوەڕۆکی هەواڵەکە ڕاگەیەنرێ وەك :-

– گالفانیا شەڕ لەدژی بوارای ڕادەگەیەنێ.

– مردنی پارێزگار شارل برانیشۆ.

ئەو هەواڵانەی بەم شێوازە خێرا و ڕاستەوخۆ و توندە دەنووسرێن، هەناسە دەبڕن، بۆیە دەبێ لەبەکارهێنانی ئەوشێوازەدا زیادەڕۆیی نەکرێ و تەنیا بۆ بۆنە تایبەت و زۆرگرنگەکان هەڵبگیرێ.

## ٥- پێشەکی سرکەرانە The Punch Lead

ئەو پێشەکییەی کەلەڕووی تەقلیدیەوە بە (پێشەکی بەنجکەر یان سرکەر) ناو دەبرێ ئەرکێکی هاوشێوەی ئەرکی پێشەکیی کراوە جێبەجێدەکات، بەلام وەك ئەو کورت و خێرا نییە، هەر لەجەنگی دووەمی جیهانیشەوە بەکارهێنانی ئەم جۆرە پێشەکیانە ڕووی لەزیادبوون کردووە، بەڵکو گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە ڕۆژنامەکان نەك تەنیا لەو هەواڵانەی کە بایەخی هەواڵیی تایبەتیان هەیە لە زۆربەی هەرە زۆری هەواڵەکانیاندا بەکاریاندێنن، بەڵکو ئەم پێشەکییە بە (پێشەکی کوێر (TheBlindLead)یش ناونراوە، بەوپێیەی کەزیاتر هەڵوێست دەردەخات نەك

کەس یان درێژەی دیارکراو، ئەمەش شێوازێکی نووسینە و بەئاسانی دووچاری بەکارهێنانی نابەجێدەبێتەوە لە:

أ- لەو چیرۆکە هەواڵیانەی کەلە گرنگیاندا زێدەڕۆیی کراوە.

ب-لەمیانەی زێدەڕۆیی لەدەستنیشاننەکردن، وەکو نموونەیەکیش بۆ ئەمە:

(( ئەمڕۆ لەکۆنگرێسدا سیاسەتەکان شێوازێکی جیاوازیان هەیە))، لەڕاستیدا ئەو ڕستەیە هیچ شتێك نالێ. هەردوو برگەی دووەم و سێیەمی چیرۆکی هەواڵیی باش داڕێژراو، بەپێی شێوازی پیشەکیی سرکەرانە دەبێ درێژەی وردو دیاریکراو بخەنە ڕوو:

((بەتۆمەتی جێهێشتنی شوێنەکەی خۆی کەدەکەوێتە نزیك چوارڕیانی چەند قوتابخانەیەکەوە، پۆلیسێك لە کار وەستێنرا، پاتریك ئەدریانی سەرۆکی پۆلیس بڕیاری وەستاندنی ئەلبێرت مارکسۆنی تەمەن ٢٧ساڵی پۆلیس (٨٨٥ شەقامی سترونگ ئەمفنیو)ی بۆکاتێکی نادیار دەرکرد، لەڕاپۆرتی ملازم ئیراوالتەرزی بەرپرس لەناوچەکەدا هاتووە کەڕۆژی دووشەممە پشکنینێکی ڕۆتینی ئەنجام دراوە و دەرکەوتووە کەمارکسۆنی پۆلیس لەشوێنی خۆیدانەبووە)).

## ٦- پێشەکیی سەرسوڕهێنەر : The Astonisher Lead

ڕۆژنامەوانە لاوەکان لەبەکارهێنانی ئەو وشە و دەربڕینانە دەترسن کەبۆچوون و لێکدانەوەیەك دەگرنە خۆیان، ئەگەر بارودۆخ گونجاو بێ، دەبێ ئەم جۆرە وشەو دەربڕینانە بەکاربهێنرێن وەك: ((جۆن لۆنگدینی سوارچاك، کەلەهەموو سەردەمەکاندا خاوەنی زۆرترین سەرکەوتنە، بۆ یەکەم جار و بەرامبەر بە ٤٠ هەزار دۆلار، وەکو ڕاهێنەر لەیانەی بیفرلی لەئەرلنکتۆن پارك کاردەکات)).

## چوارەم : بوونی زیاتر لەڕەگەزێکی گرنگ
## More Than One Feature

لەرابردوودا باسی ئەو پێشەکیانەمان کرد کەڕەگەزێکی هەواڵیی گرنگ ودەرکەوتوو دەگرنە خۆیان، بەڵام مومارەسە وکارکردن دووپاتیدەکەنەوە کەهەواڵیی رۆژنامەوانیی لەوانەیە گۆشەی جۆراوجۆری هەبێ، بەجۆرێك ئەو شێوازە دارشتنانەی کەلەو بەشەدا باسمان لێوەکرّدن دەبن بەنەگونجاو، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ئاستەنگانەش چەند رێگەیەکی جۆراوجۆرهەن:-

### ١- هەواڵە سەربەخۆکان Separate Stories

ئاسانترین رێگە ئەوەیە کەزیاتر لەچیرۆکێکی هەواڵیی بنووسیت، چیرۆکی هەواڵیی ئەگەر دیمانە و بابەتی لاوەکی، یان تەوەری هەمە جۆری تیابێ، ئەوا بەزۆری دوو نووسەر یان زیاتر ئەرکی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەیان پێ دەسپێردێ، ئەگەر چیش لەوانەیە هەندێك دووبارەبوونەوە ڕوویدات بەلام ئەمە نابێتە هۆی دابەزاندنی تواناو پەرۆشی ، بگرە لە هەندێك حاڵەتدا زۆر هاندەر دەبێت، لەوانەشە رۆژنامەکە چەند چیرۆکێکی هەواڵیی بەقەڵەمی ژمارەیەك نووسەری جیاواز دەربارەی هەمان ڕوداوبلاو بکاتەوە.

## ٢- پێشەکیی چڕوپڕ : The Crowded Lead

کاتێك ئەو ڕەگەزانەی کەدەبنە مایەی ورووژاندنی سەرنج و بایەخدان، خاوەنی بەهایەکی هەواڵیی یەکسان دەبن، ئەوە دەکرێ ژمارەیەك ڕاستی– واقیع، لەناو یەك پێشەکیدا کۆبکرێتەوە، وەك: (( دوێنێ ئێوارە ، لەمیانەی دانیشتنی هەفتانەی ئەنجوومەنی شاردا، لیژنەکانی کارکردن دیاریکران و گرێبەندی ڕووناککردنەوەی شەقامەکانیش بۆماوەی ساڵێك تازەکرایەوە، پێشنیازێکیش سەبارەت بەمۆڵەتەکانی کارکردن ئاڕاستەی لیژنەی دارایی کرا)). شتێکی ئاساییە هەر برگەیەك لەو برگانەی کەلەدوای ئەو پێشەکییەوە دێن یەکێك لەڕەگەزە ئاماژەپێکراوەکان و تەواوی وردەکاریەکانیان بگرنەخۆیان.

## ٣- شێوازی پێشەکیی هەڵواسراو (پێشەکیی کلکی کراس)

## Shirt Tail Lead

بۆئەوەی خۆت لەپێشەکیە نادیار و چڕوپڕەکان دووربخەیتەوە، دەکرێ تەنیا یەك ڕەگەز دەربخرێ وەك ئەوەی گرنگترین ڕەگەز بێ، ئەو برگانەش کەڕەگەزەکانی دیکە دەگرنەخۆ، لەڕێگەی بەکارهێنانی برگەی وەك ئەمەی خوارەوە پێشبخرێن: –

(( لەلایەکی دیکەو ئەنجوومەنی شار بڕیاریدا ..) یان (( لە هەمان ڕووداویشدا ...)) و ...تاد.

–ئەلدفال غروێر وەکو سەرۆکی لیژنەی دارایی لەئەنجومەنی شاردا هەڵبژێردرا.

–لەو کۆبوونەوەیەدا کەدوێنێ ئێوارە ئەنجوومەن سازیکرد، ناوی سەرۆکەکانی دیکەی لیژنەی هەمیشەیی ئاشکراکران، ئەوانیش ....

–سەبارەت بەڕووناککردنەوەی شەقامەکانیش، ئەنجوومەن بڕیاری لەسەر بەردەوامبوونی کارکردن بۆماوەی ساڵێك بەو گرێبەندەی کەلەگەڵ ریپابلك لایت کۆمپانیادا مۆرکراوە،دا.....

–لەلایەکی دیکەشەوە، ئەنجوومەن پێشنیازی یاسایەکی تازەی سەبارەت بەمۆڵەتی کارکردن، ئاراستەی لیژنەی دارایی کردبو و داواکاریەکەی خاوەنی باڵەخانەکانی (فرۆنت ستریت)یشی ڕەت کردەوە، کەتیایدا داوایان کردبوو بەدرێژایی شەو ئۆتۆمبیلەکانیان لەشەقامەکەدا ڕیز بکەن.

## ٤- چوارچێوەکان (بۆکسەکان) Boxes

ڕوونکردنەوە و خشتە و بابەتە لاوەکییەکان و شتی تری لەوجۆرە، بەزۆری لەنێو چەند چوارچێوەیەکدا بڵاودەکرێنەوە، ئینجا یان دەخرێنە پێش پێشەکی یان لەنێو بابەتی سەرەکیی و ستوونی تەنیشتیدا بڵاودەکرێنەوە، ئەو (چوارچێوانە – بۆکس Box) بریتین لەو بابەتانەی کەلەناو بۆکسێکدا بڵاودەکرێنەوە)، بەچەند شێوازێکی دیکەش بەکاردەهێنرێن و زۆربەیان پەیوەندیان بەڕێکخستن و دەرهێنانەوە هەیە.

**زۆربەی کاتەکانیش ئە بابەتەی کەلەناو بۆکسێکدا دادەنرێ، ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە: -**

أ– لیستی ناوی ئەوانەی لەئەنجامی ڕووداوەکاندا مردوون یان برینداربوون.

ب– ڕستەوبڕگەی بەهێز و ماناداری وتار و ڕاپۆرت و بەڵگەکان و هی تر.

پ– ئامارەکان.

ت– پوختەی ڕووداوەکانی نێو خودی چیرۆکێکی هەواڵیی یان دوو چیرۆکی هەواڵیی پەیوەندیدار یان زیاتر.

پ– کورتەی ڕووداوە پێشووەکان کەپەیوەندییان بە هەواڵەکەوە هەیە.

ج– گۆشە ناوخۆییەکانی ئەو چیرۆکە هەواڵیانەی کە لەلایەن ئاژانسەکانی دەنگوباسی نیشتمانییەوە گوازراونەتەوە.

((پاش ئەوەی داوایان لە ١٢ كرێكار و شەش میوان كرد كەلەسەر زەوی پاڵ بكەون، سێ دزی چەكدار و دەمامكدار، ئەمڕۆ بەیانی دوای كاتژمێر هەشت، توانیان نزیكەی ٧٥ هەزار دۆلار لەخەزێنەكانی بانكی فیرست ناشنال (١٠٩- ماین ستریت) بدزن، پاشان بەهۆی ئۆتۆمبیلێكەوە كە چاوەڕێی دەكردن و هاوكارێكیان لێی دەخوڕی، توانیان ڕابكەن)).

## ڕووداوەكانی دزی لەماوەی دووساڵدا

ئەو دزیەی ئەمڕۆ لەبانكی فیرست ناشناڵ ئەنجام درا، چوارەم ڕووداوەی لەوجۆرە لەمیلتاوندا، لەماوەی دووساڵدا ڕوودەدات ، سێ ڕووداوەكەی تر بەزیان و ئەنجامەكانیانەوە بەم جۆرەبوون:

- ٣ی ئاداری ١٩٦٦، فیرست ناشنال بانك، دوای دەسگیركردنی ئای مایسۆن كەئێستا بۆماوەی دە ساڵ بەندكراوە، توانراو ١٧٤٥١ دۆلار بگێردرێتەوە.
- ٢١ی ئەیلولی ١٩٦٦، میل تاون بانك، دوای ئەوەی لەهەمان ڕۆژدا سەرۆكی پۆلیس توانی لەدووری ٣ میل لە دەرەوەی شار جۆن هایزی دز بكوژێ، ٤١١٥٠دۆلار گێڕدرایەوە.
- ١٥ ی تەمموزی ١٩٦٧ ستیینز ناشنال بانك، لەو ڕوداوەدا ٥٠ هەزار دۆلار دزراوە و تائێستا نەتوانراوە ئەنجامدەرەكەی دەسگیربكرێت.

ولیەم ئاشەری بەرپرسی بەشی خەرجكردن، وەسفێكی وردی ئەو كەسانەی كردووە، وادیارە هەمویان لەخوار تەمەنی ٢٥ ساڵییەوە بوون، بلوزی شینیان لەبەردابووە و كڵاوەكانیشیان هێناوەتە سەرچاویان.

### ٥- پێشەکیی ١-٢-٣-٤ The 1 -2-3-4 Lead

دوای پێشکەشکردنی ڕوونکردنەوەیەکی بەپەلەو کورت دەربارەی ئەو هەڵوێستەی هەواڵ پێکدێنێ، دەکرێ لەڕێگەی خشتە و ژمارەوە ڕەگەزە جۆراو جۆرەکان دەربخرێن، بەم شێوەیەی خوارەوە:-

(( لەمیانەی کۆبوونەوەی دوێنێ ئێوارەیدا، ئەنجومەنی تازەی شار ویست و خواستەکانی لویس تویری پارێزگاری دەربارەی زۆربابەت کەخرانە دەنگدان، وەلاوەنا، هەروەها ئەنجوومەن چەند کارێکی گرنگی دیکەی ئەنجام دا لەوانە: -

أ- هەڵبژاردنی ئەلدفال غرویری ڕکابەری سیاسیی پارێزگار وەکو سەرۆکی لیژنەی دارایی.

ب- پێشنیازی یاسایەکی تازە دەربارەی مۆڵەتی کارکردن ئاڕاستەی لیژنەیەک کرا کەئەلدفال غرویر سەرپەرشتی دەکات، لەلایەن خۆشیەوە پارێزگار ئەو یاسا تازە پێشنیازکراوەی بەناپێویست وەسفکرد.

پ- درێژکردنەوەی ماوەی کارکردن بەگرێبەندی ڕووناککردنەوەی شەقامەکان بۆماوەی ساڵێك لەگەڵ کۆمپانیای ریپابلك لایتدا، پارێزگاریش لەمیانەی چەند وتارێکدا کەلە مانگی ڕابردوودا پێشکەشی کردن دژایەتی خۆی بۆ تازەکردنەوەی گرێبەندەکە ڕاگەیاند.

ت- ڕەتکردنەوەی ئەو داواکارییەی کەخاوەنی باڵەخانەکانی فرۆنت ستریت دەربارەی ڕێگەدان بەوەستاندنی ئۆتۆمبیل لەشەقامەکەدا پێشکەشیان کردبوون.

پێشەکی ڕابردوو، بێگومان پێشەکییەکی شرۆڤەکارییە و مەبەست و ناوەڕۆك و گرنگی بڕیارەکانی ئەنجومەن دەردەخات و تەنیا بریتی نییە لەگواستنەوەیان، جگە لەوە هیچ جۆرە هەڵوێستێکی بەرامبەر بەبڕیارەکانی ئەنجومەن وەرنەگرتووە.

هەواڵەکە وەك داڕێژراوە، ناڵێت هەرچوار بڕیارە کە ئەنجوومەن دەریکردوون ئاماژە بەهەڵوێستی دوژمنکارانەی ئەنجومەن دەکەن بەرامبەر بەپارێزگار،

لەهەمانکاتدا، دارشتنی هەواڵ بەم شێوەیە، بێگومان بەشێوەیەك لەشێوەکان ئەو ڕاستیە دەردەخات. ئەنجومەنیش ئەگەر لەدانیشتنێکی داهاتوودا دەنگ بۆ بەرژەوەندی ژمارەیەك ڕێوشوێن بدات کەپێشتر پارێزگار وەستاندوونی، بەلام ڕووداوەکان وەك چۆن لەچیرۆکی هەواڵیی یەکەمدا بلاوکراونەتەوە، زۆروردن، بۆیە ناتوانیٚ ڕۆژنامەوانەکە بەڕەنگاو ڕەنگکردنی هەواڵەکەی تۆمەتبار بکریٚ، بێگومان ڕۆژنامەوان چەند زانیارییەکی پاشکۆی خستۆتە بەردەم خوێنەران، وایان لێدەکات بگەنە دەرەنجامی دیاریکراو، بەلام ڕاپۆرتێکی دوور لە بڕیارەکانی ئەنجومەنی شار و هەوڵ نەدان بۆ دیتنی لە هیچ دیدگایەکەوە لەوانە بوو هەستێکی هەڵەی بەخشیبایە.

لەپێناوی نووسینی هەواڵ بەم شێوەیەدا، دەبیٚ جەخت لەسەر گرنگیی زانین و شارەزایی بکریٚ، چونکە بەبیٚ ئەو دوو چەمکە، پەیامنێر ئەو شتە زۆر کۆنە بەشتێکی تازە دەزانیٚ، هەروەها دەبێتە خاوەنی چەندین سەرچاوەی هەواڵ و ئەو زانیارییانەی بۆ ئاشکرا دەکەن کەلەنێو نێوەندەکانی بازنەیەکی بەرفراوانی خوێنەراندا دیارن.

بەواتایەکی دیکە، تۆ ناتوانیت ڕەگەزێکی هەواڵیی گرنگ دەربخەیت ئەگەر شارەزانەبیت لەهەڵبژاردن و وەرگرتن و جیاکردنەوە و گرتنیدا.

# دارشتنێکی سەرنجڕاکێشانە بۆ چیرۆکێکی هەواڵیی
# Making it Attractive

١- تەوەرێکی هەواڵیی
٢- پێشەکیی نالێکچووانە
٣- پێشەکیی پرسیاریانە
٤- پێشەکیی وەسفییانە.
٥- پێشەکیی پچڕکراو
٦- پێشەکیی هێمایی
٧- پێشەکیی پەندئامێز
٨- پێشەکی ئاماژەی ئەدەبی
٩- پێشەکی لاسایکردنەوەی گاڵتەجاڕییانە
١٠- پێشەکی وەرگیراو (کۆتەیشن)
١١- پێشەکیی گفتوگۆکارانە
١٢- پێشەکیی کەڵەکەبووانە
١٣- بایەخدانێکی دواخراو
١٤- بەدواییەکدا هاتن
١٥- وتارێکی ڕاستەوخۆ
١٦- پێشەکیی ویستراو یان ئارەزوومەندانە

ئەگەر بەشی یەكەمی چیرۆكی هەواڵیی وەڵامی ژمارەی پێویستی شەش پرسیارەكە بداتەوە (بڕوانە بەشی سێیەم) و ئە پرسیارەش كەلە چیرۆكدا بەڕەگەزی هەرە گرنگ و دەركەوتوو دەزانرێ دووپات و دەرخستنێكی گونجاوی پێ بدرێ (بڕوانە بەشی چوارەم)، ئەو وەختە پێشەكییەكە باش دەبێ. بەڵام ئەگەر (سەرەڕای ئەوەی كەلەپێشەوە باسی لێوەكرا)، سەرەتای چیرۆكی هەواڵیی بەشێوەیەكی بەجێ و سەرنج ڕاكێش نووسرابێ، بەجۆرێك پاڵ بەخوێنەرەوە بنێ لەبەرئەو هۆكارە درێژە بەخوێندنەوە بدات، بێگومان ئەو وەختە پێشەكی نایاب دەبێ. هیچ خوێنەرێك نییە بایەخ بەزۆربەی هەواڵە بڵاوكراوەكان بدات لەیەك ژمارەی ڕۆژنامەیەكدا، بۆیە ئەرك و ئامانجی ناونیشانەكانئاراستەكردنی ئەو خوێنەرەیە بۆ ئەو چیرۆكە هەواڵییانەی كەبایەخیان پێدەدات. پێشەكیی هەواڵێش پشتگیریی لەناونیشان دەكات و بۆی زیاد دەكات، هەربۆیە بۆ توێژێكی گەورەی ئەو خوێنەرانەی كەلە خوێندنەوەی هەواڵدا دەگەنە ئەو ئاستە ئەمە پڕبەپێستی خۆیەتی.

سەرەڕای ئەوەش، هەموو چیرۆكێكی هەواڵیی بۆ ژمارەیەكی كەمی خوێنەران نووسراون و داڕێژراون و لێكدراون، واتە ئەوانەی تاكۆتایی درێژە بەخوێندنەوەیان دەدەن.

هەریەكە لەناوەڕۆك و ئەو شێوازەش كەپێی نووسراوە، فاكتەری بنەڕەتین و هەرئەوانیش تیایدا بەهاوئاستی بایەخ و سەرنج ڕاكێشان دیاریدەكەن، بەڵام لەبەشی دووەمی چیرۆكی هەواڵیدا، دووپاتكردنەوە دەكەوێتە سەر چۆنیەتی دەستەبەركردنی دوورودرێژەی (التفاصیل) تەواو لەپرۆسەی كۆكرنەوەی زانیارییە پەیوەندیدارەكان بەكۆمەڵێك ڕووداوی هەمە جۆرەوە.

ئامانجی ئەم بەشە بریتیە لە پێشكەشكردنی دەستی یارمەتی بەنووسەر لەپێناوی باشترین داڕشتنی هەواڵدا بەبێ لەدەستدانی سەرنج ڕاكێشان،

نموونەکانیش ڕوونیدەکەنەوە کەجەختکردنەوە یان تێڕوانین چۆن چەند شێوازێکی سەرەتایی بۆ شرۆڤەکردن بە هەواڵێکی دیارکراو دەبەخشن.

## تەوەرێکی هەواڵیی The News Peg

کاتێك پێشەکیی هەواڵ بەگوێرەی شێوازی دەرخستنی ڕەگەزی سەرەکیی یان هەر شێوازێکی دیکەی هاوشێوە دەنووسرێ، ئەمەش چ بەمەبەستی دەرخستنی ئەو ڕەگەزە سەرەکیی و گرنگەبێت یان بەمەبەستی وەدیهێنانی سەرنج ڕاکێشیی ڕەوانبێژی و زمانەوانیی، لێرەوە ئەو بەشەی کرۆکێکی هەواڵ یان زیاتر دەگرێتە خۆی کەپەیوەندی بەو ڕووداوە هەیە کە دەبێتە بیانوو بۆ بوونی هەواڵ، ئەو بەشە بەتەوەری هەواڵیی (خاڵ، ڕەگەزی سەرەکیی The News Peg) ناودەبرێ، بەڵام ئەو پلە یان سنوورەی کەدەکرێ بەلاوەکیی یان یارمەتیدەری ڕەگەز دابنرێ، دەوەستێتەوە سەر گرنگییەکەی، ئەگەر خاوەنی گرنگییەکی گشتیی و ژیاریی و یەکلاکەرەوە بێ، ئەوا دەبێ وەکو پێویست دەربخرێ. لەلایەکی دیکەوە ئەگەر بایەخدان بەڕەگەزی سەرەکیی لەهەواڵدا لەڕووی گرنگییەوە (وەکو زانیاریی گشتیی) بەسەریدا زاڵ بێ، ئەو کاتە تەوەری هەواڵیی لەوانەیە پاشەکشە بکات. لەو نموونانەی خوارەوەدا، ئەگەر چی بەپێی شێوازی دەرخستنی ڕەگەزی بایەخدار چارەسەر کراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەوەرە هەواڵییەکان لەپێشەکییەکاندا هاتوون: -

(( دوای پۆشتەکردنی هەرسێ کچە بچووکەکەی وبردنیان بۆ کڵێسا، پاشان (تەعمید) کردنیان، دوێنێ خاتوو نورا مەکماهون گەڕایەوە ماڵەکەی لە بانفیل و هەرسێکیانی کوشت)).

(( پۆلیسی ناوچەی میل تاون لە پێشبڕكێ دایە لەگەڵ مردندا — لەوانەشە دواكەوتبێ — لەگەڕانی چڕوپڕیدا بەدوای هارۆڵد و نرمنی تەمەن ٥٨ ساڵدا.

پۆلیس دەزانێ چی بەخەیاڵی ناویراودا دەخولێتەوە — خۆ كوشتن، بۆ ڕێگەگرتنیش لەوەی دەیەوێ ئەنجامی بدات، پۆلیس هیوادارە لەكاتی گونجاودا بیدۆزێتەوە، نرمن بەڕێوەبەری سندووقی گرووپی گریست وودە و ماوەی هەفتەیەكە دیارنەماوە.

## ٢- پێشەكیی ناڵێكچووانە The Contrast Lead

ڕەگەز (سیما — ڕەگەزی باڵا The Feature)ی گرنگ لەهەواڵدا لەو ناڵێكچوونەدا كەلەنێوان هەڵوێستی هەنووكەیی و ڕابردود یان لەنێوان ڕووداوی هەنووكەیی و ڕووداوێكی دیكەدا بەدیدەكرێ و هەر هۆكارێك لەهۆكارەكان هێشتا لە خەیاڵداماوە. لەو پێشەكیەی خوارەوەدا تێبینی بكە كەتەوەری هەواڵی چۆن پارێزراوە، ئەگەر چی ئەمە وەك پێویست دیاریكراو نییە و جەختیش لەسەر هەڵوێستی نائاسایی كراوەتەوە: ((لەپاش ئەو مێزەی كەلە داری گوێز دروست كراوە، ئەو مێزەی كەماوەی ٢٥ ساڵە هەموو ڕۆژێك ڕاهاتووە لەسەر پاككردنەوەی، دوێنێ فیرجل ستیمسۆن بەبۆنەی دامەزراندنی بەپلەی سەرۆكی كۆمپانیای تراكننگەوە، پیرۆزبایی لێكرا)).

## ٣- پێشەكیی پرسیاریانە The Question Lead

واباوە كەپەیامنێری ڕۆژنامەوانیی لەهەواڵەكانیدا وەڵامی پرسیارەكان بداتەوە، نەوەكو پرسیار بكات، ئەگەر ئەمەشی كرد و پرسیاری وروژاند، ئەوكاتە پێشكەشكردنی هەواڵ دوا دەخات، وەك ئەو پێشەكیەی كەبە ((چی دەبێتە هۆی

لاساری؟)) دەست پێدەکات، بەدواشیدا پوختەی ئەو بیرۆکە هەواڵییە دێت کەلەسەرچاوەیەکەوە دەسگیرکراوە، وابەباشتر دەزانرێ کەسەرەتا بەم جۆرە بێ:

(( سەرنەکەوتنی هەرزەکاران لەدەستکەوتنی کار، دووچاری لاسارییان دەکاتەوە، بەپێی بۆچوونی ...)).

کەهەواڵ پەیوەندی بەکێشەیەکەوە هەبێ مایەی سەرنجی ڕای گشتیی بێت، یان گرێدراوی گرفتێك بێ و لەوانەبێ ببێتە مایەی وروژاندنی مشتومڕ لەنێو خوێنەراندا ، ئەو وەختە دەکرێ لەڕێگەی بەکارهێنانی پێشەکیی پرسیاریانەوە ڕەگەزی بەتاسەوەبوون و وروژاندنی بایەخ بەدیبهێنرێ، وەك ئەمەی خوارەوە:

- دەبێ هەستی مرۆڤ چۆن بێت کەزیندەبەچاڵ دەکرێ؟ ئێدوارد تیرنەری تەمەن ٢٧ ساڵ کەدانیشتووی ٥٤١ - شەقامی گرنە دەتوانێ پێت بڵێ، چونکە دوێنێ خۆی بۆ خۆی لەو ئەزموونەدا ژیاوە، کاتێك لەپرۆژەیەکی نیشتەجێکردندا لەشەقامی هارمۆن، زەوی شەقی برد و قوتیدا.

- چیدر - بەریتانیا - (ی.ب.أ) - پیاوێك چی دەڵێ کەبزانێ ژمارەیەکی پێوانەیی لەبەرگەگرتنی ژیانی لەژێر زەویدا شکاندووە؟

((خودا خێری گۆرەوەییە لۆکەکەییە بچووکەکانم بنووسێ. کارەکەم بەئەنجام گەیاند!))، دیڤید لاڤیریی تەمەن ٢٨ ساڵ لە ئەشکەوتێکدا لەقووڵایی ٤٠٠ مەتر لەژێر ڕووی زەوییەوە بەم جۆرە هاواری کرد.

## ٤- پێشەکیی وەسفییان The Descriptive Lead

لەوانەیە دەوروبەر (شوێن، بارودۆخ Sitting) یان ڕووکەشی فیزویۆلۆژیی کەسێك یان شتێکی پەیوەندیدار بەڕووداو، یان لایەنی نائاسایی ئەو ڕووداوەی کەچیرۆکەکەی لەبارەوە دەخولێتەوە، ببنە کلیلی چیرۆکێکی هەواڵیی - یان ڕەگەز یان (سیما)ی سەرەکیی لەو جۆرەحاڵەتانەشدا پێشەکیی وەسفی دەکرێ بەهێز و

كاریگەرتر بێ لە بەخشینی شێوەزار (ئاواز، پلە، شێواز Tone) یان كاردانەوە یاخود هەستی پێویست. لەپێناوی تێگەیشتنی هەڵوێست و هەڵسەنگاندنی بەهاكەیدا. پەیامنێری ڕۆژنامەوانیش بەرلەوەی توانای وەسفكردنی هەبێ، دەبێ بزانێ چۆن چاودێری و تێبینی دەكات، باشترین پێشەكییە وەسفییەكان ئەوانەن كەشایەتحاڵەكان دەینووسن، هەروەها دەبێ لەوەسف و سیفەتە زیادەكان خۆ دووربخرێتەوە، چونكە ئەوانە هیچ سوودێكیان نییە و بەتەنیا بەڵگەن بۆئەوەی پەیامنێر خاوەنی ژمارەیەك وشەو برگەی وشك و چوارچێوەدارە و هیچی تر.

### ئەمانەی خوارەوە پێشەكیی چەند هەواڵێكی گرنگن، كەخۆیان لەو هەولانە دورگرتووە:-

- پێش نیوەشەو، تەقەكردن هێمنیی شەقامی میل تاونی شكاند، لەكاتی وەستانیشدا لاوێك بەكوژراوی دۆزرایەوە.
- ئەمڕۆ بۆماوەی زیاتر لەخولەكێك، خۆر وەكو جوانكاری بریقەداری جەژنی لەدایكبوون، بەسەر ناوەڕاستی مینیسوتاوە دیارنەما ، ئەمە لەكاتێكدا مانگ لەنێوان خۆر و زەویدا ئۆقرەی گرتبوو.
- لەنێو ئەو ڕووناكییە لاواز و ترسناكەداكە ناوچەكەی داپۆشی، سەدان زانا و هەزاران كەسیتر توانیان دیمەنی تەواوی خۆرگیران ببینن.

The New York Times

### ٥- پێشەكیی پچڕپچڕكراو: The Staccato Lead

ڕەگەزی كات لەحاڵەتی ڕووداوێكی بەپەلەدا یان چەند ماوەیەكی زۆر كورت كەدەكەونە نێوان زنجیرەیەكی پێكەوە بەستراوی ڕووداوەكان و لەیەكیان دادەبڕن ئەو ڕەگەزە سەرەكییە كەدەبێ جەختی لەسەر بكرێ و دەربخرێ — ئەو كاتە

پێشەكیی پچڕاو (نووسینی پچڕاو كە شێوازێكی دەربڕینەو بەپچڕپچڕی و نەبوونی یەكپارچەیی دەناسرێ) گونجاوەو وەكو پێویست دەبێ. ئەو پێشەكییەش زنجیرەیەك برگەی پچڕپچڕ، یان بۆشایی دەگرێتە خۆی، بەزۆریش دەبێتە شێوازێك لەشێوازەكانی پێشەكیی وەسفیانە.

- هانۆڤەر - ٢٣ ی حوزەیران: دەنگە دەنگێگ كە گوێی كەڕدەكرد، پاشانیش زنجیرەیەك تەقینەوەی بەدواداهات و دوكەڵێكی چڕۆ پڕیش بەرزبووەوە و گڕێكی پێچاوپێچی دوكەڵیی ڕەش بەری ئاسمانی گرتو دواتر وردە وردە ڕووی لەسپیەتی كرد، بەهۆی خێرایی و پەلەكردنیشەوە جووڵەیەكی نادیار بەدیدەكرا.

خەیاڵی چاودێر بەم جۆرە دیمەنی سووتانی كارگەی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبیلی ئۆپڵی لەوشارەدا تۆماركردووە.

- ٣٠ ساڵە - واتە لەساڵی ١٩٣٨ - و لەناوچە و ژیانێكی دیكەدا، پاش ٤٠ ساڵ لەخۆشیی، ڕووناكی لەهەردووچاوی خاتو هانی دواتز لەگریكۆری فیل كوژایەوە و بوو بەنابینا، نابینایەكی تەواو، ساڵان تێپەڕین - ٣٠ ساڵی دوورودرێژ و پڕ غەم بەرێكران- لەپڕێكدا وەڵامی نوێژەكانی درایەوەو هەردوو چاوی خاتوو هانی دواتز چاكبوونەوە و ئێستا دەتوانێ هەموو شتێك ببینێ.

## ٦- پێشەكیی هێمایی (خوازەیی وێنەیی) The Figurative Lead

لەكاتی بەكارهێنانی (خواستن) و (لێكچواندن) و شێواز و وێنەی دیكەی لەو جۆرەدا، دەبێ بەپێی توانا هەوڵ بدرێ خۆمان لە بەكارهێنانی وشەو برگەی سواو دوربخەینەوە، ئینجا چ لە پێشەكی یان لەهەر بەشێكی دیكەی هەواڵدا بێ، بەهۆی زۆر بەكارهێنانەوە، زۆر جۆری دەربڕین هەن بڵاوەیانكردووە، بەجۆرێك وای لێهاتووە خوێنەر بەئاستەم وەك هێما یان خوازە تێبینیان دەكات، لەوانە: -

– ئامانجێکی کەسی هەیە و بۆ وەدیهێنانی تێدەکۆشێ یان ناچاری دەکات بایەخ بەشتەکە بدات– Ax to Grind.

– پێڵاوێك لەپێیەکی ناگونجاودا.

– عەرەبانەکەی بەئەستێرەکانەوە بەستەوە.

– هەموو هێلکەکانی لەناو یەك سەبەتەدا داناوە.

نووسەر ئەگەر بتوانێ بەشێوەیەکی ئاسایی و بەبێ مەبەست و تەنانەت ئەگەر گوێ بەسروشتی هێمایی و خوازەییان نەدات، ئەو دەربڕینانە بەکاربهێنێ، ئەنجامەکەی کاریگەری تر دەبێ لەوەی هەوڵ بدات بەئەنقەست بگاتە هەمان ئەنجام:

– واشنتۆن – ٢٧ی تەمووز (أ . ب) – سوپا چەند دانێك بۆ ڕێنماییەکانی وەزارەتی تازەی بەرگری دادەنی، ئەو وەزارەتەی ڕێگەی بە بەرپرسی ڕاگەیاندنەکەی داوە کەهەمیشە ئەنگوستیلەیەك (تەنیا بۆ بەکارهێنانی کەسی بەکاربهێنێ).

## ٧- پێشەکیی پەندئامێز The Epigram Lead

هەروەها دەکرێ شێوەزار و مەبەستی چیرۆکێکی هەواڵیی لەڕێگەی بەکارهێنانی پێشەکییەکەوە دەربخرێ کە پەند یان وتەیەکی نەستەقی تێدا بێ، لەگەڵ پێویستی دوورکەوتنەوە لەبەکارهێنانی بیرۆکە و تێبینییە بێمانا و سواوەکاندا. پەند دەربڕینێکی ورد و دیارکراوە و بەزۆری زیرەکیی لەدواوەیە، ئەو جۆرە پێشەکییەش دەکرێ بریتی بێ لەوتەیەکی بەناوبانگ یان بیرۆکەیەکی گونجاو لەگەڵ ئەو هەواڵەدا کە دەنووسرێ وەك:

(( لەوانەیە بەزیاتر لەشێوازێك بێدەنگی وەك زێر وابێ، تۆمی جاكوبی نیشتەجێی شاری ماروتز ئەمەی ئاشكرا كرد كاتێك لە ١٢ی ئابدا سێ جار هەوڵی تۆماركردنی خاڵی لەدژی برستولدا، جاكوب گازاندەی لەپۆل جۆنسۆنی بەڕێوەبەری تیمەكە كرد بەوەی ئەو بۆتە قوربانی چەند بڕیارێكی تۆماركردن كەمایەی مشتومڕكردنن)).

جۆنسۆن گوتی: كێشەی تۆ ئەوەیە كەكاتێكی دوورودرێژ بەگەڕان و سووڕانەوەدا بەسەر دەبەیت، بەجۆرێك وات لێ دێت ئامادەی لێدانی تۆپەكە نابیت، تەنیا بۆ چێژ وەرگرتن مەڕوانە ئەملاوئەولا و بۆ هەر هۆكارێك تەنیا بڕوانە ناوبژیوان و بەتەنیا جەخت لەسەر لێدانی تۆپەكە بكەرەوە، تۆمی ئەو وتانەی لەگوێ گرت و ئەم ژمارە پێوانییەی خوارەوەی شكاندا...)).

### ٨- پێشەكیی ئاماژەی ئەدەبی:

### The Literary Allusion Lead

ئەو نووسەرەی خاوەنی باگراوندێكی ئاسایی بێ لەئەدەب یان لەمێژوودا، كات ناكاتێك دەرفەتی سوودوەرگرتنی لەو باگراوندە بۆ ڕێكدەكەوێ، بەڵام دەبێ زۆربەوردی ئاماژە بۆ كەسایەتییە خەیاڵی یان مێژوویی یان كارە ئەدەبییە ناسراوەكان بكات، بەتایبەتیش بۆخوێنەری ئاسایی — ناوەڕاست، ئەم نموونەیەی خوارەوە ئەوە دەردەخات كەپەیامنێری ڕۆژنامەوانیی چۆن بەشێوەیەكی كاریگەرانە زانیاریی گشتیی خۆی بۆ چاككردنی نووسین و بەرزكردنەوەی ئاستەكانیان بەكار دەهێنێ:

— ئەو شۆفێرەی پێی وابوو ڕۆڵی سامورای خێرمەند دەنوێنێ، ئەمڕۆ خەریك بوو بخرێتە بەندیخانەوە، چونكە یارمەتی تاوانبارێكی داوە بۆ هەڵاتن.

## ٩- پێشەکیی لاسایکردنەوەی گاڵتەجارییانە The ParodyLead

وشەی گۆرانی و وتە بەناوبانگ و بڵاوەکانی کەسانی دیار وناونیشانی کتێب و فیلم و هەر دەربڕینێکی دیکەی تازە، دەکرێ هەموویان بەشێوازێکی لاسایکردنەوەی گاڵتە جارییانە لاساییکردنەوەی گاڵتەجارییانەی (لاسایکردنەوەی گاڵتەجارییانەی یەکێك لە نووسەرەکان (PParody)، لەپێناوی پێشەکیی چیرۆکێکی هەواڵیی گەشتردا، بەکاربهێنرێن.

**ئەم نموونانەی خوارەوە خۆیان لەمەترسی بەکارهێنانی شتی سواو دوور دەگرن:**

– شارل کیلەری ئەکتەر دەڵێ، تۆ ناتوانیت لەگەڵ خۆتی ببەیت، چونکە بەرلەتۆ حکومەت بردوویەتی، ڕۆژی سێ شەممە کیلەری ئەکتەری شانۆ و سینەمایی تەمەن ٧٧ ساڵ بەئاشکرایی داوای لادانی باجە ئیتحادییەکانی کرد.

– شیریدان – ٢٩ی کانوونی دووەم – لەوانەیە یەکێك لە حاڵەتەکانی بێ ئاوی ئەوە بێت کە دڵ بەگوڕتر دەکات، بەڵام دانیشتوانی شاری ومینگی باکور، بەدڵسۆزییەوە بانگەشەی یارمەتیدانی زەرەرمەندانی لافاوی ڕووباری ئۆهایو و ریڤر فالییان بەجێ هێنا.

## ١٠- پێشەکیی وەرگیراو The Quotation Lead

لەکاتی گواستنەوەو ڕووماڵکردنی وتار و ڕاگەیاندن و شتی تری لەوبابەتەدا، واباشترە لەڕێگەی وشە تایبەتییەکانی پەیامنێری ڕۆنامەوانییەوە ناوەڕۆك و شتی

بنەڕەتیی ناو وتار یان ڕاگەیاندنەكان كورتبكرێنەوە، نەوەك وەرگرتنی ڕاستەوخۆ لەوشەكانی وتارخوێن یان ڕاگەیەنەرەكەوە.

## لاواز:

دابەزینی بەرچاوی ڕێژەی مردنی دایكان و پێشكەوتنی بواری پزیشكیی و هاتنەكایەی گەشەی ئابووریی، ئەمانە وایان لەدامودەزگاكانی خزمەتگوزاریی كۆمەڵایەتیی كردووە كەزۆربەی كێشەكانی چارەسەر بكات، جگە لە گرفتی ناسەقامگیریی سۆزداریی منداڵان ، هوراس ئیبدایكی بەڕێوەبەری دەستەی خزمەتگوزرایی كۆمەڵایەتیی ئەمەی ڕاگەیاند.

## بەهێز:

كێشەی ناسەقامگیریی سۆزداریی منداڵان، گرفتی ژمارە(١)ە كەڕووبەڕووی دامودەزگاكانی خزمەتگوزاریی كۆمەڵایەتیی دەبێتەوە، دوێنێ هوراس ئیبدایكی بەڕێوەبەری دەستەی خزمەتگوزاریی كۆمەڵایەتیی ئەمەی دووپاتكردەوە.

لەهەندێك حاڵەتیشدا وا كاریگەرترە ئەو هەواڵانەی وەك ڕاپۆرت دەربارەی وتار یان بەڵگەنامەن بەوەرگرتنێكی ڕاستەوخۆ دەستپێبكەن، بەم جۆرەی خوارەوە:

– ..تەنیا ویستم شتێكی نابەجێ ئەنجام بدەم..

ئەمە (وەك سەرچاوەكانی پۆلیس باسی لێوەدەكەن) ئەو تاكە ڕوونكردنەوەیەیە كەواڵتەر مالیی تەمەن ١٧ ساڵ پێشكەشی كردووە بەرامبەر بەتەقەكردن لەدوو كچ و بریندارکردنیان لەبۆسەیەكدا كەلەناوچەیەكی پڕدارو درەختدا بۆی نابوونەوە .

– " لەكاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەكەتدا لەشەقامە گشتیەكاندا، تووڕە مەبە".

ئەم ڕێنماییە ئاڕاستەی ئەو کەسانەکراوە کەدەیانەوێ بە زیندوویی بمێننەوە، سەرەڕای ئەوەی لەقەرەباڵغیی ڕۆژانی کارکردندا ئۆتۆمبێلەکانیان لێدەخوڕن. ڕێنماییەکە لەلایەن فرانسیس کادای تەمەن ١٨ ساڵەوە پێشکەشکراوە، ناوبراو هەلگری خەلاتی باشترین شۆفێری هەرزەکارانە لەمیل تاوندا. ئەو پێشەکییەی خوارەوەش لەلایەن ٣٧ مامۆستای ڕۆژنامەوانیی و ٣٢ نووسەری هەواڵەکانی شارەوە بەباشترین پێشەکی دانراوە: (( بۆئەوەی لەبواری ڕۆژنامەگەرییدا پێشبکەون، دەبێ کەمێك زیاتر ئەنجام بدەن لەوەی خەلك لێتانی چاوەڕواندەکەن)).

ئەمە ئەو ڕێنماییە کە ئەمرۆ ڕۆن شیفەری جێگری سەرنووسەری ( Lantern Spring) ئاڕاستەی خوێندکارانی تازەی بواری ڕۆژنامەگەریی کرد.

هەروەها شیفر گوتی:

"لەوانەیە بیر بکەنەوە وێلم کە هیچ کەس تێبینی کاری زیادە (اضافي) ناکات، بەلام لە ڕاستیدا ئەوان ئاگادارن"

وەرگرتنی برگە برگەی پارچە پارچە، بە زۆری دەکرێ بۆ زیادکردنی ڕاستگۆییو متمانە بەکار بهێنرێ، بەمەرجێك ئەمە نەبێتە مایەی ئالۆزیی و زەحمەتخستنەسەر پێشەکی، ئەمەش وەك: ئەمرۆ کریسودی دادوەری ناوچە ئەوەی ڕەتکردەوە کە دەستی لە هەلوەشاندنەوەی مۆلەتی بەخشینی خواردنەوە بێهۆشکەرەکاندا هەبوو بێ بە سالۆنێك کە لە ماوەی ئەو سالەدا پێنج جار لەلایەن پۆلیسەوە گەمارۆدراوەو وتی: "چۆن خۆم لەو مەسەلەیە هەلدەقورتێنم".

### ١١-پێشەکیی گفتوگۆکاران دایەلۆگ The Dialogue Lead

زۆر ئاستەمە – ئەگەر مەحال نەبێ– چیرۆکێکی هەوالیی جیدیی سەبارەت بەڕووداوێکی گرنگ بە دایەلۆگ دەستپێ بکات، لە کاتێکدا هەواڵە کورتەکان،

ئەوانەی پەیوەندییان بە دادگاکارییەوە هەبێ، یان هەواڵە مرۆییە بەهێزەکان، هەندێك جاریش ئەو هەواڵانەی کە گرنگیی زۆریان هەیە، دەکرێ لە ڕێگەی بەکارهێنانی پێشەکیی گفتوگۆکارانەوەو بەشێوازێکی کاریگەرانە دابڕێژرێن، وەك ئەمەی خوارەوە: هازل مولەری تەمەن ٢٢ ساڵ (١٨٦٤ – شەقامی باین ئەفنیۆ) پرسیاری کرد "ئاخۆ مایەی ترس نییە ئەگەر لەو ژێر زەمینەدا بەند بکرێمو ڕێگەی هاتنە دەرەوەم نەدرێ؟"

تۆماس کای بەڕێوەبەری بەرهەمهێنان لە کۆمپانیای ماجستیك فلۆندری –١٤ شەقامی بیلمۆنت ئەفنیە– کە خاتوو مولەر سکرتێرەکەیەتی وەلامی دایەوە: "ئەمە ڕوونادات".

بەڵام ڕۆژی سێ شەممە شتێکی لەو جۆرە ڕوویداو بەڕاستی مایەی مەترسییە، ئەمەی خوارەوەش ڕاپۆرتێکی دوورودرێژە دەربارەی ڕووداوەکە......

### ١٢-پێشەکیی کەڵەکەبووانە –کۆکردنەوە Cumulative Lead

زۆربەی نموونەکان کە پێشتر خرانەڕوو، چەند پێشەکییەك بوون بۆ ژمارەیەك چیرۆکی هەواڵیی دانراون، بە مەرجێك لەگەڵ ئەو ڕێسا گشتیەدا بگونجێن کە داوا دەکات هەواڵ بە جۆرێکی وا بنووسرێ دەرفەتی لادانی هەندێك برگەی کۆتایی هەبێ بەبێ ئەوەی کار بکاتە سەر بە تەواوەتی خستنەڕوو و پێشکەشکردنی ڕووداوەکە.

لە گۆشە نیگایەکی ڕەوانبێژییەوە سێ جۆری سەرەکی چیرۆکی هەواڵیی خاوەن بابەت هەن کە لە پێناوی زامنکردنی پاراستنی بایەخ و سەرنجی هەواڵیدا دەبێ بە تەواوی بڵاو بکرێنەوە، یەکێکیان چیرۆکی هەواڵیی خاوەن بایەخی کەڵەکەبووە کە پێشەکییەکەی جیاوازە لەگەڵ پێشەکیی هەردوو جۆرەکەی تر، ئەمەش بەو پێیەی جۆرێك لە تەوەر (ڕەگەزی گرنگ – News peg) دەگرێتە خۆی. سەرەڕای دەرخستنی ئاواز (ڕەنگ – Tone) یان بارودۆخی چیرۆکیش کە لە پێشکەوتندایە، بەڵام ئەم جۆرە چیرۆکە هەواڵییە دەبێتە مایەی ورژاندنی بایەخی خوێنەر، ئەو

بایەخەی کۆدەبێتەوەو کەڵەکەدەبێ، لە کاتێکدا هەموو ڕستە یان برگەیەك تیایدا درێژەو شتی دیاریکراو پێشکەشدەکات.

سالت لایك سیتی – (أ. ب):

کچێکی تەمەن ١٩ ساڵ کە لە شوێنێکی بازرگانیدا وەکو فرۆشیار کار دەکات، دەیەوێ بە بۆنەی جەژنی لەدایکبوونەوە پیرۆزبایی ئاراستەی سەربازێك بکا لە شیکاگۆ، بەرامبەر بەوەی لە کاتێکی زۆر پێویستدا یارمەتی داوە.

برباراسویندال– لە فارمینگتۆن– لە شوێنی کارکردنی خۆی چۆتە دەرەوەو بۆی دەرکەوتووە کە تایەیەکی ئۆتۆمبیلەکەی پەنچەر بووەو هیچ کەسێکی نەدۆزیوەتەوە بۆی بگۆڕێ، بە ناچاری ڕووی کردۆتە پێگەیەکی پاسو لەوێ سەربازێکی شیکاگۆیی ڕووی تێکردووەو پرسیاری هۆکاری نیگەرانییەکەی لێکردووە، پاشان دە دۆلاری داوەتێ بۆ ئەوەی پەیوەندی بە ماڵەوەیان بکاتو داوای یارمەتی بکات. دوای گەڕانەوەی باربرا بۆ پێگەکەی، بینی سەربازەکە سواری پاسی شیکاگۆ بووە، ناوی سەربازەکە نازانێ، بەڵام باربرا دەڵێت: "بێگومان هیوای خۆشیی بۆ ئەو سەربازە دەخوازم – ئینجا هەر کێیەك بێ–"

Chicago Daily News

## ١٣-بایەخدانێکی دواخراو Suspended Intrerest

ئەم ناوە بەو هەواڵە دەوترێ کە تیایدا نووسەر تاکۆتایی خوێنەر ڕادەکێشێو ئەو تەوەرەی دەخاتە ڕوو کە تەواوی هەواڵەکەی لەسەر بونیاتدەنرێ، واتە ئەوەی بناغەی هەواڵەکە پێکدێنێ.

ئەم جۆرە چیرۆکە هەواڵییانە هاوشێوەی چیرۆکە کورتەکانن کە لە گۆڤارەکاندا بڵاودەکرێنەوەو دەبێ بە تەواوەتی تا کۆتایی بخوێنرێنەوە.

لە هەندێك حاڵەتدا لووتکە بریتی دەبێ لە شتێکی چاوەڕواننەکراو، لە هەموو کاتێکیشدا ئارەزووی خوێنەر تێر دەکاتو لە ڕێگەی ئەو وردەکاریانەشەوە کە دەبێ لەسەرەتادا بڵاو بکرێنەوە، وەڵامی بایەخو سەرنجە هەڵپەسێردراوەکانی نووسەر دەداتەوە.

پێشەکی بایەخدانی دواخراو (یان هەڵپەسێردراو) کۆتاییو جێگیر نییە وەکو پێشەکیی چیرۆکی هەواڵیی خاوەن مۆرکی کەڵەکەبوو:

ئێوارەی ڕۆژی شەممە (مۆتا)یەك نەیتوانی هاری ئۆبراینی پۆلیس سارد بکاتەوە، ئۆبراین، کە ئەرکی لێکۆڵینەوەیەکی پێسپێردرابوو دەربارەی ڕووداوێکی دزی، ئۆتۆمبیلەکەی لە شەقامی ئوبورنی نزیك ویلسۆن ئەفنیو وەستاندبوو لەوێ کەسێك بە پرمە پرمەوە لێی نریککەوتەوە، ئۆبراین لێی پرسی: "چی دەڵێی؟"

کەسی بەرامبەریش بەبێ درکاندنی وشەیەكو لە ناکاو (مۆتا)کەی دەستی ئاراستەی دەموچاوی پۆلیسەکە دەکاتو پێی دەڵێ: "دەبێ شەڕ بکەی بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆتم ببەی".

ئۆبراین تووڕە دەبێو دەمانچەکەی ڕادەکێشێو دەسگیریدەکات، لەو وەختەشدا بۆکسێك لە ئۆبراین دەداتو ئەویش بە توندی تێی هەڵدەدا.

لە بنکەی پۆلیسی کینتکوت ئەفنیۆشدا کابرای دەسگیرکراو خۆی بەناوی والیس سولانۆی دانیشتوی ١٦٦٨- تژی ستریت ناساندو گوتی ئەو پێی وایە پیاوانی پۆلیس "زۆر گەرموگوڕن"و ویستوویەتی یەکێکیان ساردبکاتەوە.

### ١٤-بەدواییەکدا هاتن – Sequence:

چیرۆکی هەواڵیی بەدواییەکدا هاتوو (زنجیرەدار) جیاوازە لەگەڵ چیرۆکی کەڵەکەبوو، یاخود خاوەنی بایەخی هەڵپەسێردراو، ئەو جیاوازیەش تەنیا لەڕووی ڕێکخستنی مادده (بابەت)ەوەیە، دەبێ ئەوەش بزانرێ کە ئامانجی ئەو سێ جۆرە چیرۆکە دواخستنی گەیشتن بە لووتکە یان ئارەزووە لەلای خوێنەر تا کاتی

تەواوبوون — سیفەتی بەرچاوی چیرۆکی هەواڵیش کە بە شێوازی بەدوایەکداهاتن نووسرابێ، بریتییە لەوەی کە ڕووداوەکان زۆر بە وردیو بە گوێرەی بە دوایەکداهاتنی کاتەکانیان ڕێکخراون، وەك ئەمەی خوارەوە:

ڕۆژی سێ شەممە، چەند خولەکێك دوای چونە دەرەوەی دایکی بۆ ئەوەی کچەکەی بگەیەنێتە قوتابخانە، بایرۆن هالبرتی تەمەن ٣ساڵ، لە نهۆمی دووەمەوە پەنجەرەی ژوورەکەی کردۆتەوەو ویستوویەتی بڕوانێتە خوارەوە، بەڵام دیاربوو زیاد لە پێویست خۆی شۆڕکردبووەوە تا ئاستی لە دەستدانی هاوسەنگی، ئەوەبوو لە پەنجەرەکە (کە بەرزاییەکەی ٢٠ پێ بووە) کەوتە سەر ڕوبەرێکی کۆنکرێتی.

بەپەلە ئۆتۆمۆبیلی پۆلیس گەیشتو ولیەم واستنی ئەفسەر بۆ چارەسەرکردنی بارودۆخەکە خۆی گەیاندە شوێنی ڕووداوەکەو منداڵەکەی گرتە باوەش، بایرۆن هیچ ئازارێکی پێ نەگەیشتبوو بەڵام ڕەنگی سوور بوو بووەوە.

## ١٥-وتارێکی ڕاستەوخۆ Direct address

ئامۆژگاری پەیامنێرانی ڕۆژنامەوانیی دەکرێ، ئەوانەی تازە دەستیان بە کار کردن کردووە کە هەواڵەکانیان هیچ جۆرە ئاماژەیەکی وا دەربارەی ئەوەی پرسیارێکی دیاریکراویان کردووە یان لەپێناوی دەستەبەرکردنی زانیاریی گرنگ هیچ کۆششێکی نا سەرکەوتوویان دابێ، نەگرنە خۆیان، هەروەها ئامۆژگاری بەکارهێنانی شێوازی کەسی یەکەم یان دووەمیان لێ ناکرێ، لە کاتێکدا ستوونووس Columnists و هەندێك نووسەری تایبەت کە نووسینەکانیان مۆردەکەن‌و نووسەری چیرۆکە هەواڵییە بابەتیەکان (واتە ئەوانەی دەربارەی بابەتێکی گرنگ‌و دیاریکراو یان مۆرکێکی ناهەواڵین (FeatureStories) لەو ڕێسایە بەدەرن. بەهۆی دەستەبەرنەکردنی کاریگەرێتی بەشێوازێکی دیکەوە. ئەم دوو نموونەیەی خوارەوە ڕوونیدەکەنەوە کە چۆن دەکرێ هەندێك جار شێوازی کەسی یەکەم‌و دووەم لە هەواڵیی ئاسایی یان لە چیرۆکەهەواڵییە بابەتیەکاندا بەکار بهێنرێ:

– منداڵان، کاتێك دایكو باوکتان دەڕواننە بڕوانامەکانتانو دەربارەی ئەوەی کە لە قۆناغی خوێندنی دواناوەندیدا چ قوتابیەکی نایابوون، دەست بەهێنانەکایەی کەشێکی ئاهەنگ ئامێزدەکەن، ئایا هەست بە شەرمەزاری دەکەن؟ یان پەنجەی پەشیمانی دەمژن؟ خۆشحاڵ بن منداڵان، هاوڕێیەکتان هەیە کە دکتۆر ف. فینشە لە زانکۆی ئەلینۆس، ئەو لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی ئامادە کردووەو پێشکەشی کردووە بە یەککگرتووی ئەمریکیی بۆ لێکۆڵینەوە دەروونیەکان.

Chicago Daily News

– ئەگەر گوێبیستی نەبوویتو باوەڕیش بەبوونی نەکەیت، ئەوا لەوانەیە ئەمڕۆ لە کۆنگرەی داهێنەرانی نەتەوەییدا کە بڕیارە لە ئوتێلی لاسال بکرێتەوە، بخرێتە بەردەمی جەماوەر.

پەنجەرەیەکی شووشەیی کە تیایدا هیچ شتێك نابینرێ، گڵۆپی کارەبایی کە بۆ بینین ڕووناکایی کەم دەدەنەوە، بۆری ڕەقی ئاو کە بۆ ڕۆیشتنی ئاو پیایاندا هیچ بۆشاییەك نییە – ئەمە نموونەی هەندێك لەو شتانەن کە چاوەڕی دەکرێ لەم پێشانگایەدا دیدەنییان بکەیت.

## ١٦-پێشەکیی ویستراو یان ئارەزوومەندانە Freaks

لە کاتی نووسینی هەر هەواڵێکدا هیچ شێوازێك نییە بەکار نەهێنرێ، ئەم نموونانەی خوارەوە چەند پێشەکییەکی نا تەقلیدی دەگرنە خۆیانو کاریگەرێتی خۆیان دووپاتکردۆتەوە:

–کۆلیژێك بۆ فرۆشتن

ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی کۆلیژی بلیزنیت ئەمڕۆ ڕایگەیاند: ئەو خوێندنگایەی لە چوار باڵەخانە پێکدێتو ڕووبەری زەویەکەی چەند هیکتارێك دەبێ، بەدوای کڕیارێکدا دەگەڕێ.

شایەنی باسە لە کۆتایی ساڵی خوێندنی ڕابردووەوە کێشە داراییەکان داخستنی ئەو خوێندنگایەیان سەپاندووە.

—کیسەڵ ئاژەڵێکی کۆنو نامۆیە
بە زۆری دەبینیو گوێی لە هیچ نابێ
لە شۆربادا تامی زۆر خۆشە
بەڵام کە دەگەزێ، دۆزەخ دێنێ

لەگەڵ داوای لێبوردن بۆ ئوتو ورکمیستر

ئەو سۆزەی لەناو دێڕەکاندا هەیە دەربڕینی بۆچوونی بەهێزی گۆستاف رابو — ٣٢٢٥ شەقامی ئیلینوس ئەفنیۆیە.

بەگوێرەی راپۆرتێکی پۆلیس دەربارەی ڕووداوێکی هاتوچۆ، چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لەسەر ڕێگەی سان ئیلینوس ئەفنیۆ، رابو ئۆتۆمبیلەکەی خۆی لێخوڕیوەو تاکە نەفەرێکیش کە لەگەڵیدا بووە، کیسەڵێك بووە، رابو پێی وابووە کە لە نێو سندووقەکەدا دانراوەو هەستیشی بەخۆشی کردووە کاتێك بیری لە تاموچێژی ئەو شۆربایە کردۆتەوە کە لە کیسەڵەکەی دروستدەکاتو ئەوەشی بە خەیاڵدا نەهاتووە کە لەو ساتەدا کیسەڵ بیر لە چی دەکاتەوە.

بەهەرحاڵ، کیسەڵ توانیی لە سندوق بێتە دەرەوە و هێرش بکاتە سەر یەکەم شت کە بێتە ڕێگەی ئەویش ڕانی رابو بووە و گازێکی لێ گرتووە.

ئەمە رابوی شڵەژاندووەو هاواری کردووە، تا ئۆتۆمبیلەکەی لەشەقام لایداوەو خۆی کێشاوە بە دارێکدا.

دکتۆر. ل کورنیرت گوتی: جاری یەکەمە لە شاری میلویکیدا کیسەڵ ببێتە لایەنێك لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا.

# نووسینی هەواڵ بەشێوەیەك کە زیاتر بخوێنرێتەوە
# Making it Readable

یەکەم: شێوازەکانی خوێندنەوەیەکی ئاسان

دووەم: چەند ڕەخنەیەك لەبارەی ئەو شێوازانەوە

سێیەم: ستایلی ڕۆژنامە

چوارەم: کورتکردنەوە

١-دووڕودرێژەی زیاد (زیادەڕۆیی)

٢-وشە زیادەکان

٣-دەستەواژە زیادەکان

٤-ساکاریی

٥-بکەر دیارو بکەر نادیار

٦-دەرخستنی گونجاو

پێنجەم: دوورکەوتنەوە لە شتی سواو

هەر لە جەنگی دووەمی جیهانییەوە، زۆربەی زۆری ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر شێوەو پێکهاتەی هەواڵی ڕۆژنامەگەریدا هاتوون، بەهۆی ئەو ئامۆژگاریانەوە بوون کە شارەزایانی بواری خوێندنەوەی ئاسان "توانستی خوێندنەوە بە ئاسانیی و خۆشییەوە Readability"، ئەوانەبوون کە لەلایەن ڕۆژنامەو ئاژانسەکانی هەواڵەوە بە مەبەستی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەو بابەتە بەکارهێنراون.

مەبەستی ئەو گۆڕانکارییانەش هێنانەدی کورتکردنەوە –وشەی کورتتر، ڕستەی کورتتر، برگەی کورتتر بووە – بەو پێیەی هاووڵاتی ئاسایی ئەمەریکیی، ئەوەی تەنیا هەڵگری بڕوانامەی دواناوەندییە، لەڕووی خوێندنەوەو تێگەیشتنەوە ئەنجام بە ئاسانتر ببینێ.

## یەکەم: شێوازەکانی خوێندنەوەیەکی ئاسان
## Readability Formulas

هەندێك چارەسەری جۆراو جۆر هەن بۆ تاقیکردنەوەی ئەو ئاسانیەی کە دەکرێ بە هۆیەوە دەقێکی نووسراو بخوێنرێتەوە، لەنێوانیاندا ئەوانەی هەریەکە لە رۆدۆلف فلیك لە زانکۆی نیویۆرك و رۆبرت کاننگ، بەرپرسی فەرمانگەی خوێندنەوەی راپۆرتە هەواڵییەکان لە کۆلۆمبۆس — ئۆهایۆ دایانناون.

بە گوێرەی ئەو رێنماییانەی فلیك پێشکەشی کردوون، ئاژانسی ئاسوشیتد پرێس دەستی بەدابەزاندنی ناوەندی درێژیی رستەی پێشەکیی لە ٢٧ — ٢٣ وشەو درێژی وشەی بەکارهێنراو لە پێشەکیدا لە ١,٤٧ بڕگە بۆ ١,٥٥ بڕگە کردووە.

بەپێی ئامۆژگارییەکانی کاننگیش، ئاژانسی یونایتدپرێس شێوازی نووسینی خۆی ئاسانکرد بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو خوێنەرەدا بگونجێ کە تەمەنی لە نێوان ٧ —١١ ساڵدایە، لەکاتێکدا لەڕابردوودا شێوازێکی دیکەی بۆ ئەو خوێنەرە دەگرتە بەر کە تەمەنی لە نێوان ٧ — ١٦ ساڵدا بوو.

فلیك بەم جۆرەی خوارەوە مەسەلەکەی بۆ ئەنجوومەنی بەڕێوەبەرانی ئاسوشێتد پرێس ڕوونکردەوە:

چارەسەرەکە بریتییە لە ئامێرێکی ژمارەیی، پێوانەی نزیکیی ئاسانیو گرنگیدان دیاریدەکات کە ئەمەریکییەکی نموونەیی لە خوێندنەوەی ئەو دەقەدا دەینوێنێ کە بۆ تاقیکردنەوە ئامادەکراوە، دوای ئەنجامدانی چەندین تاقیکردنەوەی پەیوەندیدار

بە ئاسانیی خوێندنەوەو تێگەیشتن، ئەو دەقە نووسراوە پەرەی پێدرا، هەروەها لە ژێر ڕۆشنایی چەندین لێكۆڵینەوەی تایبەت بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارو ئەو لێكۆڵینەوانەشدا كە لەسەر جەماوەری گوێگری هەواڵە ڕادیۆییەكان ئەنجام دراون، تاقیكراوەتەوە، چارەسەریی – شێوازەكە، وای لێكدەداتەوە كە "ئاسانیی خوێندنەوە" و "بایەخی مرۆیی" بەهۆی ناوەندی درێژی وشەو ڕستەوە دەپێورێ – وشەو ڕستەكورتەكانیش ئاسانترن بۆ خوێندنەوە، ئەو لێكۆڵینەوانەی ئەنجامداون دەریانخستووە كە ئەو وشەیەی ژمارەی بڕگەكانی ١,٥ بڕگەیەو ئەو ڕستەیەش كە ناوەندی ژمارەی وشەكانی ١٩ وشەیە، بۆ نووسینی بابەتی ڕاگەیاندن خاوەنی درێژیی نموونەیین.

بایەخی مرۆیی – Human Interest لە ڕێگەی ڕێژەی "وشە كەسییەكان Personal words و ڕستە كەسییەكان Personal sentences ەوە دەپێورێت كە ناوو جێناوو وشەی دیاریكراو دەگرنە خۆیانو ئاماژە بە خەڵكو وەرگرتنە ڕاستەوخۆكانو پرسیارو ڕستەكانی "تۆ" و ئەوانەش دەكەن كە بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ قسە لەگەڵ كەسێكی دیكەدا دەكەن. ژمارەی ئەو ڕەگەزە "كەسییانە"ش تا ڕوو لە زیاتر بن، ئەوەندە بایەخی خوێنەری ئاسایی بە بابەتی ڕاگەیاندن زیاد دەبێ. هەروەها ئەو لێكۆڵینەوانەی بە ئەنجام گەیاندوون دەریانخستووە كە بوونی ٦٪ ی وشەی كەسیيو ١٢٪ی ڕستەی كەسیی لە چیرۆكی هەواڵیدا ئاستی گونجاوی نووسینی ڕۆژنامەگەرییە.

لە بۆنەیەكی دیكەشدا، فلیك چۆنیەتی پیادەكردنی ئەو شێوازەی بۆ بەڕێوەبەرانی ئاژانسی ناوبراو ڕوونكردەوە:

١-ناوەندی درێژیی وشە: ئەو ناوەندە لە ڕێگەی ژماردنی ژمارەی بڕگەكانی هەر سەد وشەیەكەوە دەپێورێ، دەتوانن بە خۆتان ئەم كارە بكەن: تەنیا بریتییە لە خوێندنەوەو ژماردن، ئەوەی زەحمەتی خوێندنەوەی وشەكانیش زیاددەكات، بڕگە زیادكراوەكانن كە بە سەرەتاو كۆتاییەكانیانەوە دەنووسێنرێن.

٢-ناوەندی درێژیی ڕستە: ئەم ناوەندەش بە ژمارەی وشەکانو دابەشکردنیان بەسەر ژمارەی ڕستەکاندا دەپێورێ، جارێکی دیکەش تێبینی دەکەین کە ڕستە دوورو درێژەکان دەبنە مایەی زەحمەتکردنی خوێندنەوە، بە جۆرێك دەکرێ بوترێ: تا ژمارەی وشەکانی ڕستە زیادبن، خوێندنەوەیان ڕوو لە دابەزین دەکات.

٣-ڕێژەی ژمارەی ئەو وشانەی کە بایەخی مرۆیی دەگرنە خۆیان: ئەوەی لێرە دەژمێردرێو ئامار دەکرێ ناو و جێناوە کەسییەکانە کە ئاماژە بە خەڵکدەکەنو، تەنانەت خودی وشەی "خەڵك"و هەموو ئەو وشانەش کە ئاماژە بە ڕەگەزی نێر یان مێ دەکەن، تا ڕێژەی سەدیی ئەو "وشە کەسییانە"ش ڕوو لە زیادبوون بکەن، خوێندنەوە ئەوەندە باشتر دەبێ.

ڕێژەی ژمارەی ئەو ڕستانەی بایەخی مرۆییان تیادا بەدیدەکرێ: ئەوان لێرە دەژمێردرێن، هەموو ئەو ڕستانەن کە ئاراستەی خوێنەر دەکرێن (پرسیار و فەرمانو پیاداچوونەوەکان)و ئەوانەش کە ئاراستەی گوێگرێك یان زیاتر دەکرێن لەگەڵ ڕستە وەرگیراوەکان لە دەقدا، ڕستەی وەرگیراویش ئەگەر بەشێك بوو لە ڕستەیەکی دووروودرێژتر، ئەو وەختە دەبێ ئەو ڕستە دوورو درێژە بژمێردرێ. لە پێناوی دیارکردنی ڕێژەی سەدیشدا کۆی ژمارەی ئەو (ڕستە کەسییانە)م دابەشی سەر کۆی ژمارەی هەموو ڕستەکان کردووە.

بەڵام کاننگ، لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەم سێ فاکتەرەی خوارەوە ئەنجام دەدات:

أ-قاڵب – ڕستەیەکی نموونەیی – Sentence pattern

دەرکەوتووە کە زەحمەت لەو کاتەوە دەستپێدەکات کە زیادبوونی ناوەندی ژمارەی وشەکانی ناو ڕستەیەك لە ٢٠ وشە زیاتر دەبێ، لە گۆڤاری (تایم – Time)دا ناوەندی درێژیی ڕستە لەنێوان ١٦ و ١٨ وشەدایەو لە گۆڤاری (المختار – Reader Digest) یشدا ناوەندی درێژیی ڕستە ١٨ وشەیە، ئەم دوو گۆڤارەش پێیان وایە کە هۆکاری سەرکەوتنو بڵاوبونەوەیان دەگەڕێتەوە بۆ جۆرو شێوازی

نووسینەکانیان زیاتر لەوەی بابەتەکانیان چین و چی دەگرنە خۆیان، بەڵام لە گۆڤاری (Atlantic) دا ناوەندی درێژیی ڕستە تەنیا یەک وشەیەو لە بنەڕەتدا ئاڕاستەی خوێنەری ڕۆشنبیرو جیدی تر دەکرێ. (زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامە ئەمەریکییە زەبەلاحەکان، ئەوە بەکاردێنن کە بە "ڕێبەری نووسەر" ناوزەد دەکرێ و ئەو شێوازە دیاریدەکات کە هەموو ڕۆژنامەو گۆڤارێك جێبەجێیدەکەن.

ب- بەڵگەی تەمومژاویی Fog Index

ئەمەیە پێوەری وشە ئاڵۆزەکان، وەك: "خەرجییەکی زۆر Expenditure prodigious لە جیاتی"خەرجیەکی گەورە Big Expense"و "بە یەقینەوە Undoubtedly" لەجیاتی "بێگومان No Doubt" و "بە یەککەیشتن یان ژوان Rendezvous" لە جیاتی "کۆبوونەوە یان دیمانە Meeting" ...... تاد.

پ- فاکتەری بایەخی مرۆیی

ئەمە بەکارهێنانی دووبارەبووەوەی ناوی کەس، یان ئاماژەکردن بەو ناوانە دەگرێتەوە، لەگەڵ ئەو وشانەی ئاماژە بە مرۆڤ دەکەن و ئاستی خوێندنەوەی بابەتی ڕۆژنامەوانی زیاددەکەن.

لەم شێوازەدا کە سەبارەت بەنووسینی دیارو ئاشکرایە، کاننگ چەند هەنگاوێکی دیاریکردووە بۆ گەیشتن بە "پێڕستێکی تەمومژاویی"، بەم جۆرەی خوارەوە:

أ- ژمارەی وشە دوورودرێژەکان لە ڕستە بەدواییەکدا هاتووەکاندا بنووسە، لەوانەشە بخوازیت نموونەی جۆراو جۆری پێکهاتوو لە سەد وشە وەربگریت، دوای ئەمە لە ڕستەیەکی نزیك لە ژمارە سەددا لە ژماردنی ڕستەکان بووەستە، ئینجا کۆی وشەکانی برگە بەسەر ژمارەی ڕستەکاندا دابەش بکە، ناوەندی درێژی ڕستەت لەبڕگەکەدا دەست دەکەوێ.

ب–لەناو سەد وشەدا، ئەو وشانە بژمێرە کە لە سێ برگەو زیاتر پێکدێن، ڕێژەی ژمارەی وشە ئاڵۆزەکانت دەستدەکەوێ.

پ–بۆ ئەوەی پێڕست – لیڤڵی تەمومژاویت دەستگیر ببێ، ئەو دوو فاکتەرەی پێشتر (لە أ،ب) ژماردبووت، کۆیان بکەرەوەو لە ژمارە (٤) یان بدە.

کاننگ ئەو ڕێبەرەی خوارەوەی بۆ هەڵسەنگاندن داناوە بۆ ئەنجامەکانی پێڕست (ڕێبەر – لیڤڵ)ی تەمومژاویی:

| ئاستی خوێندنەوە لیڤڵی تەمومژاویی | بەگوێرەی پۆل | بەگوێرەی گۆڤار |
|---|---|---|
| ١٧ | دەرچووی زانکۆ | نەبوونی گۆڤارێکی جەماوەریی |
| ١٦ | خوێندکارێکی پێشکەوتووی زانکۆ | |
| ١٥ | خوێندکارێکی تازەتر | |
| ١٤ | خوێندکاری قۆناغی دووەم لە زانکۆ | |
| ١٥ | خوێندکارێکی تازە | |
| هێڵی مەترسی | | |
| ١٢ | خوێندکارێکی پێشکەوتووی دواناوەندی | Atlantic monthly |
| ١١ | خوێنکارێکی تازەتر لە دواناوەندی | Harper's |

| | | |
|---|---|---|
| ١٠ | خوێندکارێکی پۆلی دووەمی دواناوەندی | Time |
| ٩ | خوێنکارێکی پۆلی یەکەمی دواناوەندی | Reader's Digest |
| ٨ | پۆلی هەشت | Ladies home Journal |
| ٧ | پۆلی حەوت | True confessions |
| ٦ | پۆلی شەش | comics |

## دووەم:

## چەند ڕەخنەیەك لەسەر ئەو چارەسەریی و شێوازانە

وەك لەو ڕاپۆرتەدا لیژنەی (A.D.M.E)ی تایبەت خوێندنەوە ئامادەیكردووە: سوودی تاقیكردنەوەی فلیك لەوەدایە كە نووسەرانی هاندا زیاتر بیر لە نووسینەكانیان بكەنەوە.

بێگومان دەكرێ هەمان شت دەربارەی كاننگو هەموو شێوازەكانی دیكەش بگوترێ، دەرەنجامی سەرەكیی یان كاریگەریی بنەڕەتیی ئەو ئەزموونانەش خۆی لەوەدا دەنوێنێ كە دەبنە مایەی سوككردنی پابەندبوون بە پیادەكردنی ئەو ڕێسایەی جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە بڕگەی یەكەمی چیرۆكی هەواڵیی یان پێشەكیی هەواڵ وەڵامی شەش پرسیارەكە بگرنە خۆیان.

ئێستا زۆربەی ڕۆژنامەكان لەڕێگەی دەرخستنی گرنگترین ڕەگەز لەو ڕەگەزانە (بە زۆری كێ یان چی دەبێ)و جێهێشتنی ڕەگەزەكانی تر بۆ بڕگەی داهاتوو، كاردەكەن، لەمەش زیاتر ئێستا دەتوانرێ هەریەكە لە (كێ؟)و (چی؟) بەشێوەیەكی نادیار دابنرێن، بەمەرجێك لە بڕگەكانی داهاتوودا بە وردیو ئاشكرایی لە پێشەوە دابنرێنەوە.

وا دیارە ئەو شێوازانەو هی دیكەش كە توانای وەدیهێنانی كورتییان هەیە، لەوانەیە ماندوو ببنو بەسەر بچن، دوای ماوەیەك كاركردنیش، هەندێك ڕۆژنامە

گەیشتنە قەناعەتێك کە ئەوەی ڕوویداوە بریتییە لە پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردنی ڕێسایەکی وشك و توند بە ڕێسایەکی دیکەی هاوشێوە.

ڕۆبرت فاهارتیی ڕۆژنامەوان لە Daily News دا یەکێکە لە بەرچاوترین ڕەخنەگرانی ئەو شێوازە تازەیە، فاهارتی لەم بارەوە نووسیویەتی: "شێوە، یان گەلاڵەسازیی Formula، کاتی نووسەر بەفیڕۆ دەدات، ئەمەش پێویستی بە پارە هەیە، بە هەمان شێوە دەبێتە هۆی لە دەستدانی شارەزایی نووسەرو لاوازکردنی تواناو هێزەو کەمکردنەوەی کاریگەرێتیەکەی. لەلایەکی دیکەوە توانای داهێنەرانەی نووسەر دەکوژێ، ئەو توانایەی کە ژمارەیەکی زۆری سەرنووسەران بە پێویست و گرنگی دەزانن.

لە زۆربەی حاڵەتەکاندا زەحمەتە پێشەکییەك بنووسیت لە ١٤ وشە پێك بێت و دەربڕی ڕەگەزی هەواڵیی بێت و وەکو پێویستیش ڕەگەزی سەرەکیی دیاریبکات، بۆیە زۆر جار پێویستیش دەکات –دوو هەوڵ یان سێ– دووربخرێنەوە، شێوازی ١٤ وشەیی دەربارەی هەر شتێك زۆر لە ئاگرلەماڵبەربوونێك ئاڵۆزترە، ئەم شێوازە پێویستی بە دوو یان سێ ئەوەندەی ئەوکاتە هەیە کە تیایدا چیرۆکێکی هەواڵیی بە گوێرەی شێوازی هەڵڕژانی ئاسایی ڕستە دەنووسرێ.

شێوازەکە دەبێتە هۆی لەدەستدانی ڕووبەر، شێوازی ڕستەی پێکهاتوو لە ١٤ وشە، بە زۆریی بڕگەیەك لە ١٤ وشە پێکدێت ... زۆریی بڕگەش دەبێتە مایەی بەفیڕۆدانی ڕووبەر.

بەفیڕۆدانیش لە نەتوانینی دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی وشە زیادەکاندا هەیە، دەبێ نیمچە ڕستە لە میانەی بەکارهێنانی وشەی دەستپێکەری وەك "بەڵام بەڕێز جۆنیش بە هەمان شێوە....." بگۆڕدرێ بۆ ڕستەی تەواو، لە جیاتی بەکارهێنانی جیاکەرەوە یان ئامرازێکی پێکەوە بەستنەوە یان بە یەك گەیاندن، هەڵە ستراکچەرییەکانی نێو ئەو ڕستانەی کە لە پێناوی گونجان لەگەڵ شێوازدا بە

شێوەیەكی نارێك دارێژراون، دەبنە هۆی بوونی هەڵەی ستراكچەریی لە چیرۆكیی هەواڵییدا.

ستیڤن فیتز جیرالد پێی وایە كە زۆر لە نووسەرە كلاسیكییەكان ئاماژەیەكی نادیاریی بەرزیان هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیویانە بەردەوام بن.

دەربارەی "شاگردانی خوێندنەوە"ش، نووسەر نووسیویەتی، "ئەوانە هەڕەشەی دانانی وشەكانمان لەنێو قاڵبێكی یەكگرتوو و دیاریكراودا لێدەكەن، هەروەها دەخوازن تەنیا دڵدانەوەو سەرەخۆشیی خەیاڵیمان بۆ جێبهێڵن .. دەشڵێن لە ڕێگەی كورتكردنەوەی ڕستەكانمان دەتوانین هزرەكانمان ئاشكراتر بكەین.

كورتكردنەوە، وەك چۆن زۆر لە ڕەخنەگران دووپاتی دەكەنەوە، هاوشێوەی ئاشكرایی نییە، چونكە وشەی كورت وەك وشەی دووردرێژ لەوانەیە نادیاربێ، بەهەمان شێوە ڕستەی كورتیش لەوانەیە وەكو كتێب هەڵخەڵەتێن بێ.

هەوڵی دابەزاندنی نووسینیش بۆ "نزمترین ئاستەكانی تێگەیشتن"، وەك ئەوە وایە كە فیتز جیرالد نووسیویەتی: "وەك ئەوەی سووربین لەسەر دابەزاندنی هەموو جۆرەكانی مۆسیقا بۆ ئاستی ئیقاعی سەرەتایی دەنگە دەنگەكانی نێو دارستان، بەهیوای بەرفراوانكردنی جەماوەری خوێنەر). سەبارەت بە باسكردنی كتێبی "هونەری نووسینی خوێنراوە The Art of Readable writing ی فلیك، لیستەرماركلی سەرنووسەری New York Times – Sunday نووسیویەتی: "گرفتی سەرەكی ڕەنگاو ڕەنگكردنی هەواڵ نییە، بەڵكو ئەوەیە وای لێ بكرێ چۆن تێی بگەین". بەلای ماركل و هاوشێوەكانەوە، نووسینی هەواڵ مەسەلەیەكی ماتماتیكی یان میكانیكی نییە، ئاسانیی خوێندنەوەش ناوەستێتە سەر درێژی ڕستە، بەڵكو پەیوەستە بە خودی بیرۆكەكەوە، كەمیی هەواڵیی پڕ لە هزرو پاشكۆی دەوڵەمەند بە واقیع و ڕاستییەكان، خۆی لە خۆیدا ئەو ئاستەنگەیە كە ڕووبەڕووی خوێنەر دەبێتەوە نەوەك وشەی خاوەن برگەی جۆراوجۆر، گۆڤارە بەربڵاوەكانیش لەبەر ئەوە ناخوێنرێنەوە كە وشەو ڕستەی كورتتر بەكاردێنن، یان لەبەرئەوەی

بیرۆکـەکانیان بـە سـاکاری دەخەنـە ڕوو، بـەڵکو ئەگـەر ڕاپۆرتـە هەواڵییـەکانیان بەشـێوازێکی نـەگونجاو و قورسـیش بنووسـن، ئـەوا خوێنـەران ڕاپۆرتـە سـەرنج ڕاکێشەکان دەقۆزنەوەو جیدیەکانیش وەلادەنێن، ئەگەرچی هـەردوو جۆر بەهـەمان شێواز نووسراون، بۆیە کێشـەکە خـۆی لـە پێشکەشـکردنی زانیـاریی‌ی پێویسـت بـە خوێنـەردا دەنـوێنێ بـۆ ئـەوەی بتوانـێ لـە ڕاپۆرتـە هەواڵییـە خێـراو ڕاسـتەوخۆکە تێبگات.

لەسەردەمی ئێستاماندا، تەنانەت بەتواناترین شـارەزاو زانـاش پێویسـتیان بـەوە هەیـە کـە وشـەو چـەمك‌و زاراوەی هاوپیشـەکانیان لـە بوارەکـانی دیکـەدا بـۆ وەربگێڕدرێ‌و شیبکرێتەوە.

دەربـارەی نووسـینیش بـۆ جـەماوەر، دەمێکـە ڕۆژنامـەوانان ئـەو ڕێسـایەیان پاراسـتووە کـە جـەخت لەسـەر زیـادەڕۆیی نـەکردن لـە خەملانـدنی زانیـاریی‌ی و تواناکانی‌و بەهەند نەزانینی زیرەکیی خوێنەر دەکاتەوە.

لـەکاتی هەڵسـەنگاندن‌و بـەرز ڕاگـرتنی پەرۆشـیی هەنـدێك هـەوڵی تـازەش بـۆ داهێنـانی پرۆسـەی پەیوەنـدیگرتن دەبـێ بـەرزیی‌و نزمیـی بیدعـەی خوێندنـەوە لەبەرچـاو بگـیرێ، ئەمـە تـا ڕادەیـەکی زۆر لەگـەڵ وتـاری کاریگەرانـەی پرۆفیسـۆر مارشاڵ ماکلۆهاندا دەگونجێ کە تیایدا دەڵێت:

"شێواز خودی نامەکەیە"، وەك چۆن ماکلوهـان لـەکتێبی (تێگەیشـتنی شێوازە میدیاییـەکان Understanding Media"دا و لەکتێبـەکانی دیکەشـیدا ڕوونـی دەکاتەوە کە تەلەفزیۆن‌و شێوازە ئەلیکترۆنیەکانی دیکـە کاریگەریـەکی کۆمەڵایـەتی قووڵیان هەیە، بەڵام ئەمـە مانـای وا نییـە کـە نـاوەڕۆکی بابـەتێکی نووسـراو ئێسـتا گرنگ نییە، بەڵکو شـتی سـەرەکیی‌و بنـەڕەتی لـە هـەر نووسـینێکی ڕۆژنامەوانیـدا، هێشتا خۆی لەڕوو مالکردنی هەواڵیی گونجاودا دەبینێتەوە و شتێك دەگرێتـە خـۆی کـە دەتـەوێ بیـدرکێنی‌و بیگەیـەنی – نـاوەڕۆك لـەو شـێوازە گـرنگترە کـە نامەکـە دەگەیەنێ.

## سێیەم: ستایلی ڕۆژنامە News Paper Style

ماوەیەكی دووردرێژەو بەرلەوەی خوێندنەوەی ئاسانیشە ببێتە سروت یان عیبادەت، ڕۆژنامەكان هەوڵی هێنانەدی زۆر ئامانج دەدەن و كە لێكۆڵەرە هاوچەرخەكانیش بانگەشەیان بۆ دەكەن، بەبێ ڕەچاوكردنی هەڵوێستی پارێزگارانەی ڕەخنەگرانیش بەرامبەر بە ئەدەبو زمان، ڕۆژنامەكان توانیان شێوازێكی تەواو گونجاو لەگەڵ ئەو ئامانجەدا وەدی بهێنن كە هەوڵی دەستەبەركردنیان دەدا.

سیما بەرچاوەكانی زمانی بەكارهێنراو لە هۆڵی هەواڵەكانی هەر ڕۆژنامەیەكی ئەمەریكییدا ئەمانەی خوارەوە دەگرنەوە:

١–بەكارهێنانی ڕستەی كورت، بەجۆرێك لە پێناوی هێنانەدی بەهێزترین كاریگەریدا، هەموو وشەیەكیان تیادا هەڵدەبژێردرێ، (واتە وشەی هەڵبژاردەبن).

٢–بەكارهێنانی بڕگەی كورتو پوخت، كە هەریەكەیان یەكەیەكی تەواو و سەربەخۆ پێكدێنن، بەجۆرێك دەتوانرێ لابدرێن بەبێ ئەوەی ببێتە هۆی شێواندنی چیرۆكێكی هەواڵیی.

٣–هێنانەدی كورتییو ساكاریی، لەڕێگەی لادانی وشەو بڕگەو نیمچە ڕستەی زیادو دەرخستنی پێویستو گونجاوەوە.

٤-پەیوەستبوون بە گواستنەوەی ڕووداوەكان و دوورخستنەوەی بۆچوون (ڕا) لە هەواڵ و دووركەوتنەوە لە زیادەڕۆیی و لایەنگیریی، بوونی شارەزایی لەبەكارهێنانی وشەو سیفەت و ناو و وشەی دۆگمایی دیكەدا.

٥-دووركەوتنەوە لە نووسینی "نەرم"و بەباشتر زانینی بەكارهێنانی فراوان و خۆدوورخستنەوە لە بەكارهێنانی شتی سواو و بەكارنەهێنانی وشەو بڕگەی كۆن و بەسەرچوو.

٦-پابەندبوونی تەواو و ورد بەڕێساكانی زمانەوە. ئەوەی زانایانی بواری خوێندنەوەی ئاسان كردیان، بریتی بوو لە ئاگاداركردنەوەی زۆر لە ڕۆژنامەكان سەبارەت بەوەی ئەو ڕێسایانە جێبەجێناكەن، بۆیە چاوەڕێ دەكرا هەندێكیان لەپێناوی هێنانەدی ئەو ئامانجەدا هەڵوێستی توندڕەوانە بنوێنن.

ئاندەرانی خوێندنەوەی ئاسان بایەخێكی زیاد لە پێویستییان بە كورتكردنەوەدا بەبێ ئەوەی ڕەچاوی لایەنەكانی تری نووسینێكی باشبكەن.

## چوارەم: کورتکردنەوە (Conciseness)

دەبێ ئامانجی نووسینی ڕۆژنامەگەریی کاریگەر، بریتیبێت لە دوورکەوتنەوە لە شلەژاویی و ئاستەنگ، بەبێ ئەوەی لە ئەنجامی زۆری دووبارەبوونەوەو زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی نموونەدا پچڕ پچڕی پێوە دیاربێ.

١- شلگیریی لەجێبەجێکردنی ئەو ڕێسایەی پێی وایە پێشەکیی دەبێ وەڵامی شەش پرسیارەکە بگرێتە خۆی، دەبێتە مایەی بەدیهێنانی ئامانجی قەرەباڵغکردنی پێشەکی.

پێشەکییەکی قەرەباڵغ:

کاتژمێر هەشتی سەر لەبەیانی ئەمڕۆ کلیفۆرد بریتی تەمەن ٣٨ ساڵ (١٤٥٩ — شەقامی گروف ستریت)و ڕێبوارێکی دیکەی دانیشتووی مایکل بۆلیڤارد ستریت بریندار بوون، لەوکاتەدا کە لە دووڕیانی مایکل بولیڤاردو بیرکیز ستریتدا پاسێك لە ڕێڕەوەکەی خۆی لایدا و خۆی بە یەکێکی دیکەی ڕوو لە ڕۆژهەڵاتدا کێشا، لەکاتی بەریەککەوتنی هەردوو پاسەکەشدا دەیان ڕێبواری دیکە کە لە ڕێی چوونە سەر کارەکانیان بوون، بە توندی شڵەژان. ڕاپۆرتی بنکەی پۆلیسی مایکل بۆلیڤاردیش ئاماژە بەوە دەکات کە برینداری دووەم بە پەلە شوێنی ڕووداوەکەی جێ هێشتووە. دواتر بریت بەسەرو دەستی پێچراوەوە گواستراوەتەوە بۆ نەخۆشخانە.

**پێشەکییەکی نا قەرەباڵغ**

لە ئاکامی پێکدادانی دوو پاس لە دووڕیانی مایکل بۆلیڤاردو بیرکیز ستریتدا دوو کەس برینداربوون و دەیانی دیکەش دوچاری شڵەژان بوونەوە، لەکاتژمێر هەشتی سەرلەبەیانی ئەمڕۆدا یەکێك لەو دوو پاسە ڕووەو ڕۆژئاواو ئەوەی تریان ڕوو لە ڕۆژهەڵات بووە، دووەمیان لە ڕێڕەوی خۆی لایداو بەر یەکەمیان کەوت و ئەویشی لە ڕێڕەوی خۆی بردە دەرەوە، یەکێك لەم دوو بریندارە کلیفۆرد بریتی تەمەن ٣٨ ساڵە (١٤٥٩ گروف ستریت)، بەپێی سەرچاوەکان کەسێکی دیکەش بریندار بووە بەڵام لەشوێنی ڕووداوەکە گوم بووە.

سەرو هەردوو دەستی بیرت پێچران و گواسترایەوە بۆ نەخۆشخانەی شار.

شایەنی باسە لە کاتی ڕووداوەکەدا هەردوو پاسەکە پڕبوون لەو کەوسانەی دەچوونە سەر کارەکانیان.

٢-وشە زیادو ناپێویستەکان دەبێ دووربخرێنەوەو وەلابنرێن...

٣-برگە زیادو ناپێویستەکانیش دەبێ لابدرێن ...

٤-ساکاریی: دەکرێ لە ڕێگەی دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی وشەی "داتاشراو"ەوە ئەم ئامانجە بەدیبهێنرێ، بە تایبەتیش لەو کاتانەدا کە بەکارهێنانی وشەی ئاسانتر باشتر بێ.

٥-بکەر نادیارو بکەر دیار: بە زۆری شێوازی بکەردیار کاریگەرو بەهێزتر دەبێ لە بکەر نادیار، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لە زۆر حاڵەتدا شێوازی بکەرنادیار بەکار بهێنرێ، وەك:

-هنری بنگر وەکو سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردنی حیزبی کۆماری دامەزرێنرا.

-سەرلەبەیانی ئەمڕۆ، ئیرل کرومەری بازرگانی ناسراو کوژرا، کاتێك هەورە تریشقەیەك لە ماڵەکەی دا کە دەکەوێتە ٣٤-شەقامی ویلسۆن.

بەڵام لە حاڵەتی دیکەدا، وا باشترە شێوازی بکەردیار بەکار بهێنرێ.

لاواز:ڕووداوەکە لەلایەن دە گەنجەوە بینراوە.

بەهێز: دە گەنج ڕووداوەكەیان بینیوە.

لاواز: ڕاپۆرتەكە لەلایەن پارێزگارەوە وەرگیرا.

بەهێز: پارێزگار ڕاپۆرتەكەی وەرگرت.

٦-دەرخستنی گونجاو:

دەكرێ لە ڕێگەی دانانی بیرۆكە گرنگەكان لە سەرەتای ڕستەدا خۆ لە نادیاری دوور بخرێتەوەو لە هەمان كاتیشدا ڕوونیی‌و ئاشكرایی دەستەبەر بكرێ، هەروەها بەهۆی دەرخستنی ڕووداو یان بابەخ یاخود دەرەنجام‌و ڕەگەزی هەرە گرنگی برگە یان چیرۆكێكی هەواڵییەوە دەتوانرێ دوور بخرێتەوە لەبەكارهێنانی وشەی نادیارو لادانی وردەكاریی و وشەو برگە زیادو ناپێویستەكان.

لاواز: ئامانجی كۆبوونەوەی ئەنجومەنی خوێندكاران، كاتژمێر حەوتی ئێوارەی ڕۆژی دووشەممە لە هۆڵی سویفت، بریتییە لە گفتوگۆكردن دەربارەی پێشنیازە پەیوەندیدارەكان بە دیاریكردنی چالاكیی خوێندكارانەوە.

بەهێز: لەو كۆبوونەوەیەدا كە ئەنجومەنی خوێندكاران، كاتژمێر حەوتی ئێوارەی ڕۆژی دوو شەممە لە هۆڵی سویفیت سازیدەكات، گفتوگۆ دەربارەی دیاریكردنی چالاكیەكانی خوێندكاران دەكرێ.

لاواز:كاتێك سەبارەت بە پرۆژەی كێشەی بێكاری پرسیاری لێكرا، ئەمڕۆ سیناتۆر سابوو گوتی ...

بەهێز: ئەمڕۆ سیناتۆر سابو، پڕۆژەی ڕێكەوتننامەی تایبەت بە كێشەی بێكاریی ئیدانە كردو پڕۆژەكەی بە شێواو و نا دەستووریی‌و نەگونجاویش باسكرد.

## پێنجەم: دوورکەوتنەوە لە شتی سواو
## Avioding Banality

کاتی بێگەردیی ڕێزمانەکان بەسەرچوو، سەرچاوە تایبەتمەندەکانیش دان بەوەدا دەنێن کە زمان فەرهەنگ دروستدەکات نەوەك بە پێچەوانەوە، زۆر لەو وشانەی ئێستا بەکاریان دێنین، لە ڕابردوودا بە نزمییەوە سەیریان دەکراو بە وشەی بازاڕیی و گشتیی وەسفدەکران.

هەموو ساڵێکیش نووسەرە ناسراوەکان وشەی تازە دادەتاشن، یان وشەی کۆن تازە دەکەنەوەو هەر هەموویان لەلایەن جەماوەرەوە پێشوازییان لێدەکرێ.

هەڵەی نووسەرانی گەنجیش سەبارەت بە هەڵبژاردنی وشە، خۆی لە هەڵبژاردنی ئەوەدا نانوێنێ کە بە وشەی نابەجێ ناوزەد دەکرێ، بەڵکو پەیوەندی بە هەڵبژاردنی وشەی بەسەرچوو و سواو و بێ ماناو چوارچێوەدارەوە هەیە.

سەبارەت بە بەشی زمانی ئینگلیزیشەوە، بەکارهێنانی ئەو جۆرە دەربڕینانە پەیوەندی بە مامۆستای فێرکردنی ڕۆژنامەگەرییەوە نییە، چونکە خودی ئەوانە ڕووبەڕووی وشەو دەربڕینی بێ مانا دەبنەوە کە بە شێوەیەکی نابەجێ بەکارهێنراون.

– شێوازی ڕۆژنامەوانیی:

وەك مرۆڤ بۆی دەچێ، ڕۆژنامەكان بەشدارییان لە پرۆسەی لێدانی (لەكارخستنی) وشەی تازەدا نەكردووە، بەڵكو یارمەتیدەر بوون لە كۆتاییپێهێنان و نەهێشتنی كاریگەری ژمارەیەكی زۆری وشە، لە ڕێگەی دووبارەكردنەوەو زۆر بەكارهێنانی وشە شیاوو گونجاوەكانەوە.

– وشەی بێزاركەر:

بەبێ ڕەچاوكردنی دیاریكردن و پێناسەكان، نابێ هیچ ناكۆكییەك دەربارەی ئەو ڕاستیە هەبێ كە وشە دەبێ بۆ گواستنەوەی ئەو مانا دیاریكراوە بەكاربهێنرێ كە بەكارهێنەرەكەی مەبەستییەتی، بۆیە لە كاتی پەنابردن بۆ بەكارهێنانی وشە لە غەیری جێگای ناسراوی خۆیدا، دەبێ بە ئاگابین و دورەپەرێزیی بنوێنین.

# دارِشتنی دروستو بەکارهێنانی وردی وشە
# Saying it Right

یەکەم: پێناسە

دووەم: وشە نەناسراوەکان

سێیەم: شێواندنی ڕووداوەکانو ڕەنگاو ڕەنگ کردنیان

١-گرتنەخۆ

٢-پیاهەڵدان

چوارەم: وشەکانی ڕێزگرتنو هەڵسەنگاندن

١-ناو

٢-ئاوەڵناو

٣-کار

٤-ئاوەڵکار

٥-دەربڕینەکان

پێنجەم: ڕوماڵکردنی وێنەگرانە

سەرەڕای دووردرێژیی ڕستەی داهاتوو، بەلام لەوانەیە شارەزایانی بواری خوێندنەوەی ئاسان بە ڕستەیەکی خوێنراوەی دابنێن:

"زۆر کچ و کوڕ هەن لە سەرەتای تەمەنیانەوە، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژو بەپێی مەرجی کارکردنی مەترسیدارو ناخۆش کار دەکەن". بەلام هەر شارەزایەکی بواری زانستی واتاسازیی و وشەو پێشکەوتنیان دووپاتیدەکاتەوە کە سەرەڕای ئەوەی ئەو ڕستەیە لەوانەیە ڕوون و ئاشکرا بێ، بەلام ئەو زانیارییانەی کە ڕستەکە دەیانگوازێتەوەو دەیانگەیەنێ، نادیارو لایەنگیرن.

ژمارەکە بە تەواوی چەندە؟! کاتێك دەڵێی "کوڕو کچ"، ئایا مەبەستت منداڵی بچووکە یان هەرزەکار؟ چ شتێك هەیە دیاری بخات کەی مرۆڤ زۆر بچووك بێ بۆی هەیە کاری وەك دابەشکردنی ڕۆژنامە بکات یان لە دوکانێکی سەوزەفرۆشیدا کار بکات؟! درێژی ئەو (کاتژمێرە دوورو درێژانە) چەندەو (وەختی درەنگ) چییە؟ بارودۆخی مەترسیداری کارکردن چییە؟ مەرجە (ناخۆشەکان) چین؟

## یەکەم: دیاریکردن – پێناسە Definition

هیچ پەیامنێرێکی ڕۆژنامەوانیی لە ئاراستەکردنی ئەو پرسیارانە سڵناکاتەوە، ئەگەر لە ماوەی ئەنجامدانی گفتوگۆی ڕۆژنامەوانیدا قسە، یان ڕاگەیاندنی لەو بابەتە دەربکەون و سەرهەڵبدەن، ئەمەش سەرەڕای بوونی زۆر شتی گشتیی لەوتارو ڕاگەیاندنەکاندا، بە تایبەتیش ئەوانەی لەلایەن سیاسەتوانانەوە بڵاو دەکرێنەوە. چونکە ئەوان بۆ گەیاندنی بیرۆکەیەکی گرنگ بە کەسانی تر پێویستیان بە درێژدادڕیی و زیادەڕۆیی هەیە، کاتێکیش ئەو بەیاننامەو ڕاگەیاندنانە بە تاڵ بن لە زیادەڕۆیی و گەورەکردن، ئەوا لەلایەن سەرنووسەرانەوە دەخرێنە زبڵدانی شتە بێکەڵکەکانەوە. پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا دەبێ تا ئاستی پێویست توندو یەکلا کەرەوە بێ، بۆ ئەوەی بتوانێ لە پێناوی ڕوونکردنەوەی وتە نادیارەکاندا پرسیاری گونجاو بکات، دەستنیشانکردن و پێناسەکردنی وشە (بێگەرد)یان (پیس)ەکانیش پێویستی بە لە تەنها توانایەکی ئاسایی زیاتر هەیە لە ناسینی هەواڵەکاندا، بە واتایەکی تر – چەندە شارەزایی پەیامنێرێکی ڕۆژنامەوانیی دەربارەی بابەتێك زیاتر بێ، ئەوەندە زیاتر ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ کەسایەتییەکاندا ئەنجام بدات. هەموو شێوازو چارەسەرییەکانی خوێندنەوەی ئاسان و شێوازە یاریدەدەرەکانی دیکەش بۆ هێنانە دی نووسینی باش، ناتوانن ببن بە ئەلتەرناتیف بۆ تەواوی ڕووداوەکان.

دەسگیرکردنی زانیارییی ئاشکراو وردو دیاریکراو، رێسای سەرەکیی و یەکەمە کە دەبێ بەردەوام پەیامنێری رۆژنامەوانیی پابەند بێ پێیەوە. ئەگەر ئەو کەسایەتیەی گفتوگۆی لەگەڵدادەکرێ، باس لە(پێشکەوتن) بکات، پەیامنێر دەبێ لێی بپرسێ ئاخۆ مەبەستی چییە لە بەکارهێنانی ئەو زاراوەیەداو گرنگترین ئەو ژمارەو هۆکارانە چین کە دەبنە بیانوو بۆ بە کارهێنانی، کاتێکیش کەسایەتییەکە دەربڕینێکی وەك (بارودۆخی تایبەت)ی بەکارهێنا، پەیامنێر دەبێ لێی بپرسێ ئاخۆ مەبەستی چییە لە (بارودۆخ) و چ شتێك وا لەو بارودۆخە دەکات (تایبەت) بێ، هەروەها داوای لێ بکات نموونەی دیاریکراو بۆ مەبەستەکانی بهێنێتەوە.

## دووەم: وشە نەناسراوەکان Unfamiliar Words

ئەگەر وشەکانی ئەو کەسایەتییەی گفتوگۆی لەگەڵدادەکرێ، دیاریکراوو ورد بوون، بەڵام لە هەمان کاتدا نەناسراویش بوون، ئەوکاتە پەیامنێر دەبێ هەموو ترس و نیگەرانییەك بشکێنێ و داوا لە قسەکەرەکەی بکات وشەو برگەی ناسراو بەکاربهێنێ، پەیامنێر ئەگەر ئەمە نەکات، ئەوا بەقووڵیی پرسیارکردن دەربارەی ڕاستییەکانی نێو ئەو چیرۆکەی چارەسەری دەکات، فەرامۆش دەکات، لەدەستدانی ئەو دەرفەتەش لەوانەیە ببێتە مایەی پشت بەستن و گەڕانەوەی پەیامنێر بۆ فەرهەنگ و سەرچاوەی تر، زیاتریش بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی کە لە زانیارییەکانیدا هەن.

ئەگەر لەسەر پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی پێویست بێ دەربارەی مانای دەربڕینێکی دیاریکراو پرسیار بکات، ئەوکاتە دەبێ دڵنیابێ لەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەرانی پێویستیان بە ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی ئەو دەربڕینە هەیە، بێگومان پەیامنێر لە چیرۆکێکی هەواڵیی خۆیدا دەتوانێ لە بەکارهێنانی وشەی نادیارو نەناسراو دوور بکەوێتەوە. بۆ نموونە دەتوانێ بڵێ: "یەکێتی (أ) هەوڵی هاندانی ئەندامانی یەکێتی (ب) دەدات بەوەی ئەندامێتی خۆیان لە (أ)ەوە بگۆڕن بۆ (ب) دواتر پەیامنێر دەتوانێ ڕوونیبکاتەوە کە "ئەمە لەنێوەندە کرێکارییەکاندا بە —هێرشبردن

Raiding– ناودەبرێ". خۆ ئەگەر لە ڕستەی سەرەكیدا وشەی (هێرشبردن)ی بەكارهێنابێ، دەتوانێ بەهۆی نووسینی بەپیتی لارەوە جیای بكاتەوە.

"مانگرتنی دادوەریی" و "مانگرتنی جەماوەریی" و "مانگرتنی لایەنگیرانە" و دەربڕینی دیكەی لەو جۆرە كە لە نێوەندە كرێكارییەكاندا بەكاردەهێنرێن، لەوانەیە پێویستییان بە ئاشكراكردن و شیكردنەوە هەبێ، بە هەمان شێوە لە كاتی ڕوومالّ كردنی ئەو هەواڵانەی پەیوەندیان بە كەش و هەواوە هەیە، باشتر وایە جیاوازی نێوان گێژەڵووكەو باوبۆران و گەردەلوول و بای بەهێز و ڕەشەبا دیاربخرێ، هەروەها دوور نییە تەنیا ژمارەیەكی كەمی خوێنەران لەیادیان بێ پێیەك لە ئاستی ڕووی دەریاوە چەندە یان كیلۆمەتری فەرەنسی یان میلی ئینگلیزی یەكسانە بە چەند، لەگەڵ زیادبوونی ئاڵۆزیی جیهان و پەرەسەندنی مۆركی تایبەتی ناوچەكان، لەنێو ڕۆژنامەگەریشدا پێویستیی بەكارهێنانی ئەم جۆرە ڕوونكردنەوەو شرۆڤەكارییانە زیاتر دەبێ.

## سێیەم: شێواندنی ڕووداوەکانو ڕەنگکردنیان بەڕای کەسیی Editorializing

ڕووماڵکردنی هەمەلایەن باشترین زامنە بۆ بەکارنەهێنانی وشە بە ناگونجاوی.

### ١-گرتنەخۆ Connotation

دەربڕینی "کرێکاران زیادکردنی کرێیان بردەوە" مانایەکی دیاریکراو دەگرێتە خۆی، برگەی "کرێکاران کرێیان بۆ زیاد کرا" مانایەکی جیاوازی هەیە، لەهەر حاڵەتێکی دیاریکراودا، ڕووماڵکردنی هەمەلایەنو چڕوپڕ بە تەنیا توانای دیاریکردنی دەربڕینی ڕاستی هەیە، کاتێکیش مەسەلەکە پەیوەندی بە بەرژەوەندیی گشتییەوە هەبێ، ڕێگە بە بوونی هیچ تەمبەڵی یان درێغیکردنێك نادرێ، وەك لەو هەواڵانەدا کە چارەسەری کێشە پەیوەندیدارەکان بە پەیوەندیەکانی کارو چالاکییە حکومییەکانو هی تری لەو بابەتەوە دەکەن. ئەم برگەیەی خوارەوە:

"بێگومان سەرچاوە (دەستێوەردان)ی حکومەت ڕەتدەکاتەوە" کاتێك مانای ئەو ڕاستیە بدات کە دژایەتی (ڕێو شوێنەکان)ی حکومەتە لەناوچەیەکی دیاریکراودا، ئەوا دەربڕینەکە بە بارگاوی لە قەڵەم دەدرێ.

ئەو پرسیارانەی پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی دەیانکات، دەبێ مەبەست لە دوایانەوە دەسگیرکردنی زانیاریی دیاریکراوو ورد بێ نەوەك ببنە مایەی تۆمەتبارکردنی نادیار یان تەنیا هێنانی چەند ناوێك، ئەگەر بۆ مەبەستێکیش وشەی بارگاوی بەکارهێنرا، دەبێ لەناو دوو کەوانەدا دابنرێ، یان ماددەیەکی ڕوونکەرەوەی بۆ زیاد بکرێ لەوانەبێ ئاماژە بە وشە بەکارهێنراوەکان بکات کە دەربڕینی هەمان بیرۆکەن.

ڕۆژنامەکان لە کاتی بەکارهێنانی وشەو وەسفی ئەوانەدا کە نوێنەرایەتی بۆچوونەکانیان دەکەن یان لە هەڵوێستێکی هەڵپەسێردراوو باس نەکراودا، کارێکی پروپاگەندەیی ئەنجام دەدەن، ئەمانەی خوارەوە چەند نموونەیەکن بۆ ئەو جۆرە دەربڕینانەی کە شێواندنو ڕەنگکردنی ڕاستییەکان دەگرنە خۆیان: "لائیحەیەکی کرێکاریی کۆیلایەتی"، بۆ وەسفکردنی ڕێو شوێنێك کە پەیوەندی بە ڕێکخستنو دیاریکردنی گواستنەوەی هێزی کرێکارانەوە هەبێ لە بارودۆخە نائاساییەکاندا. "لائیحەی دیکتاتۆر"، بۆ وەسفکردنی پێشنیازێك کە دەسەڵاتەکانی مەکتەبی تەنفیزی بەرفراوان بکات.

جیاوازیەکی گەورە هەیە لە نێوان ئەوەدا کە وشەی "بیانی" و "نامۆ"، یان "ڕێکخەری کرێکاریی" " هاندەری کرێکاریی" یان "مانگرتن"و "مانگرتنی جەماوەریی"و ...... تاد.بەکاربهێنیت.

## ٢-هاندانو فوتێکردن Puffs and Boosts

زۆربەی ڕۆژنامەکان، خۆیان بەدوور دەگرن لە بەکارهێنانی دەربڕینە هاندەرو فوتێکەرو زیادەڕۆو برگە گشتیو چوارچێوەدارەکان، هەڵوێستێکی هۆشدارانەش لە دژی شێواندنو ڕەنگکردنی ڕاستیەکاندا دەنوێنن، دەبێ بەکارهێنانی برگەی لەو جۆرە قەدەغە بکرێ، بەرچاوترین ئەو جۆرە دەربڕینانەش، ئەوانەن کە پەیوەندییان

بە پیاهەڵدان و فوتێکردنی کەسێك یان ڕووداوێکەوە هەیە، باشتر وایە ڕووداوەکان وەکو خۆیان بخرێنە ڕوو و ڕێگەیان پێ بدرێ باسی خۆیان بکەن.

لە نێوان ئەو نموونانەشدا کە ئەمڕۆ لە زۆربەی ژوورەکانی نووسینی هەواڵدا باویان نەماوە، ئەمانەن:

"سەرکەوتنێکی گەورە، هەموولایەك کاتێکی خۆشیان بەسەر برد، بۆنەیەکی بەچێژ، دیمەنێکی کاریگەر، نمایشێکی بێ وێنە پێشکەش کرا، دیکۆرێکی سەرنج ڕاکێش، هەموو شتێك بە چاکی تەواو بوو، کەسایەتییەکی خۆشەویست، گەنجێکی زیرەك، سەرکەوتووترین گەشت...".

## چوارەم: وشەی ڕێزگرتن و هەڵسەنگاندن
## Evaluative Words

لە بوارێکی دیکەی تەواو جیاوازداو بەهۆی بەکارهێنانی سیفەتە دیاریکراوەکان Qualifying adjective، نەوەك شێوازەکانی دیکەی دەربڕین، دەکرێ بۆ باشترکردنی ئاستی تێگەیشتنی دەق لەلایەن خوێنەرەوە چەند هەوڵێك دەستنیشان بکرێن، تەنانەت هەندێك لەو نووسەرانەش کە بە هەڵوێستی ڕەخنەگرانە بەرامبەر ڕوومالّی شرۆڤەکاریی هەواڵەکان ناسراون، سالآنێکە ڕێگەیانداوە، بەڵکو هانی پەیامنێرانیشیان داوە کە چەند دەربڕینێکی وەك ئەمانەی خوارەوە بنووسن و بەکاربێنن:

"یەکێك لە ناسراوترین ئامادەکارانی مۆسیقا لە ئەمەریکا، دەست بەژەنینی بەرهەمەکانی دەکات" و "هەر دوو ڕکابەری گەورە، لە خولی یەکەمدا بەیەك دەگەن" و "هۆبەیەکی خوێندنی نائاسایی بۆ فێرکردنی داهێنان لە نووسیندا، بۆ منداڵە زیرەك و بەتواناکان دەکرێتەوە" و "دادگا گوێ لە کێشە ئاڵۆزو هەستیارەکان و ئەوانەش دەگرێ کە ناکۆکییان لەبارەوە هەیە".

گومان نییە لەوەی ئەو جۆرە دەربڕینانە حیکمەت و هەڵسەنگاندن دەگرنە خۆیان، بۆیە ئەگەر لەڕووی کۆمەلایەتییەوە قبووڵ بکرێن، دەبێ ئەو حیکمەتانە لەسەر بناغەی زانیاریی دروست و گونجاوەوە سەر بگرن.

نووسەرێکی بواری وەرزش کە دەربڕینێکی لەو جۆرە بەکار دێنێ: ئەنجامی یارییەکە "دۆڕانێکی چاوەڕوان نەکراوو توند بوو" دەبێ بزانێ کە هاندەران چاوەڕێی ئەنجامێکی جیاوازیان دەکرد، هیچ پەیامنێرێکی شارەزا نییە کردارەکانی بەچاکتر زانین (التفضيل) بەکاربێنێ بەبێ ئەوەی لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام نەدات دەربارەی ئەوەی ئاخۆ بڕیاری بەکارهێنانی ئەو جۆرە دەربڕینانە گونجاوە یان نا: "لە هەموو ئاگر کەوتنەوەکانی تر زیانی زیاتر بوو" و "گەورەترین جەماوەر" و "درێژترین ڕاپۆرت" و "دەرکەوتنێکی بێ وێنە". هەروەها هیچ ڕۆژنامەوانێکی بەتوانا بۆی نییە هەر تاوانێکی گەورە بە "تاوانی سەردەم" وەسف بکات.

١- ناو:

کەی دەتوانیت بارێکی نائاسایی بە "گێرە شێوێنی" یان "یاخیبوون" ناو ببەیت؟ کەی دەتوانیت وشەی وەك "کارەسات"، "مەینەت"، "سەرنەکەوتنی تەواو"، "لووتکە"، "ئەنهیلەر" بەکار بهێنیت؟

دەکرێ بوترێ: ئەو جۆرە دەربڕینانە دەبێ لێزانانە بەکار بهێنرێن، بە جۆرێك لە یەکتر جیابکرێنەوە، زۆریی بەکارهێنانیشیان دەبێتە مایەی مردن و شکبوونیان، ئەوانە وەك دەنگی "گورگ"ێك وان کاتێك هیچ گورگێك دەیار نەبێ.

ئێزنی دروستبەکارهێنانی ئەو وشانە چییە؟

پەیامنێری زیرەك کە چەندین چیرۆکی دیکەی لەو جۆرەی ڕوومالّکردووە، بناغەیەکی دەبێ بۆ بەراوردکردن، دواتر ئەزموونی تایبەتی خۆی لە ئەزموونی هەر کەسێکی دیکە باشتر دەبێ، بەتایبەتیش لەکاتی بوونی ئامانجێکی کەسییدا کە ئەو پەیامنێرە لە میانەی بەکارهێنانی ئەو وشەیەدا لەجیاتی یەکێکی تردا هەوڵی دەستەبەرکردنی دەدات. ڕوو مالّیی هەوالّیی باش و تواناداروتەواو، ئەوەیە کە بتوانێ زانیاریی دروست بخاتە بەردەمی خوێنەر، نەوەك ئەو ئەنجامانەی چارسەرو تیۆرەکانی کۆمۆنیکەیشن پێشکەشیان دەکەن.

## ٢- ئاوەڵناو adjective

کەی کچێك جوان دەبێ یان لە ڕادە بەدەر جوان دەبێ؟ بێگومان لە هەموو کاتێکدا نا، بەڵکو لەو کاتەدا کە شایەنی ڕوماڵیی هەواڵیی بێت.

بەوپێیەی کە تواناکانی وێنەکێشانی فۆتۆگرافی لە پێشکەوتندان، بۆیە لە کاتی بەکارهێنانی ئەو سیفەتە ڕوونکەرەوەییانەدا ڕۆژنامەوانان ئاگاداریی و وردبینییەکی زۆر دەنوێنن.

لەو بارەیەشەوە باشترین شت کە لە تواناودا بێ ئەوەیە ئامۆژگاری بکەین کە لەبەکارهێنانی ئەو سیفەتانەی خوارەوەدا وردبینیی و ئاگاداریی پیشانبدرێ: "قارەمان، زۆر باش، شارەزا، قەرەباڵغ، ڕێك، بەچێژ، زل، زەبەلاح، جوان، میللی، سەرکەوتوو، ناسراو .... تاد".

## ٣- کار - Verbs

دەبێ کارەکان زۆر وردبن، سەرچاوەش ئەگەر بە (بەڵێ) وەڵامی پەیامنێری دایەوە، ئەو کاتە گونجاو نییە هەمیشە کرداری (ڕازی بوو) بۆ شتێك بەکار بهێنێ.

لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر سەرچاوە ڕاگەیاندنێکی‌دا، دیسان پەیامنێر بۆی نییە هەمیشە کاری (ئاشکرای کرد) یان (ڕوونی کردەوە) بۆ شتێك بەکاربهێنێ، ئەمە لە کاتێکدا ئەگەر ئەو شتە بە ئەنقەست بە نهێنی نەهێڵرابێتەوە هەروەها وشەی (تاوانباری کرد)یش لەوانەیە کارێکی گونجاو نەبێ بۆ دەربڕینی تاوانبارکردن، بە تایبەتی ئەگەر سەرچاوە مەبەستی ئاڕاستەکردنی تۆمەتبارکردنی نەبێ.

وشەی (وای گوت) یان (ئیدیعای کرد)یش وا دەردەخەن کە کەسێك هەواڵیی ڕاستکردنەوەی لێکدانەوەیەکی هەڵە دەدات یان دەیەوێ موڵکداریێتی شتێکی پێ ببڕێ کە پێی وایە خاوەنیەتی.

بەو پێیەش کە ژمارەیەکی کەمی وشەی لە یەکچووی ورد هەن، بۆیە فەرهەنگێکی بچووك دەبێتە هاوڕێیەکی باشی ئەو نووسەرەی هەوڵی بەخشینی زانیاریی دروست و ورد دەدات، بەڵکو لە ڕێبەری کاننگ بەسوودتر دەبێ.

بەکارهێنانی وشەیەکی بەهێز لەبری وشەیەکی دیکە، بە مەبەستی زیاتر سەرنج ڕاکێشانی خوێنەر، شتێکەو چاوپۆشیی لێ ناکرێ.

ئەوەی خوارەوە هەندێك کارن کە دەبێ پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی لە بەکارهێنانیاندا دوودڵ بێت:

"وای داوا کرد، دانی نا، هەڵات، دۆزیەوە، سوکایەتیی پێکرد، پێکەنی، نەڕاندی، هاواری کرد، هەڕەشەی کرد، چرپاندی ..... .تاد.".

## ٤-ئاوەڵکار Adverbs

ئەو ئاوەڵکارەی بەشێوەیەکی گونجاو لەجێگەی خۆی دانرابێ، توانای گۆڕینی تەواوی مانای چیرۆکە هەواڵییەکەی هەیە. تێبینی هێزی شاراوەی نێو ئەم ئاوەڵکارانەی خوارەوە بکە: "بەڕێکەوت، بەتووڕەیی، بەهێمنی، گوێنەدان، بەڕووگرژیی، بە ئەنقەست، بەگاڵتەجاڕییەوە، بەپێکەنینەوە، بە سوحبەتەوە، بە جیدیەوە.... تاد".

## ٥-دەستەواژەکان Phrases

ئەو دەستەواژانەی تایبەتن بە هەڵسەنگاندن، دەتوانن چیرۆکێکی هەواڵیی (دروست بکەن یان لە ناوی ببەن). بڕوانە هێزی شاراوەی نێو ئەم دەستەواژانەی خوارەوە: "کاردانەوەیەکی تووڕە، بە شێوەیەکی ئیستیفزازی، لە ڕاگەیاندنێکی بێ وێنەدا، لەبەر تووڕەیی ڕەنگی هەڵبزڕکاوە، لە دڵتەنگیدا دەلەرزێ، ڕێزێکی زۆری نواند .... تاد".

## پێنجەم: ڕووماڵکردنێکی وێنەگرانەی هەواڵەکان
## (Impressionistic Reporting)

لە وتەیەکیدا لە زانکۆی میسوری، نیوبولد نویس، لە ڕۆژنامەی واشنتۆن ئیڤنینگ ستاردا، بەرگری لە (ڕوماڵکردنی وێنەگرانە) کردو داوای بەکارهێنانی کرد، ڕوونیشی کردەوە کە مەبەست لە ڕووماڵکردنی وێنەگرانە، ئەو هەولانەن کە پەیامنێرانێکی بە تواناو بێ لایەن دەیاندەن، بۆ دۆزینەوەو خولقاندنی هەستێکی وا لەلایەن خوێنەر سەبارەت بە ڕووداوێکی گرنگ – کە هاوشێوەی ئەو هەستە بێ کە پەیامنێر وەکو شایەت حاڵێك دەربارەی ئەو ڕووداوە هەیەتی.

ت. ساڤکتۆن T.Savcton یش لە وتارێکیدا لە ژێر ناونیشانی (شەڕو ئاشتیو ڕۆژنامەوانیی)دا، کە لە ١٦ ی نیسانی ١٩٤٩دا لە گۆڤاری Nation دا بڵاوکراوەتەوە، بانگەشەی بۆ ئەوە کردووە کە بە (ڕۆژنامەوانیی گشتالت Gestalt Journalism)ی ناوبردووەو بەم جۆرەی خوارەوەش پێناسەی کردووە: "ئەو ڕۆژنامەوانییەیە، کە مەبەستی ئەوەیە لە هەر بوارێکدا بگاتە ڕاستییەکی تەواو، لەو پێناوەشدا هەموو هەوڵو کۆششێکی پێویست دەخاتە گەڕ، واتە لە بنەڕەتەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆژنامەوانیی ئاسایی کە لەسەر بناغەی ڕووماڵکردنی هەواڵیی چەند بەشێکی هەڵبژێردراوی ئەو ڕاستیە سەر دەگرێ. بەو مانایەش ڕۆژنامەگەریی

گشتالت تەنیا ئەوە وەسفدەکات کە پەیامنێرانی ڕۆژنامەوانیی جیدی لەسەرەتای دەستپێکردنی نووسیندا هەوڵی جێبەجێکردنی دەدەن".

دەسەڵاتدارانی ناوچەکە (کەرت)، چەند هەڵوێستێکی هەواڵییان گل دایەوە، ئەمەش کاتێک "تێبینیە ڕاستەوخۆکانم، وەك هی پەیامنێرێکی ڕۆژنامەوانی، زۆر شتیان دەربارەی خوازیاریی هەمەلایەن و مانای تەواو دەگرتە خۆیان... واتە زیاتر لە گشتالتیەت نزیك دەبوونەوە لەوەی بتوانن دووبارە بیانگێڕنەوە بۆ نووسینەوەی ئەو تێبینییانە". ئەگەر ڕووماڵی هەمەلایەن – گشتالتی– وەدی بهێنی یان کەشوهەوای دروست و واقیعی بنەڕەتیی پەیوەندیدار بە هەڵوێستێکی هەواڵیی بخەیتە ڕوو، مانای وایە کە ئەرکی سەرەکیی پەیامنێری ڕۆژنامەوانی ئەنجام دەدەین.

سەبارەت بەو وشانەش کە بەکاریان دێنیت، ئەوە دەوەستێتە سەر ئاستی پێویست بوون بە بەکارهێنانیان. "دوای ئەوەی لێکۆڵینەوە لەگەڵ سیناتۆر جۆزیف مەکارسیدا تەواو بوو، لە میانەی ئەو دانیشتنانەی سوپا ئەنجامی دەدان، جۆزیف ویلکی سەرۆکی ئەنجومەن ڕووی کردە دەرەوەو دەستی کرد بە گریان".

ئاژانسی ئاسوشیتد پرێس ئەمەی بڵاوکردەوە، ژمارەیەك لەسەرنووسەرانی ئاژانسەکە دژی دانانی ئەو ڕووداوە بوون لەناو ڕاپۆرتی تایبەت بە ئاژانسەکەیاندا، هەندێکی دیکەش ناخۆشحاڵ بوون بەرامبەر بەکارهێنانی دەربڕینی وەك "ستیڤنس ملی بۆ داواکاریەکانی مەکارسی کەچ کرد" و "لەکاتی ڕیسوابوونی ویلك مەکاریسدا، زۆر لە ئامادەبوانی هۆڵی دادگاییکردن بەتوندی دەستیان بە چەپڵەلێدان کرد". تا ئێستاش هەندێکی دیکە پێیان وایە کە ڕاپۆرتی دانیشتنی دواتر نەدەبوایە دەربڕینی وەك: "سیناتۆر فرانسیس کاسی زۆر بە توندی ڕاپۆرتەکەی فڕێ داو بووە هۆی پەرت و بڵاوبوونی کاغەزەکانی" بگرێتە خۆی. لەبەرامبەریشدا زۆرینەی ئەوانەی کە خاوەنی دیدو بۆچوونن، پشتگیری لەوە دەکەن کە ڕاپۆرتە هەواڵییەکان وردەکاری لەم جۆرە بگرنە خۆیان، چونکە ئەمە لەبەرژەوەندی ڕووماڵکردنی هەواڵیی تەواو و هەمەلایەن و وردی ئەو ڕووداوەدا دەبێ.

لەهەمان چاپى كتێبى سوور (الكتاب الاحمر) دا، ڕاپۆرتێك دەربارەى گفتوگۆكانى تايبەت بە دانيشتنەكانى دادگاييكردنى مەكارسى بڵاوكراوەتەوە، وێڕاى كورتەيەك لە بەشەكانى ديكەى كۆنگرەى سەرنووسەران. لە بڕگەيەكى تايبەت بە دانيشتنێكدا هاتووە:

"خاتوو مارى مارگرێت ماكبيردى ستوونووس و نووسەرى هەواڵيى وەسفى لە ئاژانسى ئاسوشتيد پرێس، توانى سەرنجى زۆر لە سەر نووسەران ڕابكێشێ، كاتێك ڕووبەڕوويان بووەوەو بە درێژايى كاتژمێرێكى تەواو لە ململانێيەكى زارەكيدا، سووربوونى خۆى دەربڕى لەوەى ناكرێ هەموو هەواڵە پەيوەنديدارەكان بە (ژن) لە ژێر يەك ناونيشاندا بڵاو بكرێنەوە كە (لاپەڕەى ژنان)ە".

ئەو نووسەرە بەناوبانگە لە كاتى دەركەوتنيدا لەو دانيشتنەى كە تايبەت بوو بە گفتوگۆكردن دەربارەى چيرۆكە وەسفييەكان (بابەتييەكان – چيرۆك ئاميزيى– نا هەواڵييە بەرچاوەكان News Feature) و لەلايەن روديك واتز لە ڕۆژنامەى هيوستون كرونيكل و سەرۆكى ليژنەى سيفەتەكانى هەواڵ – هەواڵى وەسفييەوە سەرپەرشتى دەكرا، كراسێكى لە پێست دروستكراوو نەخشێنراوو ڕەنگاو ڕەنگ بە دارستانێكى پڕ لە سەوزەو ميوەى پۆشيبوو، لە ژێر پرچە بەرزبووەوەكەشيدا دەموچاوى دەگەشايەوە، خاتوو مارگرێت سەرقاڵى مشتومڕو ڕەخنەگرتن‌و گاڵتەجاڕيى‌و مانۆڕ بوو.

لە ساتێكدا، خاتوو ماكبيرد هاوارى كردو سەرنووسەرانيش حەزيان لەمەكرد، هەندێكيان بينران خەريكى سڕينەوەى فرمێسكە پێكەنيناوييەكانيان بوون، هەندێكى ديكەش بيريان لەوە كردەوە كە ڕووبەڕووى ببنەوەو لە هونەرى ئەنجامدانى گفتوگۆى ڕۆژنامەوانيدا The Art of Interviewing شكستى پێ بهێنن.

ئاشكرايە ئەمەش پێچەوانەى ڕێساكانى ئاسوشتيد پرێسە كە پەيوەندييان بە درێژيى گونجاوى ڕستەوە هەيە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر كەسێك بيخوێنێتەوە، بێگومان هەست بە گيان‌و كەشو هەواى بۆنەكە دەكات.

ڕاستیی ئەوەی کە ڕاپۆرتێ دەبێ (بەها) و هەڵسەنگاندن و حوکمدان بگرێتە خۆی، بابەتێك نییە جێگەی گومان بێ.

نووسەر پێی وابووە کە خاتوو ماکبیرد "گفتوگۆی کردووە، ڕەخنەی گرتووە، نەرمیشی نواندووە". لەوانەبوو چاودێرێکی دیکە لەو باوەڕەدابووایە کە خاتوو ماکبیرد لە پێناوی شاردنەوەی درێغی لە پرسیارەکاندا خۆی کردووە بە ئەکتەر.

نووسەری باش ئەوەیە کە هەوڵی گواستنەوەی بۆچوونەکانی بدات سەبارەت بە بنەماکانی دروستبوونی ڕووداو- بۆنەو شێوازی مادیی پێ ببەخشێ، وەك بەکارهێنانی چەند ڕستەیەکی وەك "سەرنووسەران حەزیان لەمە کرد"، نووسەر ئەمە لە ڕێگەی گواستنەوەی گۆشەیەکی دیکە دەستەبەر دەکات کە ئەمەیە: "هەندێکیان بینران فرمێسکی پێکەنینیان دەسڕیەوە". بێگومان لە هەموو کاتێکیشدا ئەو جۆرە بەڵگە ئاشکرایە بەردەست نابێ بۆیە لەو جۆرە حاڵەتانەدا شارەزایی و ئەزموون و پاشکۆی زانیاریی و تۆماری دەسکەوتی پێشوو و یەکێتی و تەواویی و هەمەلایەنیی دەبن بە چەکەکانی ڕۆژنامەوان و سەرچاوەی پاراستنی خوێنەران.

وارن برایەر لە وتارەکەیدا بەناونیشانی "زمانی زیندوو لەلای بروس: دیدێکی خێرا بۆ شێوازەکەی" کە لە ساڵی ١٩٦٣ لە گۆڤاری Montana Journalism Review دا بڵاوکراوەتەوە، دەیان نموونەی دەربارەی ڕۆژنامەگەریی وێنەگرانە (کاریگەرانە- هەڵچووانە Impressionistic Journalism)ی باش خستوونەتە ڕوو، لەنێوان ئەو نموونانەدا چەند برگەیەك لەو چیرۆکە هەواڵییە دووبارە دەکەینەوە کە ئاژانسی ئاسوشتید پرێس دەربارەی دادگاییکردنی ئەدۆلف ئیخمان بڵاوی کردووەتەوە: "هوسنەر، پیاوێکی قەبارە بچووك، دەموچاوی (بان)ی هەیەو سەری ڕووتاوەتەوە، جلی ڕەشی فەرمیی دەپۆشێ، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ داواکاری گشتی، دەستەکانی خستوونەتە بن هەنگڵیەوە. ئەو کاتەی داواکاری گشتیی هێرشەکەی توندکرد، هەڵچوونێکی زۆر بە سەرو ڕووی ئیخمانەوە دەرکەوت،

لە نێوان هەر پرسیارو پرسیارێکی تریشدا، هوسنەر بە تووڕەییەوە لێوەکانی دەکرۆژت، لە کاتی وەڵامدانەوەی هەندێك لە هەستیارو وردترین پرسیارەکانیشدا دەنگی بەرزتر دەبۆوە".

گومان نییە لەوەی ئایندە داننان و قبوولکردنێك بە خۆیەوە دەبینێ، دەربارەی پێویستیی زۆر بە پێشخستن و ڕاهێنانی پەیامنێری ڕۆژنامەوانیی کە لەسەر ئەم ئاستە بەرزەدا بن. لە جیاتی ئەمەش دەبێ بەبێ ئومێدی بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی کە بەرووماڵی بابەتی Objective Reporting ناو دەبرێ کە لەبەردەم ماناو مەغزای زۆر هەواڵدا خوێنەر بە تەنیا لەو ساردییە توندەدا جێ دێڵێ.

ئەلمردیڤیزی خواڵێخۆشبوو لە وتارێکیدا بەناونیشانی (هەواڵەکان و ڕاستیی تەواو) کە لە ئابی ۱۹۵۲ لە گۆڤاری Atlantic دا بڵاوکراوەتەوەو دواتریش لە کتێبی (بەڵام بە ئازادی لەدایك بووین) دا دووبارەکرایەوە دەڵێ: "بابەتیبوون زۆر جاری وا هەیە تا ئاستێکی وا پاشەکشە دەکات کە پیشەی هەواڵ دەکاتە تەنیا لێشاوێکی گوێزەرەوە بۆ بانگەشەکەران و ساختەکارو فێڵبازان ....".

لە زۆربەی سالانی سەدەی نۆزدەدا برێکی ئەوتۆی (بابەتیبوون) لە ڕۆژنامەگەریی ئەمەریکیی‌دا بەدی نەدەکرا، چیرۆکی هەواڵیش ئەگەر لەبەرژەوەندیی سیاسیی یان ئابووریی سەرنووسەر یاخود خاوەنی ڕۆژنامەی بدایە، ئەو وەختە بە جۆرێك دەنووسرا کە ببێتە مایەی بەهێزکردنی هەڵوێستی ئەو کاربەدەستانە. تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان هەندێك ڕۆژنامە ئەو پرۆگرامە پەیڕەو دەکەن، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان – چەند دەیەیەك لەمەوبەر– بەوە ڕازی بوون کە دەبێ هەوڵ بدەن لە ستوونە هەواڵییەکانیاندا بابەتیانە بن و دیدو بۆچوونەکانیش بۆ لاپەڕەی تایبەت بە وتارەکان بەجێ بهێڵن، هەروەها لە بەرامبەر هەر کێشەیەکیشدا کە مایەی ناکۆکی و مشتومڕیێ هەموو ئەو ڕاگەیاندنانە بڵاو بکەنەوە کە لەلایەن هەردوو لاوە ڕادەگەیەنرێن، دواتر ڕێگە بە خوێنەر بدرێ بڕیاری خۆی بدات. ئەمە خۆی لە خۆیدا تیۆرێکی بەرزو گونجاوە، بەڵام با وای دابنێین ئەو کەسانەی کە لە یەك یان هەردوو

لایەنەوە قسە دەکەن، قسەکانیان ڕاست نییە یان تەنیا هەوڵی خزمەتکردنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان دەدەن، یان نازانن باسی چی دەکەن، ئەو وەختە ئەگەر تەنیا لەلاپەڕەی تایبەت بە وتاردا ئاماژە بەو ڕاستیانە بکەین، بێگومان ئەمە بۆ پرۆگرامی زۆربەی ڕۆژنامەکان شتێکی بابەتیانە نابێ. ئەگەرچی لەچیرۆکە هەواڵییە هەنووکەییە ئاڵۆزەکاندا ژمارەی ئەو خوێنەرانە کەمە کە خاوەنی شارەزایی تەواون بە جۆرێك واقیع و خەیاڵو زانین و نەزانینی و بەرژەوەندیی و بێ لایەنیی لێك جیا بکەنەوە.

بێگومان ئەمڕۆ وەك ٢٥ ساڵ لەمەوبەر — واتە سەردەمی زێڕینی ڤالڤن کۆلیدج کە تیایدا شتەکان وەك خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا — نییەو ئەو جۆرە کارکردنە باوی نەماوە.

لە ڕۆژانی ئەو سەردەمەدا ئەگەر جۆن ب. هۆرنیس کەسایەتیەکی گرنگ بووایە، گومان نەبوو لەوەی کە هەمیشە ڕۆژنامەکان وتەی دوورودرێژیان لە قسەکانی بڵاو دەکردەوە — ئینجا دەربارەی هەرشتێك بوایە — بەبێ بوونی هیچ ئاماژەیەك بۆ ئەوەی هۆرنیس بەرژەوەندیی لەوەدایە وا لە خەڵك بکات باوەڕ بە قسەکانی بهێنن — تەنانەت ئەگەر خودی سەرنووسەریش کە هەواڵەکەی بڵاو دەکردەوە، ئاگاداری ئەو بەرژەوەندییە بوایە، لەو کاتانە باوەڕ وابوو کە هۆرنیس کەسێکی گرنگەو ڕاگەیاندنێکی داوە، بۆیە شتێکی بابەتیانە نابێ ئەگەر ئەم ڕاگەیاندنەی بڵاو نەکرێتەوە.

ئێمە— تا کاتی سەرکەوتنی سیناتۆر ماکارسی— لە بابەتیبوونی مردووی ئەو ساڵانە دوور دەکەوینەوە، یان لێی دوور دەکەوتینەوە.

لە وتارێکدا کە لەسەرەتای ئەو بەشەدا ئاماژەمان پێی کرد، نیو بۆلد نویز دووپاتی کردۆتەوە کە پێویستە دەستبەرداری زاراوەو چەمکی (هەرزەکاریی ڕۆژنامەگەریی Journalism Adolescence بین‌و لەو بارەوە گووتوویەتی:

"لە ساڵی ١٩٠٠ دا، كاتێك فرانك نویزی باپیری سەرقاڵی دامەزراندنی ئاسوشتید پرێسی تازە بوو و لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا پایەی یەكەم سەرۆكی ئەو ئاژانسەی گرتە دەست، ئەو لەگەڵ هەڤاڵانیدا دڵنیابوون لەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەمان دەزانن: چۆن ڕاستی دەگێڕێتەوە؟ وەڵامەكەیان كە شتێك بوو بەناوی (بابەتیبوون)ەوە، وەڵامێكی زۆر باش بوو.

تا ئەو وەختە ڕۆژنامەكان بەشێوەیەكی تایبەتو كەسییانە چارەسەری هەواڵەكانیان دەكرد، زۆربەی پەیامنێرانیش خۆیان وەك West-brook pegglers ی سەدەی نۆزدە دەهاتە بەرچاو، زۆربەی ئەوەی دەشیاننووسی، بریتی بوو لە كات بەسەر بردنو دڵخۆشكردن، بگرە بایەخیان بە گواستنەوەی ڕاستییەكان بۆ خەڵك نەدەدا. ئەوانە توانیان ڕاستگۆیانە پەرە بە دەسكەوتو ئامانجەكانیان بدەنو بە چێژو خۆشیشەوە گورزیان لە دوژمنانیان وەشاندو كاتێكی كامەرانیان بەسەر برد، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ئامانجو دەسكەوتانە – بەشێوەیەك لە شێوەكان– لەنێو ئەو تێكەڵاویی و پشێویەدا ڕوویان لە نەمانكرد.

ئاژانسی ئاسوشیتدپرێس هەر لەسەرەتاوە دەركی كردووە كە مەحاڵە بتوانێ وەڵامی خواستەكانی هەموو ئەوانە بداتەوە كە خزمەتەكانی ئاژانسەكەیان پێ دەگات، بۆیە لەڕێگەی دۆزینەوەی ڕێساو پرۆگرامی (بابەتیبوون)ەوە لە ڕوومالی هەواڵیدا دەستی بە گۆڕینو ڕاستكردنەوەی هەڵوێستەكە كرد، قۆناغ بە قۆناغو لەگەڵ تێپەڕبوونی كاتیشدا ئەو ڕێسا شۆڕشگێڕییە قبووڵ كرا، بگرە لەسەرتاسەری وڵاتدا بوو بە مادەی ژمارە (١) لە پەیڕەوی ڕۆژنامەگەریی بەرپرسدا، ئەو ڕێسایە توانی ڕووی جیهانی ڕۆژنامە بە تەواوی بگۆڕێ، هەروەها بناغەی نموونەی نیو سەدەی پەرەپێدانی ڕۆژنامەوانانی دانا.

– لە ئێستادا، بیرۆكەی ڕوومالی هەواڵیی بابەتیی سروشتی دووەمی هەموومانە مادام مەسەلەكە بەو جۆرەیە، پێمان وایە كاتی ئەوە هاتووە بوەستینو بیر لە دیاریكردنی ئەو بابەتیبوونە بكەینەوەو پێناسەی بكەین. سەبارەت بەوانەش كە

یەکەم جار دایانهێناو بانگەشەیان بۆ کردووە، بابەتیبوون مانای وابووە کە ڕووداو (The Fact) لە دەرەوەی لاپەڕەی بۆچوون — تا کەشتی زامنکراوە لە ڕۆژنامەدا. ئەرکی پەیامنێری ڕۆژنامەوانیش ئەوەبووە کە وردەکاری ساردو وشك‌و نەزۆك دەربارەی ئەوەی ڕوویداوە پێشکەشی خوێنەرانی بکات، خۆ ئەگەر هەوڵی پێشکەشکردنی زیاتری بدایە، ئەو وەختە وەك ئەوە بووە کە لەسەر خاکێکی مەترسیداردا دەستی بە جموجوڵێك کردبێ — بەوپێیەی خۆی خزاندۆتە نێو مافی خوێنەرەوە لەوەی بڕیاری تایبەتی خۆی بدات.

لە دە ساڵە یەکەمەکانی ئەو سەدەیەشدا، ڕۆژنامەگەریی بەرپرسیاری ئێمە بە گوێرەی ئەو تیۆرە کاری کردووە کە دەڵێ: باشتر وایە هیچ شتێك بە خوێنەران ڕانەگەیەنیت، لەوەی بەهەڵەیان ببەیت‌و دەسخەڕۆیان بکەیت. ڕۆژنامەگەریی دوێنێ —وەك چۆن ئێمە هەوڵ دەدەین— هەوڵی داوە ڕاستیەکان بۆ جەماوەرو ڕای گشتیی بگوازێتەوە، بەڵام ترساوە لەوەی هەوڵبدات تەواوی ڕاستیەکان بگوازێتەوە، بایەخیشی زیاتر بە زامنکردنی ئەو شتانە داوە کە پێشکەشی کردوون —واتە بڵاوی کردوونەتەوەو دابەشی کردوون— ئەو شتانەش بێگومان جگە لە ڕاستی هیچی تر نەبوون.

(ڕۆژنامەگەریی دوێنێ) بەپێی لێکدانەوەیەك کاری کردووە کە مەحاڵ بووە بۆ ڕۆژنامە، ڕاستی، هەموو ڕاستی، هیچ شتێك جگە لە ڕاستی بڵێ.

لە ڕابردوودا بنەمای ڕوماڵی هەواڵیی بابەتی وردو توند، خۆڕاگرو بەهێزو جێگیر بووەو توانیویەتی کەشوهەوایەکی وا دابین بکات کە تیایدا ڕۆژنامە لەو وڵاتەدا بتوانێ قۆناغی گەنجێتی بەهێز— کە هیچ خەمێکی نییە— بەرەو قۆناغی کامڵی‌و بەرپرسیاریەتی ببڕێ. بابەتیبوون بنەما سەرەکیەکانی هەرزەکارییەکی هێمن‌و زامنکراوی بۆ ڕۆژنامەگەریی ئەمەریکیی دانا، بەڵام بێگومان لە کاتێکی واداسەری هەڵدا کە دەبێ تیایدا هەرزەکاری پێشوو خۆی بە بەروبوومە قەدەغەکراوەکان تاقی

بکاتەوە، ئەگەرچی پێشتر فێرکراوە کە مەترسیدارن، ئێستاش کاتێکی لەو جۆرە بۆ ئێمە زەحمەتە.

# بردنەوەی متمانەی خوێنەر

# Wining Reader Confidence

یەکەم: چۆن وردبین دەبیت؟

١-زانیارییەیە ناڕاستەوخۆکان

٢-دڵنیابوون لە ڕاستیی زانیارییەکان

٣-شیاویی.

٤-تاقیکردنەوەی ڕێکوپێك

٥-کاریگەریی تەواو

دووەم: سەرچاوە

١-وەرگرتنی ڕاستەوخۆ

٢-دانە پاڵ (الاسناد)ی ناڕاستەوخۆ

سێیەم:تێکۆشانو ماندوو نەبوون

چوارەم: ملکەچکردن بۆ یاسا

پێنجەم: مافی دانانو بڵاوکردنەوە

شەشەم: چۆن خۆت لەناوبانگزڕاندن دوور دەخەیتەوە؟

١-ناوبانگزڕاندن چییە؟

٢-وشەی مەترسیدار

٣-گومانکردن

٤-زەرەرمەندییەکان

٥-بەرگریکردنەکان

٦-زامنکردنی سەلامەتی

سکاڵای سەرەکی ڕەخنەگرانی ڕۆژنامە، واتە بۆ هەموو ئەوانەی دەیخوێننەوە، لایەنگیریکردن (تووڕەیی Bias) نییە لە ڕێگەی شێواندنو بزرکردنو بێدەنگی، هەروەها پێشێلکردنی ژیانی تایبەتیو ڕووژاندنیش نییە بە هەموو شێوەکانییەوە، بەپێچەوانەوە، خوێنەری ئەمەریکیی ئەو ڕۆژنامەیە بەباش دەزانێ کە دیدو بۆچوونێکی هاوشێوەی بۆچوونی تایبەتی خۆی پێشکەشبکات، تەنیا ئەوکاتانەش تووڕە دەبێ کە دژی هەڵوێستی ئەو بێ. بەباشترزانینی ئەو ڕۆژنامانەی کە تایبەتن بە پێشکەشکردنی درێژەی سەرنجڕاکێش لەلایەن خوێنەری ئەمەریکییەوە، بوونی هەر تووڕەبوونێك لەو ڕۆژنامانەدا دوور دەخاتەوە.

خوێنەری ئاسایی ئەمەریکیی نەبوونی وردبینی (ناڕاستی – چەوتیی Inaccuracy) بە هەڵەی گەورەی ڕۆژنامەوانی دەزانێ – هەواڵە گونجاوەکان لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی لایەنی دیکەدا مەدرکێنە، بەڵکو ئەوانە بڵاوبکەرەوەو دەربخە کە لەگەڵ بەرژەوەندییو هەڵوێستەکانی خۆتدا دەگونجێن، بەڵام لە ڕێگەی ڕاستیەکانەوە ئەوە ڕوون بکەوە کە دەتەوێ بیلێیت، بێ ئومێدیەکی گەورەیە کاتێك بەڵگەیەکت ڕووبەڕوو بکرێتەوە دەربارەی ئەوەی شتێکی ساختە هەیەو مرۆڤ دەیەوێ باوەڕی پێ بکات، هەمان شت دووبارە دەبێتەوە کاتێك چیرۆکێکی سەرنج ڕاکێش دەری دەخات کە ڕاست نییە، ئەو وەختە چێژەکەشی لە دەستدەدات.

خوێنەران لەو وتەیەدا کە دەڵێن: باوەڕ بە هەموو شتێك ناکەن کە لە ڕۆژنامەکاندا دەیخوێننەوە زۆر جیدی نین، چونکە لە ڕووی کردەییەوە زۆربەی ئەوەی دەیزانن سەرچاوەکەی ڕۆژنامەیە. ئەوان بە زۆری وتەی (تەنیا قسەی ڕۆژنامەیە) بۆ ئاماژەکردن بەو چیرۆکە بەکاردێنن کە نایانەوێ باوەڕی پێبکەن، ئینجا ئەگەر ڕاستیش بێ.

بەوپێیەی سەرنووسەران بەتەواوی ئاگاداری ئەو لایەنانەی هەڵسوکەوتی کۆمەلایەتی خوێنەرنو لەبەر ئەوەی هیچ هۆکارێك نییە ڕێگە لە ڕۆژنامە بگرێ کە لە

چیرۆکە هەواڵییەکانیدا بە تەواوی ناوردبین‌و نا ڕاست بێ، بۆیە یەکەم وانە کە دەبێ ڕۆژنامەوانی تازە دەستبەکاربوو فێری ببێ چۆنیەتی دوورکەوتنەوەیە لە هەڵەکردن.

هەندێك ژووری هەواڵنووسین – تەنانەت لە شارە گەورەکانیشدا – هەن کە تا ڕادەیەك چاوپۆشی لە فەرامۆشکردن دەکەن، بەڵام ژمارەی ئەو ژوورانە زۆر نین.

## یەكەم: چۆن وردبین دەبیت؟

## How To Be Accurate?

ئەگەرچی نووسەرێكی هەواڵ نییە لە پێناوی هێنانەدی تام و چێژێكی كەسییدا هەڵە بكات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توێژینەوەیەك كە لەلایەن پرۆفیسۆر میشێل كارنلییەوە لە زانكۆی مینیسۆتا ئامادەكراوە، دەریخستووە كە هەڵەی زۆر لە هەر سێ ڕۆژنامەی ناوەندیی ئەمەریكییدا ڕوو دەدەن، لە كۆی ٥٩١ چیرۆكی هەواڵیدا كە كارنلی لەڕێگەی ناردنی فۆرم بۆ ئەوانەی ناویان لە چیرۆكەكاندا هاتووە یان ئەو كەسانەی لە پێگەیەكدان و شارەزای چیرۆكەكانن، توانیویەتی لە ڕاست و دروستیان وردبێتەوە، بۆی دەركەوتووە تەنیا ٣١٩ چیرۆك (واتە ٥٤٪) هیچ جۆرە هەڵەیەكیان تیادا نەبووە. هەروەها بۆی دەركەوتووە كە كۆی هەڵەكانی نێو چیرۆكە هەواڵییە ناوردونارێك و ناڕاستەكان Inaccurate گەیشتۆتە ١,٦٧ هەڵە، ئەوەی مایەی سەرنجیشە ٣٤٪ی ئەو چیرۆكە هەواڵییانەی پەیامنێران دایانڕشتوونەتەوە ڕاستن، لە كاتێكدا ٦٢٪ی ئەو چیرۆكانەی لەڕێگەی ڕاگەیاندن و بەیاننامەی ڕۆژنامەگەریی گشتییەوە لەسەرچاوە ڕەسەنەكانەوە وەرگیراون، هیچ هەڵەیەكیان تێدا بەدی نەكراوە.

هۆی ئەمە چییە؟ با وا بزانین چەند هۆکارێکی هەیە، لێرەوە باسیان دەکەین هەروەها گرنگترین ئەو پێشنیازانەش دەخەینە ڕوو کە دەبنە مایەی خۆ ڕزگارکردن و دوورکەوتنەوە لەو هەڵانە:

## ١- زانیارییە ناڕاستەوخۆکان Second–handInformation

زۆربەی هەرە زۆری ئەو زانیارییانەی لەلایەن پەیامنێرانی ڕۆژنامەوانییەوە کۆ دەکرێنەوە زانیاریی ناڕاستەوخۆن، واتە زانیاریی لە سەرچاوەکانیانەوە وەرنەگیراون (Second- hand Information).

بێگومان سەرچاوەی هەواڵەکان – لەوانەیە لە خودی پەیامنێران زیاتریش – بەرپرس بن بەرامبەر بەو هەڵانەی کە لە هەواڵەکاندا ڕوودەدەن:

ئەو هەڵانەش کە ڕاگەیەنەرانی هەواڵەکان ئەنجامیان دەدەن دوور نییە بە مەبەست و ئەنقەست بن و لەوانەشە وانەبن، کاتێکیش هەڵەکان مەبەستداربن، سەرچاوەی هەواڵەکان هۆکاری ڕاگەیاندنی نیوەی ڕاستییەکان یان ناڕاستییەکانە، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست نەبن ئەوکاتە سەرچاوە دەبێتە شایەتێکی خاوەن هەڵە، یان کەسێکی خەیاڵ بڵاو.

دەستکاریکردنی شەهادەت و کاریگەرییە هەمە جۆرەکان یاخود ئەوەی بە بیرکردنەوەی خوازراو ناوزەد دەکرێ، دەبێتە مایەی هەڵەکردن لە تێبینی و چاودێریکردن و بیرکەوتنەوەدا، ئەمەش لەلایەن دەروونناسانەوە توێژینەوەی لەبارەوە کراوە بە جۆرێك هیچ گومانێك نەماوە کە پەیوەندی بە ڕاستیی بەرتەسکی نووسەرەوە هەبێ لەوەی لە کاتی ئەنجامدانی گفتوگۆو دیمانەکاندا وەڵامی وردی دەست بکەوێ و بە دوای ڕاستییەکاندا بگەڕێ. چەکی پەیامنێر لە دژی بوونی ناوردبینی لەلایەن سەرچاوە یان نەبەخشینی زانیاریی دروست و باوەڕپێکراو، دڵنیا بوونە لە ڕاستی زانیارییەکان و بەدواداچوونی وردیی و دروستیی و ڕاستگۆیی ئامانجەکان.

کاتێك پەیامنێر پشت بە گێڕانەوەی تەنیا تاکەکەسێك نەبەستێ و گفتوگۆ لەگەڵ زۆرترین ژمارەی خەڵك دا بکات، بێگومان دەتوانێ زۆر لەو هەڵانە ڕاستبکاتەوە کە لە قۆناغەکانی یەکەمی پرۆسەی کۆکردنەوەی بابەت سەبارەت بە ڕووداوێکدا ڕوویانداوە، خۆ ئەگەر پەیامنێر – هەردوو ئەرکەکە– کۆکردنەوەی بابەت و نووسینی هەواڵ– بەبێ لایەنانە ئەنجام بدات، ئەو وەختە هەر هەڵەیەکیش بکات، بێگومان مەبەستدارو بەئەنقەست نابن، بوونی جیاوازیی لە گێڕانەوەی دوو کەسدا کە دیمانەت لەگەڵدا کردوون، پێویستی بە ئاگاداریی بێ لایەنی هەیە، لە پێناوی هێنانەدی ئەو ئامانجەشدا ڕۆژنامەکان کۆششێکی بێ وێنە دەخەنە گەڕ.

زیادکردنی ڕستەیەکی وەك: "نەتوانرا پەیوەندی بەڕێزدار سمیسەوە بکرێ بۆ وەرگرتنی بۆچوونی ئەویش" بۆ سەر هەواڵەکان لەوانەیە ببێتە مایەی هێنانەدی دادوەریی و هاوسەنگیی لە پێشکەشکردندا، بەوپێیەی وەك هەوڵێك وایە بۆ هێنانەدی وردبینی و بێ لایەنیی.

بێزاریی پەیامنێران لەدژی ناڕازیبوونی زۆر لە سەرچاوەکان سەبارەت بە بەخشینی زانیاریی زیاتر لەوانەی کە لە بڵاوکراوەو ڕاگەیاندنە فەرمیەکاندا هەن، ڕوو لە زیادبوونە، مەبەستیش ئەو زانیارییانەن کە پێشتر زۆر بە وردی ئامادەکراون. لە نێوان پەیامنێرو سەرچاوەی سەرەکی زانیارییەکانیشدا ڕاوێژکاری پەیوەندییە گشتییەکان ڕاست دەبێتەوە، ئەو جۆرە کەسانەش –لەڕاستیدا– وەزیفەیەکی بەسوود بەجێ دەگەیەنن، بەو پێیەی هیچ ڕۆژنامەیەك توانای بەکارهێنانی ئامێرێکی ئەوەندە گەورەی نییە کە بتوانێ هەموو چالاکیە کۆمەڵایەتییەکان ڕوومالْ بکات، لەلایەکی دیکەوە، دەکرێ ئەوانە بۆ ئەو پەیامنێرانە سوودبەخش بن کە مەبەستیانە زانیاریی زیاتر – کە لە بڵاوکراوەی ڕۆژنامەوانیدا نین– وەربگرن یان ئەوانەی بەدوای چیرۆکێکی ڕەسەندا دەگەڕێن.

دەبێ ئەوەشمان لە یاد نەچێ کە پیاوانی پەیوەندییە گشتییەکان بۆ پێشکەشکردنی گەورەترین خزمەت بە بەرپرسانیان بەکارهێنراون، واتە هەمیشە لە

پێناوی هەڵخەڵەتاندنیاندا دەبێ شێوازو ڕێگەی تازە بدۆزرێتەوە، ئەو پەیامنێرەش کە تەنیا مەبەستییەتی ئەو زانیارییانەی دەستبکەوێ کە لە بڵاوکراوەی ڕۆژنامەوانیدا هەن، لەوانەیە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ببێتە پەیامنێرێكو هیچی تر.

## ٢-دڵنیابوون لە ڕاستیی زانیارییەکان Verification

دڵنیابوون لە ڕاستیی چیرۆکێکی هەواڵیی، گەورەترە لە تەنیا پشکنینو لێکۆڵینەوە لە ڕاگەیاندنو وتەی چەند سەرچاوەیەك و بەراوردکردنیان لەگەڵ یەکتردا، بەڵکو مانای گەڕانەوە بۆ سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانیش دەبەخشێ، ئەوانەی لە وردبینی نووسینی ناوو ناونیشانو شتی دیکەی گرنگدا پشتیان پێ بەستراوە، بەتایبەتیش لە چیرۆکە هەواڵییە پەیوەندیدارەکان بە پۆلیسو دادگایی کردنەکان کە تیایاندا پاساوی بێ تاوانی یان بایەخنەدان بەرگرییەکی دروستیان لە دژی ناوبانگ زڕاندن پێ نابڕێ.

کاتێك ڕۆژنامە هەواڵیی بڵاوکردنەوەی چیرۆکێکی هەواڵیی (بە گومان) دەدات، ئەوا ئەگەرچی لەوانەیە خۆی تووشی کێشە بکات بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێ بڵاوی بکاتەوە، بەڵام ئەو چیرۆکە هەواڵیانەی کە دوورن لە ڕوودان، ئەو وەختە باشتروایە ڕۆژنامە تا چاپی داهاتوو و دڵنیابوون لە ڕاستییەکانیان، بڵاوکردنەوەیان دوا بخات.

زۆر جار کەسایەتییە گشتییەکان زانیاریی بە پەیامنێران ڕادەگەیەنن بەڵام دواتر لێیان پەشیمان دەبنەوە، ڕۆژنامەوانی ئاساییش پێی وایە کە ڕۆژنامە دەبێ دەقی وتەکانی ئەو کەسایەتیانە (بە چاکەو خراپییەوە) بڵاوبکاتەوە، دواتر بە ڕوویاندا بوەستێتەوەو سووربێ لەسەر ئەوانەی ڕاستو دروستن.

هەروەها ڕۆژنامەوانی ئاساییە کە بڕوای بە گرنگی ڕەتکردنەوە یان بە درۆخستنەوەی کەسایەتیە گەورەکان هەیە، تەنانەت ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە

درۆیەکی گەورەشەوە هەبێ، بۆیە زۆربەی سەرنووسەران چیرۆکی هەواڵیی لای خۆیان دەپارێزن، تا ئەو کاتەی بواری پشکنین‌و دڵنیابوون لە ڕاستیەکانی بۆ ڕێك دەکەوێ، ئینجا ئەو دەرفەتە ئەگەر لە ڕێگەی پشتبەستن بە چالاکیی پەیامنێرێکی لەکاروەستێنراویشەوە بێ.

ڕێبەری ژمارەی تەلەفۆنەکان‌و سەرچاوەکانی پەیوەندیدار بە شارو لاپەڕەی ڕۆژنامەو کتێبە تایبەتی‌و گشتیەکان، ئەمانە هەموویان لەبەردەستی پەیامنێردان بۆ ئەوەی دڵنیابێ لە ڕاستی ئەو زانیارییانەی کۆیاندەکاتەوە، بۆیە دەبێ بەکاریان بهێنێ.

بەڵام لە دیمانە ڕۆژنامەوانییەکاندا، تا ئەو کاتەی پەیامنێر دڵنیادەبێ لەوەی کە بە تەواوی گوێبیستیان بووە، دەکرێ زانیارییەکان دووبارە بکرێنەوە، ئەگەر دیمانەکەش لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە بێ، پەیامنێر دەبێ دڵنیابێ لە دروستیی زانیارییەکان‌و نووسینی ناوەکاندا.

## ٣-شیاویی Qualification

کاتێك پەیامنێر لەڕووداوە بنەڕەتییەکانی نێو چیرۆکێکی هەواڵیی دڵنیابێ، بەڵام هێشتا کەمێك گومانی لە چەند وردەکاریەك هەبێ، ئەو وەختە بەر لەوەی بتوانێ ئەو مەسەلەیە یەکلا بکرێتەوەو چیرۆکەکەش لە چاپی یەکەمدا بڵاوبکرێتەوە، وا باوە پەیامنێر هەوڵی (شیاندن Qualify)ی نووسینەکەی بدات، بەم جۆرەی خوارەوە:

"ئەمڕۆ پۆلیس پیاوێکی سەرگەردانی لە فۆریست پارك دۆزیەوە، وا پێ دەچێ هیلەر سوانسۆن بێ‌و یەکێك بێ لەو کەسانەی بیرو هۆشیان لە دەستداوە، ئەو لە ڕێگەی ئەو دەفتەرچەکانەوە کە لە گیرفانەکانیدا دۆزراونەتەوە ناسراوەتەوە".

هەروەها دارشتنی هەواڵەکان بەم شێوازەی خوارەوە وا لە خوێنەر دەکات هەست بکا کە ڕۆژنامە بەپێی توانا هەوڵی خستنە ڕووی ڕاستییەکان دەدات:

"ئاگرێك كه پێشبینی دەكرێ لە ئەنجامی بەهەڵە ڕاكێشانی تەلی كارەباوە كەوتبێتەوە، بووە مایەی زیانگەیاندنێكی مادیی- كە بەنزیكەی ٥٠٠ دۆلار مەزەندە دەكرێ- بە دانیشتوانی ١٥١٤ شەقامی مۆرفی پالاس، كە و.ب. ڕایان و خێزانەكەی و هەر سێ منداڵە بچووكەكانیانن".

"ئەمڕۆ أ. هوكینزی پارێزگار ڕایگەیاند كە لە هەڵبژاردنەكانی داهاتوودا خۆی هەڵنابژێرێ، بەڵام فرید باكوتی ڕاوێژكار كە هەڵمەتی هەڵبژاردنەكانی ڕابردووی بەڕێوە برد، دووپاتی كردەوە كە (لە كاتی گونجاودا، ڕاگەیاندنێكی گونجاو دەردەكرێ)و (دۆستو برادەرانی ئەو هەواڵەیان پێ خۆش دەبێ)".

دەبێ ئەوە ڕوونو ئاشكرابێ كە بە زۆریی لەو كاتانەدا هەڵەڕوو دەدات كەپەیامنێر خۆی بۆ خۆیخەملاندن بكاتو مەزەندە بكات، ئەو جۆرە نەریتەش كە هەڵقولاوی گوێنەدانو بێ بایەخییە، نەوەك تەنیا بەپێی دیدو بۆچوونی ڕۆژنامەی خۆپەرستو بەرتەسك بەكارێكی نابەجێ لەقەڵەم دەدرێ، بەڵكو لەڕووی ئەخلاقیشەوە ڕەتدەكرێنەوەو سەركۆنە دەكرێن. ئەو خێراییەی ڕۆژنامەی پێ دەردەچێ و بەربەستەكانی تریش كە لەڕووماڵكردنی هەواڵەكاندا ڕووبەڕووی وردبینی دەبنەوە، بوونی ژمارەیەك هەڵەو هەڵخلیسكانی كەم دەكەن بە مەسەلەیەكی حەتمی. ڕۆژنامەش ئەگەر زۆر هەوڵی ڕاستكردنەوەی هەڵەكان بداتو بەڵگەش بخاتەڕوو بۆ ئەوەی بە پێی توانا هەوڵی دەستەبەركردنی وردبینی پێویست دەدات، ئەو وەختە خوێنەری خۆ بەزلزان بەدرێژایی ژیانی تەنیا لەبەر ئەوەی لە یەكێك لە بۆنەكاندا بە هەڵە ناوی ناسیاوێكی بڵاوكراوەتەوە، دەسبەرداری ڕۆژنامەكە نابێ.

## ٤-تاقیكردنەوەی ڕێكو پێك Systematic Checking

لە ناوەڕاستی پەنجاكانەوە، هەردوو ڕۆژنامەی Star و Tribune كە لە میناپۆلس دەردەچن، نووسینگەیەكی تایبەت بە وردبینیو بێ لایەنیان دروست

کردووە "بۆ ئەوەی بە نەرمی مامەڵە لەگەڵ هەرکەسێکدا بکات کە پێی وابێ لە چیرۆکە هەواڵییەکانی هەردوو ڕۆژنامەی ناوبراودا بەشێوەیەکی نا دادوەرانە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە".

هەموو ڕۆژێك بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ژمارەیەك هەواڵ دەستنیشان دەکرێن‌و بۆ ئەو کەسانە دەنێردرێن کە تیایاندا ناویان هاتووە، لەگەڵ تکاکردن لێیان کە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوە بدەنەوە:

أ-ئایا ناوی کەس یان دەزگاکان بە تەواوی نووسراون؟

ب-ئایا ناونیشان‌و تەمەن‌و ناوبانگ یاخود هەر زانیارییەکی پێناسەیی دیکە وردو ڕاستن؟

پ-ئایا چیرۆکی هەواڵیی ڕووداوەکان بە شێوەیەکی بێ لایەن‌و واقعبینانە دەخرێنەڕوو؟

ت-ئایا چیرۆکی هەواڵیێکە هەموو زانیارییە بنەڕەتیەکان دەگرێتە خۆی؟

ج-ئایا ناونیشانی هەواڵەکە بە وردییەوە نوسراوە؟

شوێنێکی بەتاڵیش بۆ ڕاستکردنەوەو بۆچوونەکان جێ دەهێڵرێ، لەماوەی شەش هەفتەدا لەکۆی ٤٩ کەس، (٢٩) یان وەڵامی ئەو نامانەیان دایەوە، زۆربەی وەڵامەکان هیچ ڕەخنەیەکی دوژمنکارانەیان بەرامبەر بە ڕۆژنامەکە نەگرتبووە خۆ، بەڵکو ستایشی کارەکانیان کردبوو، ئەوانەش کە هەڵەیەکیان بەدی کردبوو دەکرێ بخرێنە ئەم گرووپانەی خوارەوە:

أ-ئەو کەسانەی هەڵەی سووکیان بە نووسینی ناوو ناونیشان‌و پلەو پایەو ناوبانگ بەدی کردبوو، ئەو سکالایانە دروستن‌و بەشێکی ئەم کێشەیەن کە کۆتایی نییەو ڕۆژانە هەموو کرێکارێك لە ڕۆژنامەدا بەبێ وەدیهێنانی سەرکەوتنی تەواو بۆی تێدەکۆشن.

ب-ئەوانەی لە ناونیشانی هەواڵەکاندا جۆرە ناڕاستیەکیان لە شرۆڤەکردن‌و ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکاندا بەدی کردووە، ئەو سکالایانەش دروستن، بەڵام وا دیارە

حەتمین بە گوێرەی ئەو بارودۆخ و مەرجانەی کە چاودێرانی چاپی دوایی کاری پێ دەکەن.

پ-بێ ئومێدان، ئینجا چ لەبەر ئەوەی چیرۆکی بڵاوکراوە تەنیا بە بڵاوکردنەوەی دیدو بۆچوونەکانیان نەوەستاوە، یان وەکو پێویست کێشەو وردەکارییەکانی نەخستوونەتە ڕوو، یاخود بەگوێرەی بۆچوونی یەکێکیان، چیرۆکە هەواڵییەکە لە هەموو حاڵەتێکدا ناتەواو دەبوو، چونکە ژمارەیەکی گەورەی خوێنەران بیرو هزری هەڵەی لێ وەردەگرن "بەو پێیەی چیرۆکێکی ئاڵۆزەو چارەسەری حاڵەتێکی زۆر ئاڵۆزی (ئیفلاسبوون) دەکات".

ت-ئەوانەی نەیانتوانیوە لەبارودۆخی ڕۆژنامەکە بگەن و وەکو پێویست هەڵی بسەنگێنن، هەندێك خوێنەر هیچ زانیارییەك دەربارەی چۆنیەتی نووسینی هەواڵ و کۆت و بەندو سنوورەکانی ڕووبەرو کات نازانن کە پەیامنێر لە ژێر سایەیاندا کار دەکات.

خوێنەرێك گلەیی لەو چیرۆکە هەواڵییە دەکات کە دەربارەی تیمەکەی بڵاوکراوەتەوە، گوایە ئەو زانیارییانەی تێدا نەبووە کە چەند مانگێك لەمەوبەر بۆ سەرنووسەری ناردوون نەوەك بۆ نووسینگەی نووسینی هەواڵەکانی شار.

هیچ کەسێك لەناو ئەوانەدا نەینووسیبوو: "هەموو ئەوەی کە لەو چیرۆکە هەواڵییەدا هاتووە هەڵەیە".

کاتێك بابەتی ڕاستکراوە وەردەگیرێ، ڕەوانەی لای بەڕێوەبەری نووسینی پسپۆڕ دەکرێ، پاشان ئاراستەی یارمەتیدەرو نووسینگەی نووسینی هەواڵەکانی شارو دواتر پەیامنێر دەکرێ.

زۆر کەمیش ڕێکدەکەوێ ڕاستکراوەی ئەو هەڵانە یەکسەر بڵاو بکرێنەوە، سەرەتا بەهۆی تێپەڕبوونی کات و پاشان لەبەرئەوەی بنەڕەتی نین، بەڵام وەکو پرۆسەیەکی پشکنین و تاقیکردنەوەی بەردەوام سوود لەو نامانە وەردەگیرێ، نەوەك تەنیا لەبەر ئاستی وردبینی و ڕاستگۆیی، بەڵکو بۆ چارەسەرکردنی هەواڵەکان و شێوازی داڕشتن و

نووسینیشیان، لە دوای تەواوبوونی پرۆسەكانی ڕاستكردنەوەش، هەموویان دەخرێنە نێو چوارچێوەیەكو لەسەرەوەی لاپەڕەی ناوخۆدا لە ژێر ناونیشانی "ڕاستكردنەوە" بڵاو دەكرێنەوە. وا دیارە ڕۆژنامە دووپاتی دەكاتەوە كە هەڵەی لەو جۆرەی كردووەو بە هیچ شێوەیەكیش هەوڵی خۆدزینەوە لەو بەرپرسیارێتییە نادات.

## ٥-كاریگەریی گشتیی Total Effect

دەكرێ ڕاپۆرتە هەواڵێك لە هەموو ئەو هەڵانە ڕزگار بكرێ كە پەیوەندیان بە ڕووداوو دارشتن‌و نووسینی ناوو هی ترەوە هەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاپۆرتە هەواڵ بەناتەواوی دەمێنێتەوە كاتێك ئەو لێكدانەوە گشتیەی دەیبەخشێ هەڵە بێت. ئەمەش – وەك چۆن چەند جارێك لە بەشەكانی پێشەوەدا ئاماژەی پێ كرا– دەكرێ ئەوكاتە ڕوویدات كە ڕاستییەكانی پەیوەند بە بابەتێك فڕێ بدرێن یان دوور بخرێنەوە، یان پاساو و بیانووەكان فەرامۆش دەكرێن، یاخود ئەو كاتەی بە ئاشكرا پەیوەندییەكانی هۆكارو ئەنجام نەخرێنە ڕوو، هەروەها لە چەندین حاڵەتی دیكەی هاوشێوەدا.

ڕوومالی هەواڵیی هەمەلایەن‌و تەواو باشترین شێوازی پارێزگارییە لە دژی شێواندنی نا ئەنقەست، بۆ نموونە، لەوانەیە چیرۆكە هەواڵێك دەربارەی ڕووداوێكی دەسگیركردن بەهۆی لێخوڕینی خێرا هیچ هەڵەیەكی تێدا نەبێ، بەڵام ئایا ئەو ڕوومالّ كردنە وردو دروست دەبێ ئەگەر تیایدا ئاشكرا نەكرابێ كە شۆفێری ئەو ماتۆرسكیلە ئەو كاتە بەڕێگەوە بووە بۆ ڕزگاركردنی كوڕە بریندارەكەی؟ بەبێ ئەو بڕگەیە، لەوانەبوو پێشەكیی چیرۆكی هەواڵیی داهاتوو مەبەستێكی هەڵەی ببەخشیبایە، بەڵام وا دیارە پەیامنێر پرسیویەتی: "لەبەرچی؟".

شیکاغۆ – لەماوەی هەفتەی دووەمی ئەو مانگەدا، ژمارەی ئەو کەسانەی بێکارن‌و قەرەبوویەك وەردەگرن بە بڕی ١٥٤ کەس ڕووی لە دابەزین کردووە، ئامارەکانیش وادەردەخەن کە زیاتر لە ٣٠٠٠ کەس لەوانە بەهۆی تەواوبوونی ئاستی شیانیان، ناوەکانیان لە تۆمارەکاندا دوورخراونەتەوە.

پرۆفیسۆر دیڤیدماننگ‌و وایت لە زانکۆی بۆستن، ڕۆژنامەگەریی ئاگادار کردەوە لەوەی ببێتە هاویەش لە هێنانەکایەی کەشو هەوایەك لەلاگیری‌و بڵاوەکردنی ڕاگەیاندنێکی بۆگەن، ناوبراو لەکاتی ڕاگەیاندنی ئەو ئاگادارییەدا هەندێك لەو ڕاپۆرتانەی لە خەیاڵدا بوو کە ڕۆژنامەکان بەبێ بوونی هیچ بەڵگەیەك، کۆمەڵێك تۆمەتیان لەسەر زاری چەند ئەندامێکی ئەنجومەنی پیرانەوە بڵاو کردبوەوە، جگە لەوە ڕێگەیان بەو کەسانە نەدابوو کە تۆمەتبارکرابوون، بەرگری لەخۆیان بکەن.

هەنگاوی یەکەم بۆ دوورکەوتنەوە لەناوردبینی لەڕووماڵی هەواڵیدا خۆی لەوەدا دەنوێنێ کە ڕۆژنامە لەهەر چیرۆکێکدا کە لەوانەیە بەشێوەیەك لە شێوەکان ببێتە مایەی ناکۆکی‌و مشتومڕ، هەوڵی دەستەبەرکردنی بۆچوونی بەرامبەریش بدات. بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنی نادروست‌و ناوردبین، –تەنیا لەبەر ئەوەی لە کەسایەتیەکی گرنگەوە وەرگیراون– بەهیچ شێوەیەك مانای ڕووماڵی هەواڵیی وردو دروست ناگەیەنێ.

–کایرۆ– ١٤ی تەمووز (أ.ب): ئەمڕۆ لە میانەی وتارێکیدا، ولیەم ماکلی، سەرۆکی لیژنەی دووبارە شیاندنەوەی ئەمریکی لە ئەلینویزی بەوە تۆمەتبار کرد کە گواستنەوەی دووچاربوان بە نەخۆشی شێرپەنجە لە نەخۆشخانەی هاینز بۆ شیکاغۆکلینیك، هیچ هۆکارێکی لە دواوە نەبووە تەینا ئەوە نەبێ کە قوربانیانی ئەو نەخۆشیە بکرێن بە کێڵگەیەك بۆ تاقیکردنەوە.

ماکلی ئەوەشی بە کۆنگرەی تیپی پێنجەمی ئەمریکی ڕاگەیاند کە نەخۆشخانەی هاینز ساڵانێکی دوورودرێژە بەهۆی هەوڵ‌و کۆششی ئەو تیپە دامەزرێنراوەو ٧٠٠٠ دۆلاریشی بۆ خەرج کردووەو بۆ چارەسەرکردنیش بۆ جاری یەکەم رادیۆمی

بەكارهێناوە، بەم دواییانەش توانیویەتی ٥٠٠ شوێنی دیكەی نووستن بۆ قوربانیان زیاد بكات.

پاش ئەو تۆمەتبار كردنانە، شارل بیكی جێگری بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی جەنگاوەرانی كۆن لە هەرێمی ناوەڕاستی ڕۆژئاوا لە شیكاغۆدا بەم جۆرە هاتە قسە كردن: "لام وایە ئەو ڕاگەیاندنەی باسی لەوە كردووە كەئێمە قوربانیانی شێرپەنجە دەكەین بە كێڵگەی تاقیكردنەوە، بەلای كەم، ڕاگەیاندنێكی قێزەونە، پرۆسەی گواستنەوەكە ماكلی قسەی لەبارەوە دەكات هێشتا ئەنجام نەدراوەو بەلای كەم تا ساڵێكی دیكەش جێبەجێ ناكرێ، لە كاتی گواستنەوەی بنكەی چارەسەركردنی شێرپەنجەشدا، قوربانیان بە جۆرێك چارەسەر دەكرێن كە لانی كەم لەگەڵ چارەسەركردنەكەی هاینزدا یەكسان بێ. جگە لەوە تەواوی نەخۆشخانە، بە پزیشكو پەرستیارو ئامێرەكانیەوە دەگوازرێنەوە. كەواتە چۆن دەبێ ئەمە وەكو گۆڕانێك بەرەو خراپتر وەسف بكرێ؟ ئەمەش خۆی لە خۆیدا بیرۆكەی ژەنەراڵ عومەر برادلییە، ئەو پێی وایە گواستنەوەی ئەو نەخۆشخانەیە بۆ شار باشترەو دەتوانرێ چاكتر خزمەتیان بكرێ لەوەی لە دووری ١٢ میل لە دەرەوەی شارەوە بمێننەوە."

## دووەم: سەرچاوە Authority

ئەوەی تا ئێستا لەو بەشەدا باسی لێوە کراوە، بەو ئاراستەیە بووە کە گەورەترین هێزی پارێکردن کە ڕۆژنامەیەك بۆ چیرۆکە هەواڵێکی دابین دەکات، بریتییە لەناوبانگی گشتی پەیوەندیدار بە ئاستی متمانەو ڕاستگۆیی خودی ڕۆژنامەکەوە.

لە کاتێکدا ئەگەر ئەو ڕۆژنامەیە هەوڵی بەهێزکردنی خۆی دابێ وەکو چاپکراوێکی وردبین‌و ڕاستگۆ و دادوەرو بێ لایەن، ئەو وەختە پێویست ناکات لە یەکێك لە برگەکانی چیرۆکێکی هەواڵیدا پەنابباتەوە بەر دووبارە باسکردن لە سەرچاوەکان.

بەهەرحاڵ و وەکو مەسەلەیەکی کارپێکراوو باو، ئەو ڕۆژنامانەی پابەند دەبن بەوەی هەموو ڕاستیەکی گرنگ بدەنە پاڵ کەسێك، ئەوانە خاوەنی ناوبانگێکن کە زیاتر لە ڕاستیەوە نزیکن.

"کێ ئەمەی گوت؟، نووسەری هەواڵەکانی شار بەم جۆرە لەبەرامبەر پەیامنێرێکیدا هاواری کرد، بەڕێز سمیس کە ناوەکەیت تەنیا لەسەرەتای وتارەکەدا هێناوە، ئەمە بەرگریکردن لەناوبراو نییە بەڵام وەکو تێبینیەك وایە، تۆ لە برگەی پێنجەمدا ئاماژەت بەوە نەکردووە کە بەڕێز سمیس ئەوەی درکاندووە، دەزانم لە پێشەکیەکەدا ئەو باسی لەوە کردووە، بەڵام بەشەکەی تری چیرۆکە هەواڵییەکە وەك بڵێی برگەی سەروتارێکە".

## ١-وەرگرتنی ڕاستەوخۆ Direct Quotation

بۆ ئەوەی نووسەری زیرەك خۆی لەو جۆرە گلەییە ڕزگار بكات دەبێ چیرۆكە هەواڵییەكانی بەڵگەدار بكات.

"بەرزكردنەوەی پلەی د.س فیرچ ئیلد – ٢٣٠٨– شەقامی دەیەم، ملازمی یەكەم لە بنكەی پۆلیسی ریلرودی سەر بە تیپی میلتاون بۆ پلەی نەقیب و دامەزراندنی لە تیپی لۆگان، ئەمڕۆ لەلایەن ڕونالوبری سەركردەی تیپی میلتنەوە ڕاگەیەنرا".

ئەگەر هەواڵ ڕاستی یان ڕووداوێك بگرێتە خۆی، بێگومان ڕاگەیاندن یان بەیاننامەیەكی لەبارەوە ڕاگەیەنراوە، بەتایبەتیش لەكاتێكدا ئەگەر ماوەیەكی دووروردرێژ چاوەڕوانی شتێكی لەو جۆرە كرابێ، ئەو وەختە دەبێ بە توندی جەخت لەسەر سەرچاوەكەی بكرێتەوە، ئەگەر بشكرێ دەبێ بە پێشەكی دەستی پێ بكرێ، وەك لەم نموونەیەی خوارەوەدا هاتووە: "ئەمڕۆ پارێزگار هێربرت ڤان دوسونی ڕایگەیاند كە تۆمەتی سەرپێچییەكانی مۆڵەتە بازرگانییەكان كە لەلایەن ژووری بازرگانییەوە بەخشراون، ئێوارەی ڕۆژی هەینی داهاتوو ئاراستەی دەستەی ئەنجومەنی شار دەكرێن".

كاتێكیش ئەگەر كارمەندێك هێرش بكاتە سەر یەكێكی تر، دەبێ پێشەكی بەناوی هێرشبەرەوە دەست پێبكات:

"ئەندامی ئەنجومەنی پیران ڕۆلان بیشوبی، ئەمڕۆ جۆزیف دیلینگی بە كەسێكی شێت وەسف كرد، پلانەكەشی سەبارەت بە پشتگیریكردن لە هەر حەوت بەڕێوەبەرایەتییەكانی ویلایەت بە بیرۆكەیەكی دڕندانە بۆ تێكدانی ژیانی گشتی ناوزەد كرد".

پێشەكیەكی لەو جۆرە لە یەكێكی وەك ئەمەی خوارەوە گونجاوترە:

"جۆزیف دیلینگ شێتەو پلانەکەشی دەربارەی پشتگیریکردن لە هەر حەوت بەڕێوەبەرایەتییەکەی ویلایەت بریتییە لە بیرۆکەیەکی دڕندانە بۆ شێواندنی ژیانی گشتی.

ئەمە ڕاگەیاندنی ئەمڕۆی ڕولان بیشوبی ئەندامی ئەنجومەنی پیرانە".

هێرشی ئەندامی ئەنجومەنی پیران بۆ سەر دیلینگی دادوەر بریتییە لە خودی هەواڵەکەو ئەوەش کە وتوویەتی تەنیا بۆچوونێکە، لە کاتێکدا ئەگەر هێرشەکە چەند تۆمەتێکی دیکەی گرتبایە خۆی، ئەوا بێگومان پێویستی بە دەستەبەرکردنی ڕاوبۆچوونی بەرامبەریش دەبوو.

لەو هەواڵانەشدا کە لە ڕاپۆرت یان بەیاننامە یاخود ڕاگەیاندنی ڕەسمییەوە وەردەگیرێن، دەکرێ ناوهێنانی سەرچاوە یان مەرجەع بۆ برگەی دووەمی هەواڵەکە دوابخرێ، زۆر کەمیش ڕێکدەکەوێ لەوە زیاتر دوابخرێ وەك: "بەبەراورد لەگەڵ شارە هاو قەبارەکانی دیکەی ئەمریکادا، بەکارهێنەرانی گازی سروشتی لەمیلتاون نرخێکی بەرزتر دەدەن، ئەمە لە کاتێکدا کە نرخی کارەبا لەو شارەدا لە هەموو شارەکانی دیکەی ئەمریکا هەرزانترە.

ئەم ڕاستیانە لەو ڕاپۆرتەدا ئاشکرا کران کە ئەمڕۆ لەلایەن لیژنەی وزەی فیدراڵییەوە ڕاگەیەنرا".

دەبێ بەم شێوازەی خوارەوە خۆ دووربگرین لە دانانی ڕاگەیاندنێك لە دێڕێکی جیاوازدا:

"ڕۆبرت د.س لەوانەیە بتوانێ شکست بە ل. وودی پارێزگار بهێنێ، ئەمە بۆچوونی دادوەر ك. وندیکە کە دوای نیوەڕۆی ئەمڕۆ ڕایگەیاند."

هەروەها دەبێ ڕەچاوی ئەوەش بکرێ کە هیچ شتێك لە شێوەی ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگردا بڵاونەکرێتەوە، لە کاتێکدا کێشەکە هێشتا لە قۆناغی گفتوگۆکردن دایەو بڕیارێکی فەرمیشی لەبارەوە ڕانەگەیەنراوە.

"لە بەهاری داهاتوودا، باکتسر فیل دەبێتە خاوەنی باڵەخانەیەك کە لە ٢٠ نهۆم پێکدێت، پلانەکانی ئەو باڵەخانەیە ئێوارەی ئەمڕۆ ئاراستەی ئەنجومەنی پلاندانانی شار دەکرێ".

لەو نموونەیەدا ئەنجومەنی پلاندانانی شار هێشتا ڕەزامەندی دەربارەی پرۆژەکە پیشاننەداوە، پەیامنێریش دەیتوانی لە ڕێگەی گفتوگۆکردن لەگەڵ کەسانی دیکەدا –جگە لەوانەی پێشنیازیان کردووە یاخود پێی خۆشحاڵن– لەو ڕاستیە ئاگادار بێتەوە، بۆیە لێرەدا دەکرێ ئەو وتەیە بەکاربهێنرێ کە دەڵێ: بەر لە شکانی هێلکەکان، دەست بە ژماردنی جووجەڵەکان مەکە.

لە نموونەی خوارەوەدا ئەو پلەیە دەردەکەوێ کە ڕۆژنامەی پابەند بە پێشکەشکردنی سەرچاوەی گونجاو بۆ چیرۆکیی هەواڵیی تەقلیدیی دەیگاتێ:

"ئەو مانگرتنەی هەریەکە لە یەکگرتووی شورمانی نێو دەوڵەتیی و کونرادوایت ستارو فیرنس وایتی لاستر ڕایانگەیاندووە، لەوانەیە تەواوی پاپۆڕە بارهەڵگرەکانی سەر بە هەردوو کۆمپانیای نورس جرمانیا و لوید بگرێتەوە.

جوزیف راینی سەرۆکی لۆنگ شورمان ئەمڕۆ دوای ئەوەی پێی ڕاگەیەنرا کە بڕیارە پاپۆڕێکی بارهەڵگری سەر بە کۆمپانیای جرمانیا بگاتە مۆنتریال، ئەو لێدوانەی ڕاگەیاند.

راین لە درێژەی قسەکانیدا وتی: ئەگەر کرێکارانی سەر بە کۆمپانیای دیکە باری پاپۆڕەکە لە مۆنتریال بهێننە خوارەوە، ئەوە ڕێکخراوەکەی پەیوەندی لەگەڵ تەواوی پاپۆڕە ئەڵمانیەکان لە کەناری ئەتڵەسی– لە پۆرتلاندەوە تا نیو پۆرت – دەبڕێ.

راین دووپاتیشی کردەوە کە سەرەڕای بەردەوامبوونی کۆششی ئاشتیخوازانە لەلایەن کۆنگرەی سێ لایەنیی کە هەریەکە لە یەکگرتووی لۆنگ شورمان و دەریاوانان و نوێنەری ڕێکخراوە سەربەخۆکانی مۆنتریال ئامادەی دەبن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پلان بۆ ململانێیەکی دوورو درێژ دانراوە، ئەگەر پێویست بکات".

ترسی دواکەوتن نەیتوانی ڕێگە لە ڕۆیشتنی پاپۆڕی (Queen Bermeder)ی سەر بە کۆمپانیای فیرنس وایتی لاینەر بگرێ، ئەوە بوو کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ بەبێ بەلەمی ڕاکێشان شۆستەی ژمارە (٥٥)ی بەجێهێشت و لە دوای خۆشیدا زیاتر لە سەد تەن خۆراکی ئامادەکراو بۆ بارکردن لە شوێنی خۆی هێشتەوە، لەبەرامبەریشدا بەرپرسان توانیان ژمارەیەك دەریاوان دابین بکەن بۆ ئەوەی کەلوپەلی ڕێبواران بگوازنەوە نێو پاپۆڕەکە.

لەلایەکی دیکەوە، بوونی ٧٠٠ گەشتیار لەبەرمودا کەچاوەڕێی گەڕانەوەیان بۆ نیویۆرك دەکرد، پاڵی بە بەرپرسانی کۆمپانیاکەوە نا کە بەبێ چاوەڕێکردنی بارکردنی کەلوپەل بەردەوام بن. رایان – بەر لە دەستپێکردنی گەشتی پاپۆڕەکە– ڕایگەیاند کە ئەگەر دەریاوانان کەلوپەلی گەشتیاران باربکەن، دەتوانن لێرە بەولاوە بەردەوام بن لەسەر کارەکانیان"، هەروەها گوتی: ئەگەر بەلەمەکانی ڕاکێشان بەکارهێنران، ئەوە ماوەیەکی دوورو درێژ بەسەر دەچێ بەرلەوەی ئەو بەلەمانە بگەڕێنەوە بۆ ڕاکێشانی هەر کەشتیەك لە بەندەری نیۆیۆرك، دوو بەلەمی راکێشانی کەشتی ئامادەبوون بۆ کارکردن بەلام بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ئاو بەکار نەهێنران.

وادیارە کۆنگرەی ئاشتیخوازانە کە رایان و هاوبەشەکانی و ئەفسەرانی یەکێتی نیشتمانیی سەربەخۆی دەریاوانان بەشداریان تیادا کرد، جۆرە پێشکەوتنێکی بەدەست هێناوە.

هەروەها رایان دووپاتی کردەوە: "ئەو پێی گوتوون ئەو مەرجانە چین کە دەکرێ کەنەدیەکان دەسگیریان بکەن". باس لەوە کراوە کە ٧٠٠ گەشتیار چاوەڕێی گەڕانەوەن لە بەرمودا وە.

بەرپرسانی کەشتی پێیان وایە کێشەکە لە دەرەوەی چوارچێوەی دەسەڵاتەکانیان دایە، بەو پێیەی کێشەیەکەو دەچێتە سنووری کێشە کرێکارییە

ناوخۆییەکانەوە. ئەو بەرپرسانە هیوای گەیشتن بە ڕێککەوتننامەیەکی خێرا دەخوازنو پێشنیازیشیان کرد وەک چاودێر لە کۆبوونەوەکانی یەکێتیدا بەشدار بن.

هەوڵو کۆششەکانی (C.i.o) ی ڕێکخستنی دەریاوانانیش دەچێتە پاشکۆی جموجوڵی یەکگرتووی شورمانی نێودەوڵەتییەوە لە پێناوی جەختکردنەوە لەسەر داواکارییەکانیان کە رایان لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیاندوونو تیایدا ڕەخنە ئاراستەی تۆمەتبارکردنەکانی C.c.i.o دەکاتەوە.

New York Telegram

## دووەم: دانەپاڵ (الاسناد)ی ناڕاستەوخۆ
## (Indirect reference)

تەنانەت کەرتەکانی نموونەی پێشووش کە بە ئاشکرا بە سەرچاوەیەکی دیاریکراوەوە نەبەستراونەتەوە، بەڵام بەشێوەیەکی نادیار ئاماژە بەوە دەکەن کە نووسەرێکی شارەزا لە ڕاستیەکانیان کۆڵیوەتەوە، بۆ نموونە بڕوانە بڕگەکانی سەرەوەی، دەردەکەوێ نووسەر ئاگاداریی هەیە دەربارەی "هەڕەشەی دواخستن"و "ئەفسەران بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی بارودۆخەکە ئامادەییان وەرگرتووە"، لەوانەیە ئەو بڕگەیەو ڕستەی یەکەمی بڕگەی پێنجەم جۆرە خەمڵاندنێکیان پێوە دیاربێ، بەڵام خستنە پاڵی وردی هەریەکە لە هۆکارو دەرەنجامی تایبەت بە هەر ڕووداوێک، سەرەڕای ئاماژەکردن بە سەرچاوەی گونجاو لە کەرتەکانی دیکەی چیرۆکەکەدا، متمانەی ئەوە بە خوێنەر دەبەخشێ کە تەواوی چیرۆکەکە ڕاستو دروستە. نووسەر نابێ هیچ چیرۆکێکی هەواڵیی بە بەکارهێنانی سەرچاوەی نادیار Unanimous بنووسێ، واتە ئەو کەسانەی پەیوەندی بە ڕۆژنامەکانەوە دەکەن یان بۆ یان دەنووسن، بە ئومێدی ئەوەی بەر لە ئاشکرا کردنی ناسنامەکانیان زانیارییان پێ بیەخشن، هەرگیز لەو کارەیاندا سەرکەوتوو نابن، کاتێک ڕۆژنامەوان هەر زانیارییەک لە ڕێگەی تەلەفۆنەوە دەبارەی هەر کێشەیەک وەردەگرێ، بەر لە هەموو شتێک

دەبێ ژمارەی تەلەفۆنی هەواڵدەر وەربگرێ دواتر کۆتایی بەگفتوگۆ بهێنێ، ئینجا بۆ جاری دووەم پەیوەندی بە هەواڵدەرەکەوە بکاتەوە.

هەندێك جاریش لەسەر داوای بەرپرسانێکی ڕەسمیی پایەبەرز، ڕۆژنامەکان سەرچاوەی زانیارییەکانیان بە ڕوپۆشێکی تەنك دادەپۆشن، لە ڕێگەی ئاماژەکردن بە: "سەرچاوەی نزیك لە...، سەرچاوەیەك کە بە متمانە ناسراوە، سەرچاوەیەکی ڕەسمیو بەرپرسێکی پایەبەرز"و دەربڕینی دیکەی لەو بابەتانەوە.

"واشنتۆن -أ.ب- ترفوگاردنەر ڕایگەیاند کە ڕۆژی سێ شەممە ئامادە دەبێ بۆ دەست لەکار کێشانەوە لە کارەکەی وەکو سەرۆکی بنکەی لێتوێژنەوەکانی هێزی ئاسمانی، ئەمەش وەك ناڕەزایی دەربڕینێك بەرامبەر بەو شێوازەی کە بەهۆیەوە بەرنامەی موشەکە ئاڕاستەکراوەکانی پێ چارەسەر دەکرێ.

گاردنەر ئەگەرچی تا ئێستا درێژەی سکاڵاکانی ئاشکرا نەکردووە بەڵام بە پشت بەستن بە ڕاپۆرتی ژمارەیەك لە دۆستو برادەرانو بەیاننامەکانی پێشووتری، وادیارە گاردنەر دەیەوێ بایەخو پارەوپوولی زیاتر بۆ لێتوێژینەوەکان تەرخان بکرێو لە بەرهەمهێنانی موشەکیشدا کارەکان بە شێوازێکی وردتر لە نێوان هەر سێ بەڕێوەبەرایەتییە سەربازییەکاندا دابەشبکرێن، گاردنەر ڕۆژی سێ شەممە سەردانی مەیامی کردووە بۆ ئەوەی بابەتەکەی بخاتە بەردەمی شارل ویلسنی وەزیری بەرگری کە پشووەکەی لەوێ بەسەر دەبات...."

(Chicago Sun)

شتێکی سەرنج ڕاکێشە بۆ هەر نووسەرێکی بەناوبانگ کاتێك بەم شێوازە بنووسیو دژی ئەو بەرپرسە ڕەسمیانەش بوەستێ کە ڕازی نین ناوەکانیان وەکو سەرچاوە بەکار بهێنرێن. شاردنەوەیەکی وەك ئەمە لەوانەیە ببێتەهۆی لاوازکردنی متمانەی خوێنەر بەهەر ڕۆژنامەیەك کە بەویستی خۆی پەنا بۆ شێوازی لەو جۆرە دەبات.

"سیناتۆر جۆزیف مکارسی لێدوانێکی بۆ ڕۆژنامەوانان ڕاگەیاند کەپەیوەندی بە چاودێریکردنی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانەوە هەیە، بەڵام جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەو لێدوانە دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك کەئامادەنەبوو ناوەکەی ئاشکرا بکات، لەبەرمبەریشدا راسل ویجنزی بەڕێوەبەری نووسینی ڕۆژنامەی Post گوتی:

"یەکێتی ڕۆژنامەکان‌و ڕۆژنامە دەرچووەکانیش ڕێگەیان پێدا نوسخەیەکی وەك خۆی بڵاو بکاتەوە بەمەرجێك لە سەرچاوەیەکی بێلایەنەوە ڕاگەیەنرابێ".

بەشێوەیەکی گشتی، ئەوەی سەرۆکی ئەمریکا لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکاندا باسی لێوە دەکات، لە یەکێك لەم چوار شێوازەی خوارەوەدا دەشێ پۆلێن بکرێن:

أ-زانیاریی‌ن‌و دەکرێ ڕاستەوخۆ لە سەرۆکەوە وەربگیرێن.

ب- زانیاریی‌ن دەکرێ بخرێنە پاڵ چەند سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو لەنێوەندە باڵاکانی حکومەتدا.

پ-شتێکن ناکرێ ڕاستییەکانیان دەربخرێ، بەڵکو دەشێن وەکو زانیاریی بەکار بهێنرێن.

ت-زانیاریی‌ن‌و بۆ بڵاوکردنەوە نین.

ڕۆژنامەوانان ڕێز لە خواستەکانی سەرۆك دەگرن، لە ڕاستیدا ڕۆژنامەکانیش ڕێز لە خواستی هەر سەرچاوەیەك دەگرن کە بیەوێ بە وردی ناوی سەرچاوەی زانیارییەکان نەهێنێ، لە چیرۆکە هەواڵییەکانی لەو شێوەیەشدا وا دادەنرێ کە دیمانەیەك لەگەڵ سەرچاوەی بەرپرسدا ئەنجام دراوەو ناوبانگی گشتیی وردبینی ڕۆژنامەش زامنێکە بۆ پاراستنی خوێنەر، وەك چۆن لەو نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەون.

"ئەمڕۆ ئامێری ئاشکراکردنی درۆ دەریخست کە هنری مانسون درۆ دەکات‌و ڕۆژی یەکشەمە لەماڵەکەیاندا لە ٧١٧ شەقامی ڤکتۆریا، تەقەی لە ئارنۆلد مانسۆنی برازای خۆی کردووەو کوشتوویەتی".

"ئەو گەنج و لاوە كوڕو كچانەی بەمەبەستی بەشداریكردن لە پاڵەوانیەتی هەجوو كردن (التهجئة)ی ڕۆژی هەینیدا گەیشتوونەتە تەمیلتن، كاتژمێر شەش و چارەكی ئێوارەی ئەمڕۆ لە ئاهەنگێكدا ئامادە دەبن كە لە هوتێلی بیدفۆر ساز دەكرێ؟.

باس نەكردن لە سەرچاوەی ئەو زانیارییانەی پەیوەندیان بە شتە ناسراوو كۆنەكانەوە هەیە، خۆی لە خۆیدا شێوازێكە بۆ دووركەوتنەوە لە زیادەڕۆیی كردن لە ڕێژەی زانیارییەكاندا. بۆ نمونە، ئامادەنیت بنووسی "پایتەختی وومنگ چاینی وەك چۆن سیناتۆر بلیمنت دووپاتی دەكاتەوە بریتیە لە ...".

بەڵام ئەگەر هیچ گومانێك دەربارەی زانیارییەكە لە ئارادا نەبێ، ئەو وەختە كە مەسەلەكە پەیوەندی بە پایتەختی تبت یان ئەفغانستان یاخود هەر شوێنێكی دیكەوە هەبێ، ناوی سەرچاوەكە دێنی، ئەمەش لەبەر ئەوەی دوور نیە ئەو ڕاستیانە لەلایەن زۆربەی خەڵكەوە تازە بن، بۆیە دەكرێ لە سەرچاوەی تایبەتەوە دەستەبەر بكرێن.

پشت بەستن بە سەرچاوەو مەرجەعەكان لە پێناوی ڕاستیە كۆنەكاندا لەوانەیە هەڵخەڵەتێنەر بێ، چونكە دەبێتە مایەی خولقاندنی بۆچوونێك بەوەی ئەو زانیارییانە تازەن، بۆ نموونە: "بۆئەوەی كەسێك سوود لە شوێنی نیشتەجێكردنی گشتی و هەرزان ببینێ، نابێ داهاتی ساڵانەی لە ٣٦٠٠ دۆلار زیاتر بێ، ئەمڕۆ تیودور ماكونای پسپۆڕی ئابووری لە فەرمانگەی نیشتەجێكردن ئەو لێدوانەی ڕاگەیاند".

ئەمە لەوانەیە لێدوانێكی نابەجێ بێ ئەگەر سەرخانی ٣٦٠٠ دۆلار ماوەیەكی دوورودرێژ بێ كاری پێ بكرێ، لێدوانەكە خراپتریش دەبێ ئەگەر وشەی وەك: "ئاشكرا كرد" یان "ڕایگەیاند" یان "دانی بەوەدانا" و هی تری لەو جۆرە بەكار بهێنرێ.

كاتێك لە چیرۆكە هەواڵێكدا لێدوان دەخرێتە نێو ڕووداو، زیاتریش وەكو بەشێك لە پاشكۆی ئەو هەواڵەو بۆ هاندانی خوێنەر لە خەملاندنی هەندێك بنەمای هەواڵیی، ئەو وەختە دەبێ هەواڵەكە بۆ هیچ مەرجەعێك نەگەڕێنرێتەوە، تەنیا ئەوكاتە نەبێ

ئەگەر هەواڵەکە وەکو ڕاستیەك وەرنەگیرێ، لەو حاڵەتەشدا دەکرێ ناوی فەرهەنگو کتێبە یاساییەکانو مەرجەعی دیکە بهێنرێ کە پشتیان پێ بەستراوە، هەروەها بە هیچ شێوەیەك نابێ وشەی وەك (ئامارەکان دووپاتی دەکەنەوە" یان "مەرجەعەکان ئاماژە بەوە دەکەن" بەکاربهێنرێ، لە هەڵوێستێکی لەو جۆرەشدا دەبێ پێشەکیەکی وەك "ئەمڕۆ بۆچوونەکان لێرە بەم جۆرەن" بەکاربهێنرێ.

زۆرکەمیش ڕێك دەکەوێ پێشەکیەکی لەو جۆرە لەسەر بناغەی پێشکەشکردنی ڕاپۆرتێکی هەمەلایەن دەربارەی (ئاراستەی سۆزداریی جەماوەر) سەربگرێ، مەترسی ئەمەش لە دیدێکی ئەخلاقیەوە خۆی لە خولقاندنی ئەوەدا دەبینێتەوە کە شارەزایانی زانستی دەروونیی کۆمەڵایەتیی بە (خەیاڵی شمولی) ناوزەدی دەکەن، بۆیە لەوانەیە زێدەڕۆییەکی زۆر بێ ئەگەر بنووسیت (ئەمڕۆ بە مردنی پارێزگار پۆڵ، تەواوی شار ماتەم دایگرت) یان (جیهانی خۆشەویستانی مۆسیقا سەرەو ژێر بووەوە) یان (ئەمڕۆ گەورە سەرمایەداران دەترسن....).

لە چیرۆکە هەواڵییە وەرزشیەکانیشدا دەکرێ پشت لە بەکارهێنانی ئەو جۆرە پێشەکیانە بکرێ، چونکە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە شێوازێکی لایەنگیرانە لەبەرژەوەندیی تیمی نیشتمانیی ئامادە دەکرێن، خۆ ئەگەر لە هەواڵە سیاسییەکانیشدا بەکاربهێنرێن، ئەوکاتە بێگومان هەڵخەڵەتێنەر دەبن. ئەگەر بتوانرێ لە ڕووی کردەییەوە دەربخرێ کە زۆربەی بەرپرسان یان هەر گرووپێکی دیکە مەسەلەکان بەم جۆرە دەبینن، ئەوکاتە دەبێ باس لە ئاماژەیەك بکرێو دووپاتی بکاتەوە کە نووسەر دەزانێ باس لەچی دەکات.

## سێیەم: تێكۆشان و ماندوو نەبوون (Peresistence)

لێكۆڵینەوەی ئەو ئاستەنگانەی دێنە بەردەم ڕۆژنامەیەكی ڕۆژانەی قەبارە مامناوەندی لەلایەن شیرمان باین هورن لە ڕۆژنامەی Press باسیان لێوە دەكرێ، بەشی زۆری چیرۆكەكەش بەم شێوازەی خوارەوە لە ڕۆژنامەكەدا بڵاوكراوەتەوە "ئەمڕۆ زانرا ئەو بڕیارە سەرۆكایەتییەی سەبارەت بە وەستاندنی پێشخستنی ئامێری فڕۆكەی ئەتۆمی دەركراوە، لە ئەنجامی دەركردن و گواستنەوەی ژمارەیەك كرێكار لە تاقیگەی كونیكتیكت دا بووە".

پارێزگار كلو ڕایگەیاند ئاگاداركردنەوەی دەركردنی كرێكاران لە ڕۆژی چوار شەممەوە دەركراوە، چەند سەرچاوەیەكیش لە كارگەی دروستكردنی فڕۆكە لە برات وایتنی لە ئیست هارتفورد ئەو زانیارییانەیان دووپات كردەوە بەڵام ژمارەی ئەو كرێكارانەی دیاری نەكرد كە ئاگادار كردنەوەی دەركردنیان پێ دراوە.

جگە لەوەش، كۆمپانیای P.W.A چەند پێشنیازێكی دەربارەی گۆڕینی شوێنی كاركردنی ئەو كرێكارانەی پێشكەش كردووە كە لە كارگەی كانیل ڕووبەڕووی دەركردن دەبنەوە.

لە كۆمپانیای P.W.A ەوە هیچ زانیارییەك سەبارەت بە ژمارەی كرێكارانی ئەو گرووپە نەكەوتوونەتە بەردەست، هەروەها كۆمپانیای ناوبراو ئەو شوێنانەی دەزگای فڕۆكەوانیی یەككرتووی ئاشكرا نەكردووە كە كۆمپانیای P.W.A بۆیان دەگەڕێتەوە و بۆ كرێكارانی كانیل داگیركراون.

لە وەڵامی پرسیارێکیشدا کە ئەمڕۆ دەربارەی ئەو ڕاگەیاندنەی سیناتۆر ب. بوش ئاراستەی دەزگای فرۆکەوانیی یەکگرتوو کرا، دەزگای ناو براو هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

بێکارییەکی کەم

سیناتۆر بوش گوتی:

".... دەربارەی بڕیاری ناوبراو لەگەڵ سەرۆکی دەزگای فرۆکەوانیی یەکگرتووشدا گفتوگۆم کردووە، لە میانەی دووپاتکردنەوەکانیشیدا، پێم وایە دەرفەتی کارکردنی دیکە بەو کرێکارانە دەدرێ، ئەمەش مانای ئەوەیە سەرهەڵدانی برێکی کەمی بێکاریی لێ دەکەوێتەوە، هیوادارم بارودۆخەکە بەم جۆرە بێ".

سەرچاوەکانی پەیوەندییە گشتیەکانی دەزگای فرۆکەوانیی یەکگرتوو و لقەکەی کە (P.W.A)ە، جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە هەرکاتێك ڕێککەوتبێ، دەزگاکەیان هەوڵی گواستنەوەو گۆڕینی شوێنی کارکردنی داوە.

لە ٢٨ی ئاداردا، سەرۆك کینیدی داوای وەستاندنی کاری لە پرۆژەی فرۆکەی ئەتۆمی لە کۆنگرێس کردووە، دوای سێ ڕۆژیش چەند هەواڵێك لەسەر زاری مێجەر جەنەرال تۆماس گریفی سەرکردەی هێزی ئاسمانی دزەیان کردو تیایاندا هاتبوو کە نەهێشتنی بەرنامەی ناوبراو مانای لادانی ٧٣٥ هەلی کارکردن لە کارگەی کانیل دەگەیەنێ، جەنەراڵ گریف بە جەنەراڵ ئەلیکتریك‌و کونفیرلوکهیدیشی ڕاگەیاندووە — دوو کۆمپانیان لە پرۆژەی بەرنامە ئەتۆمیەکەدا کار دەکەن— کە دەبێ هەریەکەیان دەسبەرداری چەند دەرفەتێکی کارکردن بېن.

هاوکات لەگەڵ زامنکردنی چارەنووسی ٧٣٥ بواری کارکردن لە کۆمپانیای کانیل، لە ڕێگەی یاداشتنامەیەکی هێزی ئاسمانییەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بڕیارێك دەربارەی ١٦٦٥ کرێکاری دیکەی هەمان کۆمپانیا نەدراوە.

شایەنی باسە ئایندەی ئەو ١٦٦٥ كرێكارە بە دەستی لیژنەی كۆكردنەوەی ڕاستییەكانە كە دوێنێ بە مەبەستی ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی دەزگای فرۆكەوانیی یەككرتوودا گەیشتە كارگەی كانیل.

## بڕیارێكی نزیك

ئەمڕۆ دكتۆر ڤاندرو ویدنی جێگری بەڕێوەبەری دەزگای وزەی ئەتۆمیو سەرۆكی تیمەكە ڕایگەیاند كە بەم نزیكانە بڕیارێك دەربارەی چارەنوسی ئاسانكاریەكانی لێكۆڵینەوە ئەتۆمیە خۆجێیەكان دەردەكرێ، هەروەها لە میانەی پرۆژەی بەرنامەی دەزگای وزەی ئەتۆمیدا ناوبراو پرۆسەیەكی بچووكتری ئاشكرا كرد، بە مەرجێك ئەگەر لە ئایندەیەكی نزیكدا ڕەزامەندیی لەبارەوە وەربگیرێ.

لەلایەكی دیكەوە، چەند سەرچاوەیەكی نزیك لە كارگەكەدا، ئاماژەیان بە بوونی شڵەژانێك لەنێو كرێكارانو بەردەوامبونی پروپاگەندە دەربارەی لەكار لابردنی بەكۆمەڵ كرد.

## گەڕان بە دوای زانیارییدا

سەرلەبەیانی ئەمڕۆ پارێزگار كلو گوتی ئەو لە ڕێگەی فرانك كولاسكیی ئەندامی ئەنجومەنی پیرانەوە خەریكی كۆكردنەوەی زانیارییە سەبارەت بە بارودۆخەكەو لە بەیانیشەوە لە پەیوەندی بەردەوامدایە لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندییە گشتییەكانی سەر بە دەزگای فرۆكەوانیی یەككرتوو، بەڵام هیچ شتێكی دەربارەی ژمارەی ئەو كرێكارانە بەدەست نەگەیشتووە كە سەبارەت بە تەواوبوونی كارەكانیان ئاگادر كراونەتەوە.

لەلایەن خۆشیەوە بەڕێوەبەرایەتی قەرەبوو كردنەوەی بێكاریی لە میدل تاون دووپاتی كردەوە كە هێشتا هیچ فۆرمێكی سەبارەت بە قەرەبووكردنەوەی كرێكاری لە كارلادراوی كۆمپانیای كانیلەوە بەدەست نەگەیشتووە. هەر لەو بارەوە

کارمەندێکی ئەو بەڕێوەبەرایەتیە گوتی: زانیومە کرێکارانی کانیل ئاگادار کراونەتەوە لەوەی دەبێ لەماوەی دوو هەفتەدا کارەکانیان بەجێ بهێڵن، بۆیە دوای تێپەڕبوونی ئەو دوو هەفتەیە نەبێ ناتوانین هیچ فۆڕمێك بۆ ئەو کرێکارانە ئامادە بکەین.

جۆن سیلڤای بەڕێوەبەری ئیداری یەکێتی نێودەوڵەتی تەکنیکارانیش گوتی: نووسینگەکەی هیچ شتێك دەربارەی ئاگادارکردنەوەی لەسەر کار لادان نییە.

دەربارەی ئاستەنگەکانی ڕووماڵکردنیش بینهورن نووسیویەتی:

ئەوەی باسی لێوە کرا نموونەی چیرۆکە هەواڵێکەو ئەو هەوڵو کۆششە دەردەخات کە لە پێناوی گەیشتن بە شتێکی تازەدا خراوەتە گەڕ، چیرۆکەکە چەند جارێك ئاماژەی بە نەتوانینی دەستەبەرکردنی زانیاریی تازە دەربارەی چەند مەسەلەیەك داوە، بۆیە بەشێوەیەك لە شێوەکان بریتییە لە چیرۆکە هەواڵێکی پڕ لە نائومێدیو شکست.

لە ساڵی ١٩٥٦ ەوە چاودێریی بابەتی کارگەی کونکتیکت بۆ بەرهەمهێنانی مەکینەی فڕۆکە ئەتۆمییەکان دەکەم، موڵکدارێتی ئەو کارگەیە دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانگەی وزەی ئەتۆمی و دەزگای فڕۆکەوانیی، لەلایەن کۆمپانیای برات وایتنی فڕۆکەوانیشەوە سەرپەرشتی دەکرێ، کارگەکانی کانیلیش وەکو شارێکی سەربەخۆ وانو لە ڕووی ڕۆژنامەوانانیشەوە داخراونو خاوەنی بەرپرسێکی ناسراوی پەیوەندییە گشتیەکان نییە، بەڕێوەبەرەکەشیان هیچ شتێك نادرکێنێو ڕێگەیەکیش نییە بەهۆیەوە شوێنەکە بپشکنرێت.

لە کۆتایی ئادارەوە سەرۆك کینیدی کارکردنی بە بەرنامەی بەرهەمهێنانی فڕۆکەی ئەتۆمی — کە بلیۆنێك دۆلاری تێدەچێ — وەستاندووە، واتە قوربانیدان بە ٨٤٠٠ کرێکار لە کانیل، لێرەشەوە شتێکی ئاساییە کە بایەخ بەو چیرۆکە بدەین چونکە بۆ ئێمە گرنگییەکی زۆری هەیە.

مایەی خۆشبەختیە کە توانیمان یەکەم دەرفەت بۆ ئاشکراکردنی زانیارییەکان بەدەستبهێنین، کە لێدوانێکی سەرۆك کینیدییە، بەلام لەبەرامبەر هەموو

چیرۆكەكانی دیكەدا، دەبووایە هەنگاوی ڕۆژنامە گەورەكانی هارتفۆرد بگرینە بەر، كە خاوەنی نووسینگەی هەمیشەیین لە واشنتۆن‌و لەنێو هێزی ئاسمانی‌و وەزارەتی بەرگریشدا سەرچاوەی خۆیان هەیە، هەروەها دەبوایە پشت بە ئاژانسی یونایتد پرێس ببەستین كە لە تواناییدا هەبوو شتی زۆر ئەنجام بدات، یاخود دەبوایە بۆ وەرگرتنی زانیاریی گرنگ ڕوومان بكردایەتە ئەندامانی كۆنگرێس، چونكە ئەوانە هەمیشە زانیارییی ناڕاستەوخۆن (دەستی دووەم – Second –Hand).

خودی ئەو زانیارییە ناڕاستەوخۆیانەش وایانكرد هەست بە شەرمەزاریی بكەین كاتێك سەرۆك كینیدی لێدوانەكەی ڕاگەیاند، ئەوەبوو كولاسكی‌و ئەندام كۆنگرێسێكی دیكە دووپاتیانكردەوە كە بەرنامەكە ڕاناوەستێنرێت‌و زانیاریی هەواڵیی گرنگی تریشیان پێ بەخشین، هەر ئەمەش دواتر بوو بە كێشەیەك بۆمان.

لەو نموونەیەدا ئاستی ئەو ئاستەنگانە دەركەوێ كە ڕووبەڕووی ڕۆژنامەیەكی ڕۆژانەی شارێكی بچووك دەبنەوە لە چارەسەركردنی چەند چیرۆكێك كە ڕەگەكانیان بۆ دوای پەردەی نهێنی فیدراڵی دەگەڕێنەوە.

ئەو چیرۆكە نموونەیەكە بۆ هەوڵی بەخشینی ناوەڕۆك (بابەت Substance)ی شتێكی زۆر بچووك، دەخوازین ڕای گشتی ئاگاداری ئەو زانیارییانە بێ، هەروەها دەمانەوێ خوێنەر ڕازی بكەین كە زۆرترین كۆشش دەخەینەگەڕ. پێم وایە ئەمە زۆر ڕوون‌و ئاشكرایەو مەسەلەیەكی لەو جۆرەش گرنگە. "بەبێ لێدوان" هەڵوێستێكە هیچ ناڵێت، بەڵام ئاماژەیەكی ئاستەنگی چارەسەركردنی كێشەیەكی لەو جۆرەش پەیوەندی بە خۆڕاگری لەڕووی پڕوپاگەندەوە هەیە، ئەمەش لەكاتێكدا ئەگەر نەتوانرێ زانیارییی تر دەستەبەر بكرێن.

هەموو كەسێكی شار – هەر لە سەرتاشەوە بگرە تا بەردەست – ژمارەی دەركراوان دەزانن، لەو باوەڕەدام ڕۆژی چوار شەممە بەڕێوەبەرایەتی پەیوەندییە گشتییەكان لە كۆمپانیای برات وایتنی دەیتوانی ژمارەی ئاگادار كراوان‌و ئەوانەشمان

پێ ڕابگەیەنێ کە داوای گۆڕینی شوێنی کارەکانیان لێ کراوە، ئەمەش بۆ خودی پرسەکە زانیاریی گرنگن.

مەسەلەیەکی زەحمەتە، بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ نەتتوانی کرۆکی هەواڵەکە دەستەبەر بکەیت، هەوڵ بدە سبەینێ زانیارییەکی پەیوەندیدارت دەسگیر ببێ‌و خۆت بۆ سبەینێ ئامادە بکە.

## چوارەم: ملکەچکردن بۆ یاسا Obeying The Law

ئەگەر پێشتر ڕۆژنامەوانی لاو ئاگادارنەکرێتەوە، لەوانەیە یەکێك لەو شتە لەناکاوانەی لە میانەی گەڕانی بەدوای سەرچاوەدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە، ئەوەبێ کاتێك دووچاری گرفتێك دەبێتەوەو ڕێگەی گەیشتنی بە زانیارییو بەڵگەی لێ دەگرێ، بۆی دەردەکەوێ کە توانای هەیە ئاماژە بە دەقە دەستوریەکانی پەیوەند بە ئازادیی ڕۆژنامەگەریی بکات، هەروەها نەزانینی ئەو ڕۆژنامەوانە لاوە لەوانەیە بیگەیەنێتە ئاستێك کە پێی وابێ دیکۆمێنتە گشتیەکان لەبەردەمی هەموو کەسێکدا والاَن، خۆ ئەگەر بشتوانێ ئەو سنوورو بەربەستانە ببەزێنێو خۆی بگەیەنێتە دیکۆمێنتەکانو بلاویان بکاتەوە، دوور نیە خۆیو ڕۆژنامەکەشی ڕووبەڕووی لێپرسینەوەیەکی یاسایی بکاتەوە.....

پرەنسیپی گشتی جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی ڕای گشتی –بە ڕۆژنامەوانیشەوە– مافی دیدەنیی و پشکنینی دیکۆمێنتە گشتیەکانی هەیە، ئەمە ئەگەر بەرژەوەندی گشتی دووچاری مەترسیو ئازار نەکاتەوە. ململانێی نێوان ڕۆژنامەوانو خەڵکانی فەرمی لە جیاوازی بۆچوونەکانیان دەربارەی دیاریکردنی مانای دیکۆمێنتو بەرژەوەندی گشتیدا دەردەکەوێ، لە هەموو حاڵەتێکیشدا ڕۆژنامەوان نابێ چاوەڕێ بێ ڕێگەی ڕووماڵکردنی دادگایی کردنە گەورەکانو کۆبوونەوەی لیژنە یاساییە باڵاکانی پێ بدرێ، یان ئەو ڕاپۆرتانەی بخرێنە بەرچاو

کە پەیوەندییان بەو کێشانەوە هەیە کە هێشتا لێکۆڵینەوەیان تیادا بەردەوامە، یاخود ڕێگەی بینینی ڕاپۆرتی پشکنینی تەرمێکی پێ بدرێ بەرلەوەی ئاراستەی دەستەی دادگا بکرێ. ئەمەش شتێکەو بەرژەوەندیی گشتیی دەیسەپێنێ.

ڕۆژنامەوانی لاو دەبێ شارەزاییەکی تەواوی دەربارەی ئەو یاساو ڕێسا ڕۆژنامەوانیانە هەبێ کە لە کۆمەڵگاکەیدا کاریان پێ دەکرێ و ئاگاداری سیاسەتی ڕۆژنامەکەشی بێ کە پەیوەندی بە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو پرسانەوە هەیە کە هەوڵی شاردنەوەی زانیارییەکان دەدەن.

## پێنجەم: مافی دانانو بڵاوکردنەوە Copyright

نابێ ڕووداو (هەواڵەکان) بخرێنە ژێر چەمکی مافی دانانو بڵاوکردنەوەوە. کۆنگرەی پسپۆڕانە ڕۆژنامەوانەکان کە لە ساڵی ١٩٢٧ دا بە بانگەشەی کۆمەڵەی گەلان لە ژنێف ساز کرا، پرەنسیپێکی بنەڕەتی دانا کە بریتی بوو لەوەی بڵاوکردنەوەی چیرۆکی هەواڵیی ئەوکاتە بەڕەوا دەزانرێ کە هەواڵیی پەیوەندیدار بە شێوازێکی ڕێکو پێکو بڕیار لەسەردراو گەیشتبێتە ئەو کەسەی بڵاوی دەکاتەوە نەوەك لە ڕێگەی هەڵسوکەوتێکی پێشبڕکێیکەرانەی نابەجێوە، هیچ کەسێکیش مافی قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵانەی نیە کە پەیوەندیان بە بەرژەوەندیی گشتییەوە هەیە، کۆنگرە جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە ڕۆژنامەو ئاژانسەکانی دەنگوباسو دامەزراوە هەواڵگەرییەکانی تر - چ بەر لەبڵاوکردنەوە یان دواتر- بەرامبەر بە کارو وەبەرهێنانو خەرجییەکانیان لە بەرهەمهێنانی چیرۆکە هەواڵییەکاندا خەڵات بکرێن، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ ئەو بنەمایە وا لێکنەدەنەوە کە ببێتە هۆی خولقاندن یان هاندانی هەر جۆرە مۆنۆپۆلکردنێکی هەواڵەکان.

بە هەمان شێوە نابێ (ڕاستی - The Facts) یەکانیش بخرێنە ژێر مافەکانی دانانو بڵاوکردنەوەوە، ڕۆژنامەکانیش بۆیان هەیە بە دوای شێوازێکدا بگەڕێن بۆ ئەوەی خۆیان لە پێشێلکردنی مافە پیشەییەکان دوور ڕابگرن.

ئـەو ڕۆژنامەیـەی دەیـەوێ وتارێـك یـان بەشـێك لـە وتـارێکی بڵاوکـراوە لـە ڕۆژنامەیەکی دیکە دووبارە بڵاو بکاتەوەو وتارەکەش مافی بڵاوکردنەوەی پارێزرابێ، ئەوا یان دەبێ مـافی بڵاوکردنـەوەی بکڕێ یان ڕوخسـەتی بڵاوکردنـەوەو وەرگرتن‌و گواسـتنەوە زامـن کـات، بگـرە لـە هـەردوو حاڵەتـدا دەبـێ داوای ئـەو مافـە لـەو بڵاوکراوەیە بکرێ کە وتارەکەی بڵاوکردۆتەوە، لـە کـاتی کـڕینی ئـەو مافەشدا، ئـەو دێڕەی ناوی نووسەریان خاوەن مافی ڕەسەنی تیادایە، دەبێ لەسەرەوەی بابەتەکەدا بـڵاو بکرێتـەوە، خـۆ ئەگـەر ڕۆژنامـە ئـەو مافـەی دەسـگیر نـەبێ، بێگومـان خـۆی دووچاری تۆمەتی پێشێلکردنی مافەکانی دانان‌و بڵاوکردنەوە دەکات.

لـە زۆربـەی حاڵەتەکانیشـدا بابـەت‌و وتـاری نێـو گۆڤـارو کتێبـەکان مـافی دانـان‌و بڵاوکردنــەوەیان هەیــە، بــەڵام زۆرکــەمیش ڕێکدەکــەوێ ڕۆژنامــەکان بایــەخ بــە گواســتنەوەی بڕێکــی ئــەو بابەتانــە بــدەن، تــا ئــەو ئاســتەی دووچــاری مەترســی پێشێلکردنی مافەکانی دانان‌و بڵاوکردنەوەیان نەکاتەوە. بابەت‌و وتاری نێـو کتێـب‌و گۆڤارەکانیش ڕووداو ڕاستی گرنگ دەگرنە خۆیان‌و ڕۆژنامە دەیەوێ بیانگوازێتـەوە، مافی سوود وەرگرتنیش هەمیشـە لەلایـەن دانـەری ڕەسـەنەوە دەدرێ ... پاراسـتنی مافەکانی دانان‌و بڵاوکردنەوەش ٢٨ ساڵ بەردەوام دەبێ‌و دەکرێ دوای ئەو ماوەیـە بۆ ٢٨ ساڵی دیکە تازە بکرێتەوە، پاشتریش بابەتەکـە دەبـێ بـە بابـەتێکی گشـتی‌و کراوەو دەکرێ بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی دانەری ڕەسەن شتی لێ وەربگیرێ.

## شەشـــەم: چـــۆن خـــۆت لـــەناوبانگ زڕانـــدن دوور دەخەیتەوە؟ How To Avoid Libel

وەك چۆن دەستەبەرکردنی مافی گەیشتن بە دیکۆمێنتو ڕاپۆرتە فەرمییـەکان بـە گرنگ دەزانرێ، بەڵام گرنگتر ئەوەیـە بزانیت چۆن مامەڵە لەگـەڵ ڕاسـتیو ڕووداوو هەواڵـەکانی نێـو ئـەو دیکۆمێنێـتو ڕاپۆرتـەدا دەکـەیت، بـۆ ئـەوەی ڕۆژنامـەوانو ڕۆژنامەکـەش دووچـاری تۆمـەتی ناوبـانگ زڕانـدن نەبنـەوە. ئەمـەش بـۆ نووسـەر کێشـەیەکەو گرنگیـەکی کەسـیی هەیـە، چـونکە هـەر کرێکـارێکی نێـو ڕۆژنامەکـە پەیوەندی بە ئامادەکردنی بابەتێکەوە هەبێو ناوبانگ زڕاندنی پێـوە دیـاربێ، ئـەوا دروست وەك خودی ڕۆژنامەکە ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی یاسایی دەبێتەوە، ئەمـەش بێگومان پێویستی بە ئاگاداری زیاتر هەیە.

### ١-ناوبانگ زڕاندن چیە؟

ئـەو شـتانەی پێشـتر دەربـارەی مـافی گەیشـتنی ڕۆژنامـەوان بـە دیکۆمێنـتو ڕاپۆرتەکان باسمـان لێـوە کـردن، تـەواوی ئەوانـەو زیـاتریش سـەبارەت بـە ناوبـانگ زڕاندن دەبینـرێن. ناوبـانگ زڕانـدن بریتییـە لـەوەی لەڕێگـەی نووسـینەوە ناوبـانگی کەسێك بشـێوێنیت، هـەر ئەمەشـە لـەوەی جیادەکاتـەوە کـە بریتییـە لـە شـێواندنی زارەکیانەی ناوبانگ Slander.

فەرهەنگی یاسایی ئەمریکیی — بەریتانیش بەشێوەیەکی وردبینانەتر پێناسەی شێواندنی ناوبانگ دەکات، بەم جۆرەی خوارەوە: "ناوبانگ زڕاندن شێواندنی ناوبانگی کەسێکە، لە ڕێگەی نووسین یان چاپ بەهۆی ئاماژەو وێنەو پەیکەرو شتی تری لەو جۆرەوە، مەبەستیش لەدوایەوە گەیاندنی زیانە بە یادگارییەکانی کەسێکی مردوو یان گومانکردن لە پاکیو خاوێنیو ناوبانگەکەیەتی، یاخود بڵاوکردنەوەی عەیبو عاری سروشتی یان هەڵبەستراوی کەسێکی زیندووە، بەجۆرێك ئەو بڵاوکردنەوەیە کەسی باس لێوە کراو بخاتە بەر ڕقو ناڕەزاییو گاڵتەجاڕی خەڵك، یان ببێتە مایەی ئەوەی خەڵك لێی دوور بکەونەوەو گۆشەگیری بکەنو لە نووسینگەو کارەکەشیدا ئازاری بدەن".

لەو پێناسەیەشدا دەردەکەوێ کە تەنانەت کارتۆنو وێنەی فۆتۆگرافیو هی تریش دەچنە چوارچێوەی شێواندنی ناوبانگەوە.

ناوبانگ زڕاندنی نووسراو Libel تاوانێکی توندترە لە ناوبانگ زڕاندنی زارەکییانە Slander، چونکە زانیارییە نووسراوەکان لە بڵاوکراوەیەکی جەماوەری بەرفراواندا بڵاو دەکرێنەوەو توانای گەیاندنی ئازاری زیاتریان هەیە، لە میانەی گفتوگۆو مشتومڕیشدا لەوانەیە یەکێك بەناوێکی نابەجێ بانگی کەسێکی دیکە بکات، ئەوکاتە بە ئامادەبوونی کەسانێکی لەو بابەتە ئەگەر چاپو بڵاوبکرێتەوە، بێگومان کاریگەری بەرفراوانو هەمەلایەنو گرنگتری دەبێ.

## ٢-وشە مەترسیدارەکان Dengerous Words

سەرەڕای نائاشکرایی لەو پێوەرانەدا کە دادگاکان بەکاریان دەهێنن، بەڵام ڕۆژنامەوان دەبێ پێشبینی بکات کە دادگا ئەم وشانەی خوارەوە بە ناوبانگزڕاندن لەقەڵەم دەدات:

—کەسێك تاوانێکی ئەنجام دابێ، یان هەوڵی ئەنجامدانی تاوانێکی دابێ، یان بەتۆمەتی ئەنجامدانی تاوانێك یاخود تاوانکاری دەسگیرکرابێ، یان دانی بە ئەنجامدانی تاوانێکدا نابێ یان سزایەکی بەرامبەر دەرکرابێ.

—تاوانبارکردنی کەسێك بەوەی کارێکی نابەجێی کردبێ، تەنانەت ئەگەر وشەکە بە وردی سروشتی کارەکەشی دیارینەکردبێت.

—هەوڵدان بۆ دابەزاندنی ڕێزی کەسێك و دووچارکردنی بە شەرمەزاریی و خۆدوورخستنەوە لێی، تەنانەت ئەگەر ئەمە تۆمەتبارکردنیشی بە ئەنجامدانی تاوانێك نەگرێتەوە.

—هەواڵدان بۆ زیان گەیاندن لە کەسایەتی مرۆڤو کەمکردنەوەی پایەو ئازاردانی، یان وای لێ بکرێ ڕووبەڕووی شەرمەزاری و ڕق و گاڵتەجاڕی ببێتەوە.

—هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی لە کەسایەتی یان ناوبانگی کەسێك بەرامبەر دۆستو ناسیاو و ڕای گشتی لە پلەیەکی بەرزەوە بۆ پلەیەکی لاوازتر، یان هەواڵدان بۆ دوورخستنەوەی لە سۆزو ڕێزی دۆستو ناسیاوو ڕای گشتی.

—تۆمەتبارکردنی کەسێك بەوەی لە هەستو هەڵسوکەوتو کارو چینەکەی خۆی لایداوە یان هەڵسوکەوتێکی نا ئەخلاقی نواندووە یاخود کردەوەی بەدڕەوشتی ئەنجام داوە.

—تۆمەتبارکردنی کەسێك بە فرتوفێڵ یان دەرچوون لە یاساو دەستپاکی، یان سەرخۆشی و قومارو ساختەکاری لە یاریکردن و هەڵخەڵەتاندن و ..... تاد.

—تاوانبارکردنی کەسێك بە کەم تێگەیشتن یان گێلیی.

—تۆمەتبارکردنی کەسێك بە پەتاو نەخۆشییەکی پیسی وەك سیل و تاعون یان بە ناسەقامگیری سێکسی و شتی تری لەم بابەتە.

—هەوڵدان بۆ داوەراندنی کەسێك لە نووسینگە یان بازرگانی یان کارو پیشەکەیدا، یاخود بەکارهێنانی شێوازی نادروست بۆ زامنکردنی ژیان، تا ئاستی نزیککردنەوەی لە مەترسی لەدەستدانی پلەوپایەکەی. یان تۆمەتبارکردنی بە دزی و

تێوەگلانی ناڕاستەوخۆو نەشیاوی، تا ئاستی نزیککردنەوەی لە ئازار ئینجا چ لە بازرگانی، یان کارو پیشەکەیدا بێ.

هەروەها ڕۆژنامەوان دەبێ خۆی لەبەکارهێنانی ئەم جۆرە دەربڕینو وشانەی خوارەوە بپارێزێ، لە کاتی بەکارهێنانیشیاندا دەبێ ئاگادار بێ:

"دز، داپلۆسێنەر، دەستدرێژکەر، گێرەشێوێن، ئاگرکەرەوە، ئاژەڵ، خاوەن دوو ژن، پڕو پووچ، ساختەکار، بەرتیل خۆر، لۆتیایەتی، دزی، سەرخۆش، پیلانگێڕ، ساختەچی، تاوانبار، باج نەدەر، پایە نزم، هەڵاتوو لەسەربازی، ڕاهاتوو لەسەر خواردنەوە، هەوڵی تێکدانی ویژدانی سوێند خۆر یان کارمەندێك، سوێند خواردن بە درۆ، ناپاکی، خۆکردن بە کەسێکی تر، هەڵاتوو لە دادوەریی، بکوژ، خوێنرێژ، فێڵباز، دووڕوو، پۆخڵ، دوو زمان، شێت، دزیکاری، درۆزن، ڕۆژنامەوانی ناسراو بەناوبانگ زڕاندن، ئازاردەر، سۆزانی، قولە ڕەش (بۆ شەرمەزارکردن)، بێ نرخ، گەواد، سیحرباز، دەست درێژکەر، بێ سەرپەرشت، فیتنەچی، ئەو پارێزەرەی پەنا دەباتە بەر شێوازی نا دروست، دابڕاو، هەڵاتوو لەکار، ڕفێنەر، سیخوڕ، ئاژەڵ دز، ملکەچ، خیانەتکار .... هتد. کە ئەمانەی پێشەوە هەریەکێکیان بەسە بۆ ئەوەی ببنە هۆکارێك بۆ داوا لەسەر یەکێك تۆمارکردن، وەك زانیاریی بڵاوکردنەوە لەسەر ئاسنگەرێك کە لە کارەکەیدا ساختەی کردبێ یان زیاتر زێڕنگەرێك شتی تری بە زێڕ فرۆشتبێ یان کەسێك کەبیرە دروست دەکاتو ئاوی پیسی تیادا بەکار دەهێنێ یان ئەو مامۆستایەی هیچ شتێك دەربارەی ئەو بابەتە نازانێ کە خۆی وا دەردەخات شارەزایی تەواوی لەبارەوە هەیە یان دادوەرێك کە نەشیاو بێ.

## ٣-گومانکردن Insinuation

ئەگەر گومانکردن ڕەگەزەکانی ناوبانگزڕاندن بگرێتە خۆی، بێگومان ئەویش دەچێتە چوار چێوەی ئەو چەمکەوە.

هەروەها ئاماژەو گاڵتەجاریش مۆركێكی ناوبانگزڕاندن وەردەگرن ئەگەر چەند سیفەتێكی وەك (ماری ئەفسونە بەستووەكە) یان (پارێزەری پاك) بخرێتە پاڵ كەسێكەوە.

## ٤- زەرەرمەندییەكان Damages

ئەو زەرەرمەندییانەی لە كێشەكانی ناوبانگزڕاندنەوە دەكەونەوە، دەكرێ بكرێن بە سێ جۆرەوە: گشتیو تایبەتو سزایی Punitive.

بوونی بەڵگەیەك بۆ ناوبانگزڕاندنو دیاریكردنی ڕادەی ئازار پێگەیشتن وەكو ئەنجامێكی سروشتی بۆ بڵاوكردنەوەی بابەتی لەو جۆرە، ئەو وەختە بە زەرەرمەندیی گشتیی بڕیاری لەسەر دەدرێ.

ئەگەر ئەو كەسەی داواكەی تۆمار كردووە توانی ڕوودانی زەرەرمەندییەكی تایبەت دەربخات، ئەوا بڕیار لەسەر زەرەرمەندیی تایبەت دەدرێ، بەهەرحاڵ جگە لە زەرەرمەندیی تایبەت دەكرێ بڕیار بەزەرەرمەندیی گشتیش بدرێ، هەروەها وەكو سزایەك بەرامبەر بەو پیس و پۆخڵی لایەنی دەستدرێژكەر، دەكرێ بڕیار بەزەرەرمەندیی سزایی بدرێ، بەڵام ئەو كەسەی داوای تۆماركردووە دەبێ بەڵگەی بۆ بوونی ئەوپیس و پۆخڵییە هەبێ، لەلایەكی دیكەوە دەكرێ بڕیاری زەرەمەندیی سزایی بدرێ ئەگەر بەڵگە بۆ بوونی فەرامۆشكردنێكی ئاشكرا هەبێ، یان تەنانەت دوای ئاگاداركردنەوەشی لەوەی ئەو بابەتانە ڕاست نین، بەڵام ڕۆژنامەكە دووبارە بابەتی ناوبانگزڕاندن بڵاو بكاتەوە.

## ٥- بەرگریكردنەكان Defenses

ناوبانگ زڕاندن سێ جۆر زەرەرمەندیی لێدەكەوێتەوە: گشتیو تایبەتو سزایی.

لە دژی ناوبانگزڕاندنی پێشبینی كراویشدا پێنج جۆر لە بەرگریكردن هەن:

أ- ڕاستی: بڵاوکردنەوەی ڕاستییەکان بە بەرگریکردنێکی تەواو دادەنرێن، ئەو کەسەی ڕاستییەکان بڵاو دەکاتەوە دەبێ تەنیا بەمە واز نەهێنێ، بەڵکو دەبێ توانای هەبێ بەڵگەی یاساییش بۆ ڕاستییەکانی بخاتە ڕوو، بانگەشە کردنیش بۆ ئەوەی کە بابەتە پڕ لە ناوبانگزڕاندنەکە لەسەر زاری کەسێکی تر بڵاو کراوەتەوە بە بەرگری لەقەڵەم نادرێ. چونکە ئەگەر کەسێك لێدوانێك ڕابگەیەنێ و ناوبانگ زڕاندنی یەکێکی تر بگرێتە خۆی، ئەوکاتە بەرپرسیارێتی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆی خاوەنی لێدوانەکەو ئەو ڕۆژنامەیەش کە بڵاوی کردۆتەوە.

ب- ئیمتیاز (Privilege): دەکرێ بەبێ هیچ مەبەستێکی ئازار پێگەیاندن و لە پێناوی هەندێك ئامانجی پاساوداردا زانیارییی یان هەندێك برگەی نێو تۆمارو بەڵگەنامەکان بڵاو بکرێنەوە، ئەمەش بە حوکمی یاسا بەناوبانگزڕاندن لەقەڵەم نادرێ تەنانەت ئەو زانیارییانە هەندێك بنەمای ناوبانگزڕاندنیش بگرنە خۆیان.

ت- توانجی دادوەرانە (Fair Comment)

شانۆنووس و ئەکتەرو ئەو کەسایەتیانەی خاوەن پلەو پایەی بەرزن و کەسایەتیە گشتیەکانیش کە مایەی سەرنجی جەماوەرن، بە زۆری ڕووبەڕووی توانج و ڕەخنەی دادوەرانە دەبنەوە، ئەو ئیمتیازەش لایەنی گشتی ژیانی ئەو کەسایەتییانە دەگرێتەوەو پەیوەندی بە ژیانی تایبەتیانەوە نییە، هەروەها دەبێ هیچ جۆرە ئازار پێگەیاندنێکیشی لێ نەکەوێتەوەو مەبەست لەدوایەوە ئاگادارکردنی جەماوەر بێ لە مەسەلەکان، هەروەها نابێ زمانی ڕەخنەیی بەکارهێنراو توندو ئازاربەخش بێ، شرۆڤەکردن و ڕوونکردنەوەش لە شێوەی توانجدا بن نەوەك تۆمەتبارکردن، لەلایەکی دیکەوە بابەتی وروژێنراو دەبێ دەربارەی شتێك بێ بەلای ڕای گشتیەوە بایەخدار بێ وەك دەربڕینی توانج دەربارەی کێشە گرنگەکان و بەڕێوەبردن و دادوەری و وێنەو فلیم و هونەری تەلارسازیی و دامودەزگا گشتیەکان.

پ- نەبوونی مەبەستی ئازار پێگەیاندن (ڕق Malice):

وەك چۆن پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد، لە کێشەکانی ناوبانگزڕاندندا، ئازار پێگەیاندن توخمێکی گرنگەو دیاربوونی دەبێتە مایەی زەرەرمەندییەکی گەورە.

ئازاردانیش دوو جۆری هەیە: ئازاردانی کردەیی، واتە لە مەبەستو نیازێکی خراپەوە سەربگرێ، جۆری دووەمیش ئازاردانی یاساییە کە بەبێ بوونی پاساوی یاسایی مافەکانی ئەو کەسە فەرامۆش دەکات.

ت- پاشگەزبوونەوە (پاشەکشەکردن Retraction)

هەندێك جار ڕۆژنامە دەتوانێ خۆی لە کێشەکانی ناوبانگزڕاندن ڕزگار بکات، لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی بابەتێکەوە کە تیایدا پاشگەز بوونەوەی بەپەلەی خۆی ڕادەگەیەنێ بەرامبەر بەوەی پێشتر بڵاوی کردۆتەوە، ئەگەر داواکارییەکە قبوولّ کرا بێگومان ئەو پاشەکشەیە دەرەنجامەکانی سوکتر دەکات، بەتایبەتیش ئەگەر ڕۆژنامە بابەتی پاشگەزبوونەوەکەی لە هەمان شوێنو بە هەمان قەبارەی بابەتی پێشو، بڵاو بکاتەوە.

٦-زامنکردنی سەلامەتی Playing Safe

بەو پێیەی ڕاستی باشترین بەرگرییە لە دژی تۆمەتی ناوبانگزڕاندن، بۆیە بەرپرسیارییەتی یەکەمی ڕۆژنامەوان ئاشکرایە:

دەبێ سەد لە سەد وردبین بێت، ئەمەش مانای ئاگاداریی‌و هۆشیاریی‌و کۆشش‌و ماندوو بوون دەبەخشێ، دەکرێ گرنگترین ڕێو شوێنەکانی ئاگاداربوون کە دەبێ ڕۆژنامەوان جێبەجێیان بکات لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆیان بکەینەوە:

- دڵنیابە لەوەی ناو و ناونیشانی دروستو وردت دەسگیر کردووە.
- بوەستەو بیر بکەرەوە: ئایا ئەمە ئازار بەناوبانگ یان بەرژەوەندیی کەسێك دەگەیەنێ؟

– هیچ کەسێك بە دز یان ڕفێنەر یان تاوانبار یاخود هەر سیفەتێکی تاوانکاری دیکە وەسف مەکە، تەنیا دوای دەرچوونی بڕیاری دادگا نەبێ، هەروەها پێشبینی ئەو شتانە مەکە کە لەوانەبێ دادگا ئەنجامیان بدات، هەموو کاتێکیش لە یادت بێ کەسی گومانلێکراو بە بەندکراو دانانرێ پاش بڕیاری دادگا نەبێ و تا کاتی دەرکردنی بڕیاری تاوانبارکردنیش ئەو کەسە بە بێتاوان دەمێنێتەوە.

– تاوانبارکردنە فەرمیەکان کە لەلایەنی فەرمیی پەیوەندارەوە دەردەکرێن، ئەوانەن کە دەبێ ڕۆژنامە بڵاویانبکاتەوە.

– دەتوانرێ ئەو هەواڵانە بڵاو بکرێنەوە کە پەیوەندییان بە دەسگیرکردن و تاوانبار کردنەوە هەیە، بەمەرجێك دەبێ نووسەر زانیارییەکانی لەسەرچاوەی فەرمییەوە وەرگرتبێ نەوەك سەرچاوەی دیکە، هەروەها دەبێ قسەی ئەو شایەتانەش بڵاو بکرێتەوە لە کاتی سوێندخواردندا دەیکەن.

– ڕۆژنامەوان دەبێ ئاگادار بێ لە بەکارهێنانی دەربڕینی وەك: فەرمانگەی پۆلیس دەڵێ، یان پێی وایە کە، یان لە هەواڵەکاندا هاتووە کە ...، چونکە لە کاتی جێگیربوونی تۆمەتی ناوبانگزڕاندنیشدا ئەو جۆرە دەربڕینانە بەشدار دەبن لە ئاسانکردنی دەرکردنی حوکمدا.

– بەهیچ شێوەیەك مەنووسە: کەسێك بەهۆی تاوانێکەوە داواکراوە، ئاگات لە نووسینی ئەو جۆرە شتانە بێ: بۆ لێکۆڵینەوە سەبارەت بە تاوانێك داواکراوە یان بۆ وەڵامدانەوەی تۆمەتبارکردن بە ئەنجامدانی تاوانێك.

– ئاگاداربە لە لکاندن یان ئاراستەکردنی تۆمەت، وا باشترە بڵێی دوو ئۆتۆمۆبیل بەر یەك کەوتن لەوەی بڵێی ئۆتۆمبیلێك بەر یەکێکی تر کەوت، ئەوە ئەگەر یەکێکیان لەبنەڕەتدا نەوەستێنرابێ.

– دڵنیا بە لە ڕاستیی پڕوپاگەندەو وتەو توانجەکان.

– ئەو لێدوانانەی مایەی مشتومڕن، هەمیشە بۆ سەرچاوەیەك دەگەڕێنرێنەوە.

– لە یادت بێ زۆر جار دەرکەوتووە کە شایەتحاڵ ڕاست ناکات، بۆیە هەوڵ بدە قسە لەگەڵ زۆرترین ژمارەی شایەتحاڵەکاندا بکەیت.

– ئەگەر گومانت هەبوو لەوەی کەسێك ناوو ناونیشانی خۆی بە دروستی پێ داویت، بنووسە: "ئەوەی ناوی خۆی بە .... دا" یان "فیسار کەس .... کە ناونیشانی خۆی بە ...... دا".

– دڵنیا بە لەوەی مەبەستتە بیڵێی، بۆ نموونە دوور بە لەوەی بڵێی کەسێك لە نەشتەرگەریدا مرد، کاتێك مەبەستت ئەوە بێ دوای نەشتەرگەرییەکە مرد.

– ئاگاداربە سەبارەت بە جۆری وێنەی بەکارهێنراو.

– دووبارە بڵاوکردنەوەی ئەو لێدوانەی پێشتر شێوازێکی دیکەی ڕاگەیاندن بڵاوی کردۆتەوەو ناوبانگزڕاندنی تیادا بووە، بەناوبانگزڕاندن دادەنرێ، ڕۆژنامە بەبێ ڕەچاوکردنی سەرچاوەی زانیارییەکانی بەرپرسە لە هەموو ئەوەی بڵاوی دەکاتەوە.

– لەکاتی تووڕەبووندا یان بەمەبستی گەیاندنی ئازار بە کەسێك، هیچ شتێك مەنووسە، بە بەیاننامەو لێدوانەکانیشەوە کە لە ڕاستیان دڵنیایت، تا هێمن دەبیتەوە.

– لە کاتی نووسینی چیرۆکێکی هەواڵیدا، لایەنی سۆزداریی‌و بۆچوونە کەسێتییەکانت لە یاد بکە.

– خۆت لە تیلنیشان (تلمیح)و گومان‌و گاڵتەجاڕیی دوور بخەرەوە.

– لەیادت بێ لە زۆربەی حاڵەتەکاندا پاشەکشەکردن، بەرگریی نییە.

– ئەوەی نووسیوتە – بەر لە بەدەستەوەدانی – بە باشی بیخوێنەرەوە.

– ئەگەر گومانت لە چەند زانیارییەك هەبوو، فەرامۆشیان بکە.

# هێنانەدی ئان‌و ساتی هەواڵ

# Keeping up-to date

یەکەم: ناساندن

١–کەسەکان

٢–ڕێکخراوەکان

٣–شوێنەکان

٤–ڕووداوەکان

٥–وشەکان

دووەم: بەدواداچوون

١–چیرۆکی ڕۆژی دواتر

٢–دەرخستنی بەدواداچوون

٣–توانجی ڕۆژی دواتر

٤–بەخشینی مۆرکی خۆماڵیی

٥–خستنەوەیادی ڕووداوە ڕابردووەکان

٦–چیرۆکی هەواڵیی بەردەوام

٧–زیندووکردنەوەی چیرۆکی هەواڵیی

٨–لێکۆڵینەوەکان

٩–ژیاندنەوەی چیرۆکی هەواڵیی

سێیەم: دووبارە داڕشتنەوە

١–سروشتی دووبارە داڕشتنەوە

٢–دەستنیشانکردنی خاڵی گرنگ

٣–شاردنەوەی خاڵی گرنگ

٤–پێشەکیی هەمەلایەن

٥–چیرۆکی یەکگرتوو

٦–گۆشەی ناوخۆیی

هیچ شتێك لەبیری خوێنەری ڕۆژنامە كورتتر نییە، بەڵام ڕەچاوكردنی ئاستی ئاگاداریی‌و وردبینیی خوێنەریش لە ماوەی خوێندنەوەی چیرۆكی هەواڵیدا زۆربەی ڕۆژنامەكران چیرۆكە هەواڵەكان بەخێرایی دەخوێننەوە، ئەوە ئەگەر لە بنەڕەتدا بیانخوێننەوە — ڕۆژی دواتریش كە ژمارەیەكی تازە دەردەچێ‌و پێشهاتی تازە سەبارەت بە هەمان ئەو چیرۆكە هەواڵە بلاودەكرێتەوە، ئەو وەختە خوێنەر بۆی دەردەكەوێ كە زۆربەی برگەو بەشەكانی لەیاد نەماوە، ئەو دیاردەیە ڕووداو و ئەو كەسایەتیانەش دەگرێتەوە كە ناویان لە هەواڵەكاندا دەهێنرێ، ناوەكان وەك دەموچاو وان‌و لەوانەیە ئاشنایەتییەكیان پێوە دیاربێ، بەڵام هەوڵ بدە بە وردی دەستنیشانیان بكەو بیانناسێنەرەوە.

بەشێك لەبەرپرسیارێتی ڕۆژنامەوانیی، شرۆڤەكاریی — ڕوونكردنەوەكارییە، كە لێیانەوە بیری خوێنەر دەبوژێنێتەوە، ئەمەش وا لە ڕاپۆرتە هەواڵیی نوێ دەكات كە زیاتر شیاوی لێتێگەیشتن بێت.

## یەکەم: ناساندن Identification

پابەندبوونی ڕۆژنامە بە پێشکەشکردنی ناساندنێکی گونجاو بۆ ئەو کەس و گرووپ و شوێن و ڕووداوانەی لە چیرۆکە هەواڵییەکاندا باسیان لێوە دەکرێ، مەسەلەیەکە لە هەموو ژوورەکانی نووسینی هەواڵەکاندا دانی پێدا نراوە.

بنەمای پشت پێ بەستراویش ئەوەیە هەرگیز وا لێکنەدرێتەوە خوێنەر لەوانەیە ئەو چیرۆکە هەواڵییەی خوێندبێتەوە کە ڕۆژی پێشوو سەبارەت بە هەمان بابەت لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوکراوەتەوە.

### ١-کەسەکان

زۆر کەم ڕێکدەکەوێ بەبێ جۆرێك لە ناساندن و دیاریکردن، ناوی کەسێك لە چیرۆکێکی هەواڵییدا بهێنرێ، تەنانەت ئیشکەرێکی کۆشکی سپیش ناوو نازناوو پایەکەی ئاشکرا دەکرێت، پێناسەکردنی ئەو کەسایەتیانەش کە ناویان لە هەواڵەکاندا دەهێنرێ لەڕێگەی ڕابردووی هەواڵیی یان بەهۆی گرنگییانەوە ئەنجام دەدرێ، کەسانی ئاساییش بە چەند ڕێگەیەك پێناسە دەکرێن لەوانە:

—ناونیشان: "لە کوێ دادەنیشی" یەکێکە لەو پرسیارە سەرەتاییانەی ئاراستەی کەسێك دەکرێ کە خەریکی پێشکەشکردنی زانیاریی بێ لەبارەی خۆیەوە، لە چیرۆکی هەواڵییدا ناونیشانی کەس، شوێنەکەی دیاریدەکات، خوێنەریش بایەخ بەمە

دەدات و ئەو کەسایەتیانەشی لا گرنگن کە لە نزیکییەوە دەژین، مەرجیش نییە بیانناسیٚ، دەبیٚ هەولْبدریٚ ناونیشانیٚکی وردو دروست وەربگیریٚ.

چەندین کیٚشەی ناوبانگزڕاندن هەن بەهۆی لیٚکچوونیٚکی ناوەوە بەرز کراونەتەوە، بەلاّم زۆر کەم ڕیٚکدەکەویٚ ناوو ناونیشان وەك یەك وابن. "پیتەر ڤاریلی – ١٥٩ شەقامی نزیملی– سەرقاڵی دار بڕینەوە بوو کاتیٚك دەستی ڕاستی خۆی بڕی و گەیەنرایە نەخۆشخانە".

بەلاّم هەندیٚك هەواڵ هەن پیٚویست ناکات تیایاندا ناونیشانی کەسان بهیٚنریٚ وەك ئەمانەی خوارەوە:

*جۆن سمیس لە کۆگای دەرمانی خۆیدا دەسگیرکرا، لەو هەواڵەدا باشتر وایە لە جیاتی ناونیشانی مالْ، ناونیشانی کۆگاکە بهیٚنریٚ.

*ریچارد راد، لە دادوەرییەکدا شایەتە کە پەیوەندی بە تاوانیٚکەوە هەیە. (پەیوەندیی بە چیرۆکەکەوە خۆی لە خۆیدا پیٚناسەیە).

*پیٚنج کچ لە ١٩٧٦– باکوری دیربون دەسگیرکران، (تەنیا پیٚویستی بە ژمارەی شەقام هەیە).

*جۆن دوی تایپست، تەرمەکەی دۆزیەوەو بانگی پۆلیسی کردو وەسفی گومانلیٚکراوەکەشی ئاشکرا کرد، (لەبەر ئەوەی بەشیٚوەك لە شیٚوەکان پیٚناسەکراوە، کەواتە پیٚویست بە ناونیشانی ماڵەکەی ناکات).

*ئەفسەریٚکی پۆلیس دزیٚك دەسگیر دەکات، (پلەو پایەی ئەفسەرەکە بەسە بۆ ناساندنی).

–پیشە: occupation "چ کارەیت؟" یەکیٚکە لەو پرسیارە گرنگانەی ئاراستەی ئەو کەسە دەکریٚ کە ڕۆژنامەوان زانیارییی لەبارەوە کۆ دەکاتەوە.

*ڕۆژی دوو شەممە، بەهۆی خۆدزینەوە لە دانی باج، دۆناڵد سورنسون – ٥١ ئیٚدوارد سنوین–ی نویٚنەری ناوچەکە لە یەکیٚتی کرێکاراندا بۆ ماوەی دوو ساڵ زیندانی کراو بە ١٥٠٠ دۆلاریش سزا درا.

*ئەمڕۆ ئاسنگەرێك شارەزایی خۆی لە بواری نەشتەرگەری ئاژەڵدا تاقیکردەوە، کاتێك هەوڵی ڕزگارکردنی ژیانی –ڕومبو–ی سەگەکەی دا کە کەوتبووە تەڵەیەك کە بۆ بەرازە کێوی نرابۆوە.

–تەمەن: وا باوە تەمەنی ئەو کەسە باس بکرێ کە لە کێشەیەکی دادوەرییە گلاوە یان ئەوەی بۆتە قوربانی ڕووداوێك، تەمەنیش ئەگەر لە چیرۆکدا گرنگ نەبێ، دەکرێ لابدرێ. زۆر لە کەسایەتییەکان ناخوازن باس لە تەمەنەکانیان بکرێ، بەڵام خوێنەران بە تاسەوەن بۆ زانینی تەمەنی پاڵەوانان.

*ئەمڕۆ ولیەم مۆرڤ تەمەن ١٦ ساڵو خوێندکار لە دواناوەندی گرینۆچ، جۆن براونی تەمەن ٢١ ساڵی دزە چەکداری ناسی، ناوبراو یەکشەممەی ڕابردووماڵی مۆرڤ لە توتاز ئەفینۆ بڕیبوو.

زۆرجار تەمەن دەبێتە سیفەتو تایبەتمەندیی:

*شەممەی داهاتوو کچێکی تەمەن ١٨ ساڵ شوو بە پیاوێك دەکات تەمەنی ٧٣ ساڵە، چونکە (بەشداربوون لە بیروباوەڕە ئاینییەکانمان گرنگترە لە بوونی جیاوازیی لەنێوان تەمەنەکانماندا).

–پلەوپایە: Title

کەسێك کە ناوبانگێکی هەبێ و پێی بناسرێتەوە، ئەوا نووسەر دەبێ بەکاری بێنێ، باشتریشە ناوبانگە کە کورت بێو لە پێشەوەی ناو دابنرێ، ئەگەر نا باشترە لە دوای ناوەکەوە بێ وەك:

*نووسەری شارەوانی، جۆرج هومانسۆن دەست دەکات بە ....

*جیمس ویسلی، کۆمیسیاری کاروبارە گشتیەکان نوێنەرایەتی شار دەکات لە .... .

- ناوبانگ Nickname

زۆر بە کەمی ڕێکدەکەوێ ناوبانگ، بەبێ بوونی ناوی یەکەم بەکاربهێنرێ، بەزۆریش لەنێوان ناوی یەکەمو نازناو دادەنرێ، لە هەواڵە وەرزشیو بابەتە ناهەواڵییەکانیشدا دەکرێ ناوبانگەکان بە تەنیا دابنرێن. لە هەندێك حاڵەتیشدا کەسایەتییە ناسراوەکان زیاتر بە ناوبانگەکانیان دەناسرێنەوە نەوەك ناوەکانیان، وەك IKe بۆ ئایزنهاوەرو Bing بۆ گرۆسبیو B بۆ ڕۆس.

کاتێکیش ئەو ناوبانگانە زۆر ناسراوو بەربڵاو دەبنەوە، دەکرێ لەناو دوو کەوانە دانەنرێن، لەوانەشە هەندێك ڕۆژنامە ناوبانگ بۆ ئەو کەسایەتیانە دابهێنن کە لە هەواڵ یان لە بواری هەواڵیی تاوانکاریدا ناوەکانیان دووبارە دەبێتەوە.

-ڕەگەز Race، نەتەوە Nationality:

خەڵکانی سەر بە کەمە نەتەوەکان زۆر بە توندی دژی بەکارهێنانی ئەو دەربڕینانەن کە لەو چیرۆکە هەواڵانەدا بۆ دیاریکردنی ناسنامە بەکار دەهێنرێن کە پەیوەندییان بە تاوانەوە هەیە، بە تایبەتیش لەسەردێڕی وەك: "ڕەش پێستێك دەسترێژی دەکاتە سەر کچێکی منداڵ" و "ئەمریکییەکی بەڕەسەن پۆڵەندی بانکێك دەدزێ".

نابێ ئەو جۆرە دەربڕینانە بەکاربهێنرێن تەنیا لە کاتی پێویستدا نەبێ، لەکاتی بەکارهێنانیشیاندا دەبێت پەیوەندی پتەویان بە بابەتەوە هەبێ، مەسەلەکەش ئەو وەختە زەحمەتتر دەبێ کە هەواڵیی خەڵکی ناسراوی نێو سیاسەتو هونەرو وەرزش ڕووماڵدەکرێ، چونکە کەسانێك هەن دەخوازن وردەکاری زۆر دەربارەی ئەوانە بزانن کە بە ئەستێرەیان وەسف دەکەن، لەو حاڵەتەشدا بڵاوکردنەوەی وردەکاری لەو جۆرە دوورە لە هەر مەبەستێکی خراپو نابەجێ. دەربارەی ژمارەیەك کەسی دیکەی وەك میوزیك کارو هونەرمەندانیش بڵاوکردنەوەی زانیاریی پاشکۆیی دەبێتە سەرچاوەیەکی هێز بۆیان.

"دوێنێ ئەلفرید پۆلەر بوو بە یەکەم ڕەش پێست کە بۆ پایەیەکی گشتی لەکەرتی کاونتی هەڵدەبژێردرێت"

–رابردووی هەواڵیی: کە ناوی کەسێك لە هەواڵەکاندا وەك پەیوەندکار بە ڕووداوێکی گرنگ دووبارە دەبێتەوە، ئەو کەسە خاوەنی هێزێکی هەواڵیی تەواوەو دەکرێ سوودی لێ وەربگیرێ و لە کاتی ناوهێنانیشیدا لە هەواڵێکی تازەدا، دەتوانرێ بۆ ناساندنی کەسێك دووبارە بەسەر بکرێتەوەوە،" ئەمڕۆ جێگری پشکنەری گشتی لە کەرتی، رایمۆند، بڕیاری دامەزراندنی خاتوو جین بۆنتیی تەمەن ٢٢ ساڵی دەرکرد، ناوبراو خەڵاتی (باشترین منداڵی لەماوەی ٢٠ ساڵی ڕابردوو) دا پێ بەخشراوە.

–دەسکەوتەکان: دوای تێپەڕبوونی چل ساڵ، تا ئێستاش شارل لیندبێرگ بەوە دەناسرێ کە "یەکەم کەس بووە بەتەنیاو بەبێ وەستان بەفڕۆکە لە نیویۆرکەوە فڕیوە بۆ پاریس". ئەو پێناسەیەش بە درێژایی ژیانی ناوبراوو تەنانەت دوای مردنیشی بەکار دەهێنرێ.

"کاتژمێر شەشی سەر لە بەیانی ئەمڕۆ، لە تەمەنی ٨٨ ساڵیدا، دکتۆر هول فۆستەر، یەکەم پسپۆڕی لوت و گوێ و قوڕگ لە تەکساس کۆچی دوایی کرد..."

–ڕێکەوتی مێژوویی: هەندێك جار ناساندنی کەسێك بە پەیوەندی لەگەڵ ڕووداو یان ئاڵوگۆڕی مێژوویی کە لە ژیانیدا ڕوویاندابێ، دەبێتە سەرچاوەیەکی هێز، بە تایبەتیش ئەگەر ئەو ڕووداوانە پەیوەندیان بە شتێکی هەنووکەییەوە هەبێ.

"ڕۆژی شەممەی داهاتوو، یولیوس جاکبسۆن خانەنشین دەکرێ، ناوبراو ٣٨ ساڵە چۆتە ڕیزی دەستەی باجی داهات، ئەوکاتە خەڵکانێکی کەم باجیان دەداو ئەویش بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەکارەکەیدا بەردەوام بووە".

–ناوبانگ: کە کەسێك بەناوبانگەکەی پێناسە دەکەی، دەبێ دڵنیابیت لەوەی ئەو ناوبانگە شایەنی ئاماژە پێکردنە، لەوانەیە ڕۆژنامە ئاماژە بە کەسێك بکات و وەك گرنگترین مەرجەع لە بابەتێکی دیاریکراودا وەسفی بکات:

"دوێنێ جیمس ئیدری ناسراو بە دەوڵەمەندو سەرکەوتووترین سوارچاک لەمێژووی ئەمریکای لاتیندا لەگەڵ روس ئیدر جیابووەوە".

–نزیکی: گرنگی هەواڵی کەسێك لەوانەیە لە ئەنجامی نزیکیی یان دۆستایەتی لەگەڵ کەسایەتیەکی گرنگدا دروست ببێ. "جیمس گارفیلدی ئەفسەر لە تیپی هوارچاکانی ١٠٧ ی سەر بە پاسەوانانی ئۆهایۆو نەوەی جیمس ئیبرام گارنفیلدی بیستەمین سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا، مەشقێکی هاوینە لە نورس نوکس ئەنجام دەدات....."

"دوێنێ لە ئەنجامی نەخۆشیەکدا کە پێنج هەفتە درێژەی کێشا، ڕۆبرت کامبل ماکوبنیی نەوەی رۆبرت بۆرنزی مەرجەعی بەناوبانگی شیعری سکۆتلەندی کۆچی دوایی کرد"

–وەسف: هەندێك جار ڕۆژنامەوان پێناسەکەی بە برێك وەسفی کەسیی ڕوون دەکاتەوە:

"سەرەڕای شێوازی ساکاری کۆبووەوانی ئۆتێلی شیرمان، بەڵام ئەوانە نوێنەرایەتی باشترین لێکۆڵەرەوانی تایبەت دەکەن و لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیشەوە سەرقاڵی سازکردنی یەکەمین کۆنگرە بوون بۆ لێکۆڵەرە نێودەوڵەتییەکان"

أ–هێنانەدی کێشکردن (الجاذبیة) لە پێناسەدا:

پێویست نییە پێناسە فەرمی بێ و دڵتەنگی پێوەدیار بێ، بۆیە لە چیرۆکە هەواڵییە گرنگ و سەرنج ڕاکێشەکاندا دەکرێ پێشێلی هەموو ڕێساکانی پێشوو بکرێ بەڵام بەمەرجێك ئەمە بەپێی سەلیقەیەکی دروست جێبەجێ بکرێ.

ب–دیاریكردنی پێناسە: باشترین ڕێگە كە دەبێ بۆ پێناسەكردنی كەسێك بگیرێتە بەر ئەوەیە كە دەبێ هەر حاڵەتێك بە تەنیا دیاری بكرێ، زۆر جاریش كەسایەتی بەگرنگترین ئەو دەسكەوتانەوە پێناسە دەكرێ كە وەدەستی هێناون:

"لە وەرزی داهاتوودا، هارۆلد بانك — ی كاپتەنی هەڵبژاردەی نیشتمانی خۆی بۆ سەركردایەتیكردنی تیمی نیشتمانی كاندید ناكات". هەروەها دەبێ پێناسە لەگەڵ سروشتی هەواڵ بگونجێنرێت: "سەرۆك ئایزنهاوەر كە بەر لە ساڵی ١٩٤٨ بەشداری لە هەڵبژاردنەكاندا نەكردووە، خەریكی پلاندانانە بۆ گواستنەوەی تۆماری هەڵبژاردنی خۆی لە نیویۆركەوە بۆ پەنسلڤانیا...."

"پۆل جۆنزی دادوەری ئیتیحادی، كە پێشتر یاریزانێكی بەناوبانگی یاریی تۆپی پێ بووە، چاو بەو داوایانەدا دەگێڕێ كە یانەی .... لە دژی یاریزان ... تۆماری كردووە".

پ– پێناسەكردنی دوولایەنە:

هەندێك جار، بە تایبەتی لەكاتی ئاماژەكردن بە كورتەیەكی مێژوویی دەربارەی كۆچی دوایی كەسێك، دەتوانرێ زیاتر لە پێناسەیەك لە پێشەكی هەواڵدا دابنرێ.

"ئێوارەی ڕۆژی هەینی، لە ئەنجامی نەخۆشیەكی كوشندەدا، ولیەم سكیفلن —ی سەرۆكی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی كۆمپانیای سكیفلنو بازرگانی بەناوبانگی داودەرمانو بانگەشەكاری ناسراو بۆ چاكسازیی حكومیو فێركردنی ڕەش پێستەكان، لەماڵەكەی خۆیدا كۆچی دوایی كرد".

ت– ئەو وشانەی یەك مانا دەبەخشن (هاو واتاكان):

مەحاڵە سێ پێناسە بەكار بهێنرێو نەبێتە مایەی قەرەباڵغیی لە پێشەكیدا، بۆ دووركەوتنەوەش لەمە، دەكرێ چەند خاڵێكی پێناسەكردن كە هەمان مانایان هەبێ بۆ ناوی ئەو كەسە دابنرێ كە لە پێشەكیی هەواڵدا ناوی هاتووە، بەم جۆرەو بە

مەبەستی دووركەوتنەوە لە دووبارەبوونەوەی ناو، دەتوانریٚ ناوبانگو نازناوو ڕابردووی هەواڵیی و وەسفی جۆراو جۆر بەكار بهێنرێ.

"ل. میلارد-ی ئەندامی پێشووی ئەنجومەنی شارەوانی دووپاتی كردەوە كە لیژنەی بەكارهێنانیان لە پێشانگاكاندا نەیتوانیوە ئامانجەكانی دەستەبەر بكات، میلارد كە یەكێكە لە گەورەترین لایەنگرانی ئەو لیژنەیە، پێی وایە كاتێك ئەندامی ئەنجومەنی شارەوانی بووە، هەوڵی تێكدانی كاری لیژنەكە دراوە، سەرۆكی دەستەی ڕۆبال دای تەمەن ٧٨ ساڵ ئەوەشی گوت كە لێكۆڵینەوەی لەگەڵ ٢٠ ئەندام ئەنجام داوەو بۆیان دووپاتكردۆتەوە لایەنگیریكردن لەو لیژنەیە سوودی نیە.....".

ج- "كێ"ی نادیاریكراو:

كاتێك "چی what" لە چیرۆكی هەواڵییدا گرنگتر دەبێ لە "كێ who"، ئەو وەختە دەكرێ پێناسە زیاتر دەربخرێ و ناویش بۆ بڕگەی دووەم هەڵبگیرێ.

"شوانێكی ئەبرەشیە كە تەمەنی ٣٢ ساڵە، وەك ڕێنمایی كارێك بۆ لاوان و بەرپرسی لێكۆڵینەوە ئاینییەكان دامەزرێنرا، بڕیاریش وایە لە كانوونی دووەمی داهاتوودا، ریف ئێرنست پایە تازەكەی وەربگرێ".

ح- دواخستنی پێناسەكردن:

كە تێبینی قەرەباڵغیی پێشەكی دەكرێ، پێناسە بۆ بڕگەی دووەمی چیرۆكی هەواڵیی دوا دەخرێ.

"ریگنالد بۆرنێ تواناى خۆی لەسەرپەرشتیكردنی كۆبوونەوەیەك پیشان دا كە ١٢٠٠ نوێنەری جوتیاری و هاوسەرەكانیان ئامادەی بوون و كاتژمێرێك و بیست خولەكی خایاند.

خاوەن قژی خۆڵەمێشیو سەرۆکی سەندیکای کرێکارانی پلاستیك، لەرێگەی باسکردن لە پرۆژەو کارە زەبەلاحەکانەوە توانی جەماوەرەکەی خۆشحاڵ بکات...".

خ- چوارچێوەی ژیاننامە: هەندێك رۆژنامە چوارچێوەیەك بەکاردێننو تیایدا زانیاریی پێناسەیی دەربارەی ئەو کەسە کۆدەکەنەوە کە پەیوەندی بە چیرۆکە هەواڵییەکەوە هەیە، دواتر بەگوێرەی ویستی خوێنەران، ئەو زانیارییانە باس دەکەن کە دەبنە مایەی زیادکردنی ناسینی کەسایەتییەکەو زیاتر تێگەیشتن لە چیرۆکەکە.

۲-رێکخراوەکان:

دەبێ رێکخراوەکانیش دروست وەك خەڵك، بەشێوەیەکی گونجاو پێناسە بکرێن بۆ:

أ- شێواز: "بەرێوەبەرانی بونیاتنانی مۆنۆمێنتەکان لە ئەمریکادا، کە نوێنەرایەتی دەزگای نەتەوەیی بۆ فرۆشتنی مۆنۆمێنتەکان دەکەن، بە شەرمەزاریی نیشتمانیی تۆمەتبارکران..."

ب- مەبەست: "دەزگای میلتۆن بۆ گواستنەوە، کە بە مەبەستی رزگارکردنی کەرتی گواستنەوە لەو گێرەشێوێنیە دروستکراوە کە تێی کەوتووە، ساڵی یەکەمی خۆی تەواو کرد هەرچەندە دەسکەوتی گرنگیشی وەدیهێناوە، بەڵام هێشتا ئاستەنگی زۆری لەبەردەمدا ماوە."

پ- دەسکەوتەکان: "پیشانگای هەرێمی ئەلمادا، کە یەکێکە لە گرنگترین پێشانگاکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی لە ئەمریکادا، سبەینێ فیستڤاڵی خۆی دەکاتەوە کە ۱۲ رۆژ بەردەوام دەبێ".

ت- ناوبانگ: "میلتۆن، کە بەڕێژایی ١٣ ساڵی ڕابردوو سەرپەرشتیکاری پرۆسەکانی جوانکردنی شاری کردووە، بڕیارە لە کانوونی دووەمی داهاتوودا خۆی هەڵبوەشێنێتەوە"

٣- شوێنەکان:

کاتێك شوێن نەناسراوبێ، دەبێ پێناسە بکرێ، بۆ ئەوەی ببێت بە خاوەنی ماناو مەبەست بۆ ڕووداو.

شوێنیش وەك خەڵك (کەس) خاوەنی ناوبانگی خۆیەتیو دەکرێ بۆ پێناسەکردن بەکاربهێنرێ.

٤- ڕووداوەکان:

دەکرێ ڕووداو بەمانەی خوارەوەی پێناسە بکرێ:

-بەگرنگییو مەغزا.

-بەگرنگیی پەیوەندی لەگەڵ ڕووداوی تر (پێشەکیو چیرۆکە هەمەلایەنەکان).

-بەپەیوەندی لەگەڵ (کەش وهەوا)و ئەو ڕۆشناییەی کە دەبێ لەسەر بنەمای ئەوەوە لە (هەڵوێست) بگەیت.

-بە دەرەنجامە چاوەڕوانکراوەکان (پێشبینیکردن)

-بە ئاماژەکردن بۆ ڕووداوی پێشووتری پەیوەندیدار (پەیوەندی).

-بەڕێکەوت یان هاوکاتیبوونی لەگەڵ ڕووداوی تردا.

أ- بۆنە: دەبێ بارودۆخی ڕووداوە هەواڵییەکان - مەبەست، گرنگی، مەغزا، .... تاد یان، ڕوونبکرێنەوە.

"مەترسیدارترین مانگرتنەکانی کەرتی فڕۆکەوانی لەمێژووی میللەتدا، شەممە پێی نایە نێو (١٦)ەمین ڕۆژی خۆیەوە، بەردەوامیش دەبێ لە کۆسپ دروستکردن لەبەردەم ڕێبواران و گەشت و گواستنەوەی ئاسمانیدا".

بە زۆریش دەکرێ لە ئامانج یان لە گرنگیی بۆنەکەدا کە پەیوەندی بە بابەتی چیرۆکە هەواڵییەکەوە هەیە، بەرچاوترین خاڵی نێو هەواڵەکە بدۆزرێتەوە: "فورت واشکی-ی.ب. لێرە دابونەریتێکی کۆن شکێنرا، کاتێك ئافرەتێکی هیندیی بەڕەگەز سپی پێست بوو بە سەرۆکی هۆزی ئەرفاهۆ".

بەراوردکردنیش لە نێوان ڕووداوی هەنووکەیی و ڕابردووی هاوشێوەدا، دەکرێ لە پێشەکی یان ڕاستەوخۆ دوای ئەو باسی لێوە بکرێ.

ب-پێشەکی و چیرۆکە هەمەلایەنەکان:

پێشەکی هەمەلایەن و یەکگرتوو و ڕوونکەرەوەیە، کاتێکیش لە هەواڵە ڕاستەوخۆکاندا بەکار دەهێنرێ دەبێ لایەنگیری پێوە دیار نەبێ، بەو پێیەی چارەسەری چەند کێشەیەك دەکات مایەی گفتوگۆ نین.

لەوانەیە مەبەستی پێشەکی هەمەلایەن، شیکردنەوەی هەواڵە هەنووکەییەکان بێ لەژێر ڕۆشنایی ڕووداوی کۆن دا. "چەند بەڵگەیەکی دیکە هەن لەسەرئەوەی دەنگدەرانی شار مانگی ڕابردوو بەڕێوەبەرایەتییەکی چاکسازیان هەڵبژاردووە، بۆیە ئەمڕۆ پارێزگار ل. ویڤەر بڕیاری داخستنی هەموو شوێنەکانی کاتبەسەربردنی دەرکرد کە بە پێچەوانەی سیستمی تەندروستین لەشاردا".

جۆرێکی دیکەی پێشەکییە هەمەلایەنەکان جەخت لەسەر هەڵوێستەکان دەکەنەوە، کاتێك چیرۆکی هەواڵیی هەمەجۆر بەڵام پەیوەندیدار بەڕووداوێکی هەواڵیی گشتی لەبەردەستدا بن، دەکرێ ڕۆژنامە پەنا بباتە بەر کۆکردنەوەیان لەیەك چیرۆکی خاوەن پێشەکییەکی هەمەلایەندا.

بە زۆریش ڕووداوەکانی نێو ئەو پێشەکییە، پێویستی بەچەند سەرچاوەیەك یان چەند پەیامنێر و نێردراوێك دەبێت.

پ- پێشبینیەكان: دەكرێ لەڕێگەی ئاماژەكردن بە دەرەنجام یان پێشهاتە چاوەڕوانكراوەكانیەوە گرنگیی ڕووداوێك دەربخرێ، "ڕۆژی چوارشەممە، ئەو لیژنە تایبەتییەی ئەنجوومەنی شار بە مەبەستی چاوخشاندنەوە بە دە تاوانی گەورە دایمەزراندووە، بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ گوێ لە شایەتەكان دەگرێ، چاوەڕێیش دەكرێ ئەمانە دوا دانیشتن بن لیژنەكە سازیان بدات".

ت- پێكەوە گرێدان: پێكەوە گرێدان ئەو بەشەی پێشەكییە كە پەیوەندی نێوان ڕووداوی ئێستاو ڕابردوو دەردەخات.
"خاتوو كولینا كونوری تەمەن ٢٠ ساڵ، كە بەوە ناسراوە میراتێكی ٥٠٠ هەزار دۆلاریی پێ براوە، هەفتەیەك لەمەوبەر بەشێوەیەكی كتوپڕ دیار نەماو چوارشەممەی ڕابردووش دەركەوتەوەو ڕایگەیاند ئەو لە مۆڵەتدا بووە، بەڵام دوێنێ بۆ جاری دووەم سەرلەنوێ دیار نەمایەوە".

ج- هاوكاتبوون: گرێدان لەگەڵ چیرۆكە هەواڵێكی پێشوودا، دەكرێ لە ڕێگەی دەرخستنی هاوكاتبوونەوە ئەنجام بدرێ.
لەزۆر حاڵەتدا، بەهای هەواڵیی ڕووداوی هەنووكەیی لە بنەڕەتدا بۆ هاوكاتبوونی دەگەڕێتەوە، ئەمە لە كاتێكدا لەوانەیە ڕووداوی پێشووتر هیچ دەرفەتێكی ڕووماڵ كردنی بۆ ڕێك نەكەوتبێ.
"كارەساتی دووەم لە ماوەی دوو مانگدا، بووە مایەی زیادكردنی دڵتەنگیی خاتو ماری ماكنلی تەمەن ٢٦ ساڵ.
لە یەكی تەمووزدا، هاوسەرەكەی، تۆماسی شیرنەمەنی كاری تەمەن ٣٠ ساڵ لە ئەنجامی نغرۆبوونی لە چاڵێكدا كە قووڵاییەكەی ١٢ پێ بوو، گیانی لە دەست دا، دوێنێش ئۆتۆمبێلێك لە ڕۆبەرتی كوڕی دا كە تەمەنی ٤ ساڵ بوو".

٥- وشەکان:

هەندێك جار پێویست دەکات ڕستە یان برگە لە پێشەکیدا بەکاربهێنرێ، بە مەبەستی دیاریکردن یان ڕوونکردنەوەی ئەو ئاستەی کە تیایدا وشە یان دەربڕینێکی نائاسایی دەرکەوتوون.

## دووەم: بەدواداچوون (Follow up)

زۆربەی ئەو هەواڵانەی لە ژمارەیەكی رۆژنامەیەكدا بڵاو دەكرێنەوە، بەشێوەیەك لە شێوەكان پەیوەندیان بە هەواڵی دیكەوە دەبێ، لەوانەشە رۆژنامە پێویستی بە بڵاوكردنەوەی زیاتر لە بابەتێك هەبێ بۆ خستنە رووی هەر چیرۆكێك. دوای بڵاوكردنەوەی راپۆرتی یەكەمیش، پێشهاتی تازە دێنە پێشەوە.

توانای هەستكردن بە قۆناغەكانی ئەو چیرۆكەی كە دەبێ بنووسرێتەوە (بەدواداچوونی لەبارەوە بكرێ)، بۆ نووسەرو پەیامنێر مەسەلەیەكی زۆر گرنگە.

رۆژنامەكانیش لە پێناوی ئەو چیرۆكە هەواڵییانەدا زۆر بە وردی دەخوێنرێنەوە كە لەرووی شێوازی بنەرەتییەوە نا تەواون یان ئەوانەی دەبێ چاودێری پێشهاتەكانیان بكرێو بەدواداچوونیان لەبارەوە بكرێ.

### ١- هەواڵیی رۆژی دووەم The Second Day Story

لەوانەیە چیرۆكە هەواڵیی رۆژی دووەم چەند پێشهاتێكی لەم جۆرەی خوارەوە بگرێتە خۆی:

- زانیاریی تازە كە لە كاتی بڵاوكردنەوەی چیرۆكی یەكەمدا دەسگیر نەبووبن.
- كۆمەڵێك هۆكارو ئامانجو هاندەر كە لە چیرۆكی یەكەمدا بوونیان نەبووبێ.

–تازەترین و دوا پێشهات و دەرەنجام و ئاسەوارەکان کە لە دوای بڵاوکردنەوەی چیرۆکی یەکەم هاتبێتە ئاراوە.

–چەند لێکدانەوەیەك کەپەیوەندییان بە ڕووداوەکەوە هەبێ.

لەچیرۆکەکانی بەدواداچووندا، هەمیشە جەخت لەسەر تازەترین پێشهاتەکان دەکرێتەوە، جگە لەوە، لێرە بەکارهێنانی پێکەوە گرێدان ڕێسایەکی گرنگە.

دەبێ نووسەر هەرگیز وای لێکنەداتەوە کە خوێنەر چاوی بە چیرۆك یان چیرۆکە ڕابردووەکاندا خشاندووە، وەك چۆن هەموو ئەڵقەیەکی تازەی زنجیرەیەك دەبێ بە پێشەکییەکی وا دەست پێ بکات کە تیایدا ڕووداوە ڕابردووەکان کورت بکاتەوە، بە هەمان شێوە، هەموو چیرۆکە هەواڵێکی پەیوەندار بە ڕووداوێکەوە، دەبێ ئاماژەیەکی خێرا بۆ چیرۆکە هەواڵیی پێشوو بگرێتە خۆی.

بە زۆریش پێکەوە گرێدانەکە لە شێوەی دەربڕین یان نیمچە ڕستەیەکدا دەخرێتە پێشەکییەکەوە، لەوانەشە بۆ بڕگەی دووەمی چیرۆکە هەواڵەکە هەڵبگیرێ.

أ–زانیارییە نوێکان New Information

• "خاتوو ئەدمۆری تەمەن ٤٤ساڵ، کە لە دووری باڵەخانەیەك لە ماڵەکەی خۆیەوە، بە بووراوەیی لە شەقامی کولتر دۆزرابووەوە، ئێستا لە بارودۆخێکی ناهەموار و ئاڵۆزدا لە نەخۆشخانەی براین ماوردا کەوتوو، ئەمەش هاوکاتە لەگەڵ گەڕانی پۆلیس بەدوای کەسێکی نادیاردا، کە پێشبینی دەکرێ بەبێ مەبەست هێرشی کردبێتە سەری".

ب–هۆکار – پاڵنەر Cause – Motive

"ئەو چوار ئاگر کوژێنەرەوانەی ڕۆژی چوارشەممەی ڕابردوو لە یانەی شەوانەی Backstage ململانێیان لەگەڵ گڕی ئاگردا دەکرد، لەو ئاگرکەوتنەوەیەدا گیانیان لەدەست دا کە بە ئەنقەست بەردرابووە شوێنەکە.

دوێنێ فرانک کیتلیی سەرۆکی نووسینگەی سان فرانسیسکۆ و سەرۆکی نوسینگەی خۆپاراستن و لێکۆڵینەوەکان ئەو تۆمەتە ڕاشکاوانەیەی ڕاگەیاند.
دوای لێکۆڵینەوەیەک کە ٢٤ کاتژمێر درێژەی کێشا، کیتلی گوتی: ئاگر کەوتنەوەکە بەرێکەوت نەبووە".

پ- پێشهاتی نوێ: "هارنفۆرد -کون- أ.ب. جۆن ئیمانوێل، کە بۆ ماوەی شەش ڕۆژ لە فڕۆکەیەکی تێکشکێنراودا گیری خواردبوو، ڕۆژی چوارشەممە لە نەخۆشخانەی خارنفۆرد کۆچی دوایی کرد.
ئیمانوێل کە ڕۆژی یەک شەممە لەو بارودۆخەدا ڕزگار کرابوو، چوار شەممە لە نەخۆشخانەی میریدیانەوە گوازرابووەوە بۆ نەخۆشخانەی هارنفۆرد."

ت- ڕاوبۆچوون: "دایکو باوکی تووڕە بووەکە، ئەمڕۆ سیستمی "L" یان بە درێغیکردن تۆمەتبار کرد، کە بووە هۆی مردنی کوڕەکەیان کە تەمەنی هەشت ساڵ دەبوو.
سیستمی پەڕینەوەیە کە تەنیا یەک کەس بەڕێوەی دەبات، ژیانی منداڵانی سێ خوێندنگا ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە.
ڕۆژی سێ شەممەی ڕابردوو، کاتێک دۆناڵد کیفت بە پاسکیلەکەی هەوڵی پەڕینەوەی دەدا، کەوتە بەر شەمەندەفەرێکەوە.
خاڵەکانی پەڕینەوە دەرگایان بۆ دانراوەو ژمارەی ئەو شەمەندەفەرانەش زۆرن کە بە خێراییەکی زۆر تێدەپەڕنو تەنیا یەک کەسیش سەرپەرشتی ئەو دەرگایانە دەکاتو تەنانەت لە کاتی تێپەڕینی شەمەندەفەرەکانیشدا دەرگاکان بەکراوەیی جێدەهێڵێ.

۲-دەرخستنی بەدواداچوون:

چیرۆکی هەواڵیی بەخێراییەکی گەورە ئاشکرا دەبێ، بەجۆرێك بواری لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی تەواوی ڕووداوەکانی نابێت، لەگەڵ ئامادەکردنی دواچاپی ڕۆژی دواتریشدا، ئەوکاتە لەوانەیە پەرەپێدانی چیرۆکەکە، چ لەسەر شێوەی چیرۆکێکی دووبارە داڕێژراو یاخود چەند چیرۆکێکی پاشکۆیی تەواوبووبێ، نووسەریش ئەگەر خۆی بەشڵەژاویی و پابەند بە هەندێك ڕووداوی تازەوە ببینێتەوە، ئەوا لە توانایدا هەیە چیرۆکەکە بە شێوازی توخمی دەرخراو (چیرۆکی ناهەواڵیی Feature style) بگێڕێتەوە.

Laramie Boomerang

ئەمڕۆ بەرەبەیانێکی زوو، لێکۆڵینەوە لە ڕووداوێکی سەیر دەکرا، ئۆتۆمۆبیلێك کە زاف کون ویل-۸۰۳ شەقامی فلنت - خاوەنەکەیەتی، خۆی بە ئۆتۆمۆبێلێکی جۆری پیکابی وەستێنراودا کێشا کە س. میلڤن -٦٥٧ شەقامی نورس ئیس - خاوەنەکەیەتی، دواتر بەرهەیوانی ماڵی میلڤن کەوت.

سەرچاوەکانی پۆلیس ڕایانگەیاند کە خێزانی کون ویل بەنیازبوون بچن بۆ سەیران، دوای هێنانە دەرەوەی ئۆتۆمبیلەکەیان لە گەراج، کون ویل بەمەبەستی دڵنیابوون لە داخستنی دەرگای گەراج، لە ئۆتۆمبێلەکە هاتۆتە خوارەوە، ئەو وەختە ڕووناکایی ژوورەوەش کوژێنرابووەوە.

دواتر ئوتومبێلەکە جووڵاوەتەوەو ڕووی کردۆتە ڕۆژئاواو بەرەو شەقامی فانت شۆڕ بۆتەوە، هاوسەری کون ویل کە لەناوەوەی ئۆتۆمبێلەکەدا بووە هەوڵی وەستاندنی داوە بەڵام لە ڕاستیدا بە توندی پێی خستۆتە سەر بەنزین، لەبەرامبەریشدا ئۆتۆمبێلەکە دەرپەڕیوەو خۆی بە بەربەستێکی بەردیندا کێشاوە کە دەکەوێتە گۆشەی دووڕیانی هەردوو شەقامی فلنت و ئیت، ڕووەو باکور ڕۆیشتووەو

خۆی بە پیکابەکەی میلفندا کێشاوە، بەمە نەوەستاوەو بەردەوام بووە لە ڕۆیشتن تا لەبەردەمی ماڵی میلفندا خۆی بەدارێکدا کێشاوەو لە ڕەگو ریشەوە هەڵیتەکاندووە، دواتر وەستاوە، پێکدادانەکە دروست لەبەردەمی پەنجەرەی ژووری نوستنی میلفن‌و خێزانەکەیدا ڕوویدا، ئەگەرچی دیواری ژوورەکە زیاتر لە ١٠ ئینج لە شوێنی پێکدادانەکەوە دوور نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شووشەی پەنجەرەکە نەشکاوە، پۆلیس ڕایگەیاند کە میلفن‌و هاوسەرەکەی هیچ ئازارێکیان پێ نەگەیشتووە.

Laramie Bulletin

کاتژمێر چواری بەیانی بوو.

کون ویل‌و خێزانەکەی ئۆتۆمبێلەکەیان لەبەردەمی دەرگای ماڵەکەیاندا وەستاندبوو، ئامادەش کرابوو بۆ ئەوەی پێی بچن بۆ سەیرانێك لە کێڵگەکەیاندا لە دانیل واو.

کون ویل مەکینەی ئۆتۆمبێلەکەی داگیرساند، هاوسەرەکەشی لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو و خۆی بە پشتێنی سەلامەتی بەستبووەوە، کون ویل بیری کەوتەوە کە دەرگای گەراجی بەکراوەیی جێهێشتووە، ئەوەبوو چووە خوارو ڕووی کردە شوێنی مەبەست.

ئۆتۆمۆبێل جووڵایەوە.

خاتوو کون ویل هەوڵی دا خۆی لە پشتێنی سەلامەتی ڕزگار بکات، بەڵام هەر زوو وازی لەو بیرۆکەیە هێناو هەوڵی دا بەدەست‌و پێیەکانی کۆنترۆڵی بارودۆخەکان بکات، ئەگەرچی توانی خۆی بگەیەنێتە سوکانی ئۆتۆمبێلەکە، بەڵام لە جیاتی وەستاندن، پێی خستە سەر بەنزین.

ئۆتۆمبێل بە دەوری گۆشەکەدا سووڕایەوە، دەنگی بوقەکەشی بە توندی دەهات، خۆی بە ئۆتۆمبێلێکی جۆری پیکابدا کێشاو ٤٠ پێ فڕێی دایە ئەولاوە،

ئینجا بەر بەربەستێکی بەردین کەوت و ئەویشی چەند پێیەك دوورخستەوە، پاشان لە نزیك دیواری ژووری نوستنی میلڤنی دراوسێیاندا خۆی بەدارێکدا کێشا.

خاتوو کون ویل گوتی: پشتێنی سەلامەتی ڕزگاری کردم، مرۆڤ ناتوانێ پێشبینی بکات کەی ڕووداو دەقەومێ، خاتوو میلڤنیش گوتی: وامزانی شۆفێرەکە سەرخۆشە، هەروەها میلڤن گوتی: ٢٥ ساڵە ئەو دارەم چاندووە، تەنانەت ڕۆژێکیش لەو باوەڕەدا نەبووم ژیانمان ڕزگار دەکات.

کون ویلیش ئامادە نەبوو قسە دەربارەی ڕووداوەکە بکات، ئەوە بوو ڕووی کردە کێڵگەکەی و هاوسەرەکەشی بە تەنیا بەجێهێشت.

## ٣- لێدوانی ڕۆژی دواتر:

کاتێك سەرۆك وتارێك دەخوێنێتەوە یان دادگای باڵا بڕیارێك دەردەکات، یاخود داهێنانێکی زانستی گرنگ ڕادەگەیەنرێ، یان هەر ڕووداوێکی نائاسایی ڕوودەدات، ڕۆژنامەکان بە هەموو ولاتدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی ڕاوبۆچوونی کەسانێکی شیاو دەربارەی ئەوەی ڕوویداوە کۆ بکەنەوە، ئەو جۆرە چیرۆکە هەواڵیانەش دەبێ دووربن لە زیادەڕۆیی و شتە گشتییەکانیش دەبێ لە کەسایەتییە سەرەکییەکاندا کۆبکرێنەوە.

"نووسینگەی واشنتۆن – رۆبەرت باسکونی– ڕۆژی سێ شەممە، مشتومڕێکی بەرفراوان فەرمانگەکانی کۆنگرێس و نێوەندە یاساییەکانی گرتەوە، لە ئەنجامی هەڵسوکەوتی جۆن پۆڵ–ی ئەندامی ئەنجومەنی پیراندا، کاتێك ناوبراو پارێزەرێکی دەرکردە دەرەوە کە لەبەردەمی لیژنەی تایبەت بە چالاکییەکانی غەیرە ئەمریکیەکاندا خەریکی مورافەعەکردن بوو.

هاوكارانی داواكاری گشتی ڕایانگەیاند كە لیژنەی ئەنجومەن فشارو ترساندنیان بەرامبەر بەو ئەندامانە بەكارهێناوە كە نوێنەرایەتی چەند دژە شایەتێك دەكەن لەو لێكۆڵینەوانەدا كە لیژنەكە سەبارەت بە چالاكییەكانی فیت كۆنگ ئەنجامیان دەدات.

هاوكارانی پۆل لە لیژنەكەدا ڕەزامەندی خۆیان بەرامبەر بەو هەڵوێستەی دەربڕی، لە هەمان كاتیشدا داخی خۆیان بەرامبەر بە دەركردنی پارێزەرەكە پیشان دا.

تۆمارێكی نافەرمیش ڕووداوەكان تۆمار دەكاتو هەندێك ئاماژەش دەربارەی ئەوەی ڕوویداوە بەدەستەوە دەدات".

## ٤- بەخشینی مۆركی ناوخۆیی بە هەواڵ Localization

ئەو هەواڵە گرنگەی لە شوێنێكی دووردا ڕوویداوە، دەكرێ گۆشەیەكی ناوخۆیی پێ ببەخشرێ، یان پاڵ بە خوێنەرانەوە دەنێ بپرسن: "دەكرێ ئەمە لەلای خۆشمان ڕووبدات؟".

"هیچ پاساوێك بۆ ترسانی دایكو باوكان نییە لەوەی لە نەخۆشخانەكانی لەدایكبوونی ویلایەتدا هەڵەی وەك ئاڵوگۆڕكردنی منداڵان ڕووبدات، وەك چۆن مانگی ڕابردوو لە بیتمان – گارنەر لە كەرتی جۆرجیادا ڕوویدا. بەو پێیەی سیستمی دیاركردنو پێناسەكردنی بەكارهێنراو لە هەر سێ نەخۆشخانەكانی لەدایكبوونی ئەو كەرتەدا، هەرگیز ڕوونەدانی ئەمە مسۆگەر دەكات.

ئەگەر چیش زۆر لە نەخۆشخانەكانی لەدایكبوون وەكو ڕێو شوێنێكی خۆپاراستن شوێن پەنجەی پێو بەری دەست تۆمار دەكەن، بەلام بە ڕای جیمس باكستەری بەرپرسی سەرتاسەری لە نەخۆشخانەی گشتیدا، سەرپەرشتیكردنی گونجاو تاكە زامنكردنێكە بۆ ڕوونەدانی ئەو حاڵەتە".

### ٥- خستنەوە یادی ڕووداوە ڕابردووەکان Reminiscences

هەروەها خوێنەران لەوانەیە بپرسن: ئایا لەمەوبەر شتێکی هاوشێوەی ئەمە ڕوویداوە؟

خوێنەرە بەتەمەنەکان بەراورد لە نێوان ئێستاو ڕابردوودا دەکەن و ئەو چیرۆکانەش کە لە خەیاڵیاندا دەخولێنەوە، لەگەڵ ڕووداوی هەنوکەییدا پێکەوە گرێیان دەدەن.

"کوشتنی هەشت خوێندکاری پەرستیار لە شیکاغۆ ژمارەیەکی پێوانەیی پێکهێناوە."

ئەمە لە مێژووی هاوچەرخی شیکاغۆدا بەخراپترین ڕووداوی کۆمەڵکوژی دادەنرێ.

ژمارەی پێوانەیی پێشوو خۆی لەو کۆمەڵکوژیەدا نواند کە لە ڕۆژی خۆشەویستی —ڤالنتاین—دا ڕوویدا، کاتێك بێ ویژدانان حەوت کەسیان لە گەراجێکی ئۆتۆمبێلاندا کوشتبوو، لەو کۆمەڵکوژییەدا کە ناوبانگی شاری باندەکانی بە شیکاغۆ بەخشی، هیچ کەسێك دادگایی نەکرا.

کۆمەڵکوژی فۆرت دیربۆرن، کە لە ئابی ١٨١٢ دا ڕوویداو لە ئەنجامدا ٥٢ هاوڵاتیو سەربازو ٥٢ کەسی بە ڕەچەڵەك هیندی بوونە قوربانی، بەڵام ئەمە ٢٠ ساڵ بەر لە یەکخستنەوەی شار، ڕوویداوە.

لە چەند شوێنێکی جۆراوجۆری وڵاتیشدا، تاوانی بە کۆمەڵو ئەو زنجیرە کوشتنانەی کە لەلایەن کەسێکەوە ئەنجام دەدرێن، بوون بە دیاردەیەکی بەربڵاو، لە ئەیلولی ١٩٤٩دا، هوارد ئانرۆی تەمەن ٢٨ ساڵی دەمارگیری ئایینی، لە یەکێك لە

شەقامەکانی کامدن ١٣ کەسی بە دەمانچە ئەڵمانییەکەی کوشت، دواتر بە شێت لە قەڵەم دراو ڕەوانەی نەخۆشخانەیەکی تایبەت بە نەخۆشییە عەقڵییەکان کرا.

لە ساڵی ١٩٥٨ یشدا جۆن گیلبرت، لە ڕێگەی دانانی بۆمبێکی ئامادەکراو لەناو جانتای دایکیدا – بەرلەوەی لە دینڤەر سواری فڕۆکە ببێ – ٤٤ کەسی کوشت، بۆمبەکە لەو کاتەدا تەقیەوە کە فڕۆکەکە بە ئاسمانەوە بوو، پاشان گیلبرت دەسگیر کراو لە سێدارە درا.

هەر لە ساڵی ١٩٥٨دا شارل ستارکو بزەری تەمەن ١٩ ساڵ، ١١ کەسی لە نبرا کوشت، لە کاتی دادگایی کردنیشیدا ناوبراو تاوانی کوشتنی کەسێکی خستە ئەستۆی کچێکی دۆستی خۆیو لەبەرامبەریشدا ستارك لە سێدارە دراو دۆستەکەشی تا هەتا هەتایە خرایە بەندیخانەوە.

لە ساڵی ١٩٦٠یش، لە ئەنجامی تەقینەوەی بۆمبێك لەناو فڕۆکەیەکدا، ٣٤ کەس کوژران، دواتر جولیان فرانك کە یەکێك بوو لە قوربانیان تۆمەتبارکرا، گوایە ناوبراو ئەمەی وەکو پیلانێك ڕێك خستووە بۆ وەرگرتنی تەئمین لە دژی خۆکوشتن".

## ٦- چیرۆکە هەواڵیی بەردەوام The Running Story

تا ئەوکاتەی گۆشەو پێشهاتی تازە هەبن کە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون هەبێ، یان تا خوێنەران بایەخ پێدانیان بە ڕووداوەکان نامێنێت، ڕۆژنامەکانیش بەردەوام دەبن لە بەدواداچوونی چیرۆکە هەواڵییەکاندا. لێرەوە دەکرێ بڵێین: هەموو چیرۆکە هەواڵێکی داهاتوو بە مەبەستی گێڕانەوەی هەڵوێست بۆ ئێستا دەنوسرێ.

لە حاڵەتەکانی وەك: لافاو، جەنگ، دادگایی کردنە گەورەکان، ململانێ سیاسییە زەبەلاحەکاندا، ڕۆژانە بەڵکو هەموو کاتژمێرێك چیرۆکێکی هەواڵیی دەنووسرێن،

ئەمەش بۆ ئەوەی دوا پێشهاتەکان بخرێنە ڕوو، بۆیە لەوانەیە چیرۆکی تاوانێك بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك پێگەی یەکەم لەلاپەڕەی یەکەمدا داگیر بکات.

بڕوانە، چۆن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو چیرۆکەی خوارەوە پەرەی پێدراوە، ئەمەش لە پێشەکییە یەك لە دوا یەکەکاندا دەردەکەوێ کە ڕۆژنامەی کانساس سیتی ستار بڵاوی کردوونەتەوە:

"ئەمرۆ ١٢٤ هەزار ژن دەرفەتی ئەوەیان پێدرا کە ئاخۆ ڕازین وەکو سوێندخۆر کاربکەن. بڕیاریشە لە١٠ی مانگی حوزەیراندا ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی نهێنی بۆ داداگیهەرێمی جاکسۆن بگەرێێنرێنەوە"." پاش نیوەڕۆی ئەمرۆ، ٨٦ هەڵبژاردنی نهێنی دەربارەی خزمەتکردنی ژنان وەك سوێندخۆر لەدادگای هەرێمی جاکسۆن وەرگیراون، ٢٩ ڕاپرسی ئامادەن وەك سوێندخۆر کاربکەن، ٥٧ی تریش ئەو کارە ڕەتدەکەنەوە".

"پاش نیوەڕۆی ئەمرۆ ژمارەی ئەو ژنانەی دەخوازن وەك سوێندخۆر کاربکەن، ڕووی لە زیادبوون کرد، پاش ئەوەی لە کۆی ١٤٤٠ ڕاپرس کە بە دەستی لیژنەی سوێندخۆران گەیشتوون، (٣١٤) یان ئەو ڕاستیەیان دووپاتکردەوە کە لەنێوان چوار ژندا کە بەشداریان لە ڕاپرسیدا کردووە، یەکێکیان دەخوازێ وەك سوێندخۆر کاربکات، بەڵام ١١٣٦ ژنی تر، ناخوازن بەم جۆرە لە دادگای جاکسۆن دا کار بکەن".

## ٧- زیندووکردنەوەی چیرۆکی هەواڵیی The Revived Story

دوای چەند ڕۆژ یان هەفتە یان مانگێك، ڕۆژنامەوان لەوانەیە چەند ڕاستییەکی دیکەی بۆ دەربکەوێ.

"پێنج ساڵ لەمەوبەر دۆرسی ستیڤنس وەك پارچە بەفرێك هێنرایە نەخۆشخانەی میشێل ریز، پلەی گەرمایی جەستەی بەشێوەیەکی نامەقووڵ دابەزیبوو،

لەبەرامبەریشدا دەبووایە پزیشکەکان پێوەرێکی کیمیاوی بەکاربێنن، چونکە پێوەری پزیشکیی ئاسایی پلەی گەرما لە ژێر ۹۳ وە ناخوێنێتەوە، وەك زانراویشەی پلەی ئاسایی گەرمایی لەش (۹۸,٤)ە.

ئەو ژنە تەمەن ۲۳ ساڵە لە شەقامی فیرنون دۆزرایەوە، وەك زانراش، ناوبراو ۱۱ کاتژمێر لەوێ مابووەوە.

کاتێکیش ستیڤنس پشکنرا دەرکەوت:

خوێنەکەی بەستویەتیو وەکو قوڕێکی پەیت مەیووە، هەناسەکەشی لە نێوان ۳ – ٥ جار دایە لە خولەکێکدا، ئەمە لە کاتێکدا هەناسەی ئاسایی لە نێوان ۱۸ – ۲۲ جاردایە لە خولەکێکدا، هەروەها نەتوانرا پاڵە پەستۆی خوێنی تۆمار بکرێ.

ئەو حاڵەتەش سەرنجی تەواوی پزیشکانی ڕاکێشا، بۆیە ئەو ژنە بە (تۆپەڵە بەفری مرۆیی) و (کچی بەفرین) ناوزەدکرا.

خاتو ستیڤنس ڕۆژی شەممەی ڕابردوو بە مەبەستی یارمەتیدان لە نووسینی چیرۆکی نەخۆشییەکەیدا، جارێکی تر گەڕایەوە نەخۆشخانەی ڕیز. لەوێش لیدوانێکی فەرمی بەناوی نەخۆشخانەکەوە ڕایگەیاند:

"خاتوو ستیڤنس بەهۆی پەلە دەستکردەکانییەوە لە ژێر چارەسەرکردن دایەو بۆ ماوەی زیاتر لە دوو هەفتەش لێرە دەمێنێتەوە".

مانگێك دوای ئەوەی بۆ جاری یەکەم هێنرایە نەخۆشخانە، هەردوو پێو هەموو پەنجەکانی دەستی ڕاستو چوارپەنجەی دەستی چەپی بڕرانەوە.

خاتوو ستیڤنس تائێستاش ورەی بەرزەو وەختی خۆشی لە نەخۆشخانە بە خوێندنەوەو دروستکردنی فڕۆکەی بەچەرم دروستکراوەوە بەسەر دەبات، ئەمڕۆش ۲۸ساڵ تەمەنیەتیو لە شوقەیەك لە ۲۸۰۰ شەقامی لایك پاركدا دەژێت، ناوبراو دەڵێت: هێشتا ژنێکی لاومو تەواوی ژیانیشم ماوە تا بۆی بژیم".

Chicago Daily News

## ٨- گەڕان و پشکنینەکان Investigation

بەزۆری ئەو ئەرکانە ئامانجی سیاسییان لەدواوەیە، بەڵام دەرەنجامی لێکۆڵینەوەکن بێگومان لەبەرژەوەندیی جەماوەردا دەبن. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ڕۆژنامەکان بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن، بە تایبەتیش بەرپرسی گشتی، بۆ ئەوەی لە میانەی ڕۆشنایی خستنەسەری لە ڕێگەی ڕووماڵکردنی هەواڵیدا هەڵەیەك ڕاست بکاتەوە.

"کورتس فولەر نووسیویەتی: هێشتا دەرگای یانەکانی نایل سەنتەرو مۆرتۆن گروف یاری دەکەن و بەرەو ژوورەوە دەبنەوە، دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر سووتانی حەوت کەس لە یانەی (مواعید)دا کە دووانیان خوێندکاری زانکۆی نورسوستێرن بوون.

ساڵی ڕابردووش، پاش تێپەڕبوونی دوو هەفتە بەسەر کارەساتی یانەی (مەواعید)دا، دوو ڕۆژنامەوان سەردانی زیاتر لە ١٥ یانەیان لە شەقامی هواردو مۆرتۆن گروف و نایل سەنتەر کرد، بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ لەویانانەدا ئەو مەرجانە هەن کە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببنە مایەی کارەساتێکی وەك ئەوەی لە یانەی (مەواعید)دا ڕوویدا؟ بە تایبەتیش ئەوەی پەیوەندی بە خۆئامادەکردنەوە هەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر ئاگرکەوتنەوەیەك، ڕۆژی یەکشەممە هەردوو ڕۆژنامەوان سەردانی هەمان ئەو یانانەیان کردەوەو هەمان ئەو مەرجانەیان بەدی کردەوە.

لە سێ یانە گەورەکانی مۆرتۆن گروف و تایل سەنتەردا، دەرگاکان لەگەڵ ڕێنماییەکانی تایبەت بەڕووبەڕوو بوونەوەی ئاگرکەوتنەوەدا گونجاون و ڕووەو دەرەوە دەکرێنەوە، لە کۆی سێ یانەی دیکەشدا، لە دووانیاندا ئاماژەهەن و ڕێگەی دەرگاکانی بارودۆخی نائاسایی پیشانی خەڵك دەدەن.

لە چواری نیساندا، ئەنجومەنی شار بڕیارێکی دیکەی سەبارەت بەخۆپاراستن لە ئاگر دەرکرد، بڕیاریشە لە (٣٠)ی نیساندا کاری پێ بکرێ، بڕیارەکە فەرمان بە

هەموو یانەکان دەدات کە لایەنی کەم دەبێ دوو دەرگایان هەبێ و بەرەو دەرەوە بکرێنەوە، هەروەها تیایدا هاتووە کە دەبێ کەلوپەلی وا بەکاربێنن دژی ئاگر کەوتنەوە بن یاخو بە زەحمەت ئاگر بگرن.

بەڵام ئەم ڕێنماییانە جێبەجێ نەکران، ئەوەتا زیاتر لە نیوەی ئەو یانانەی ڕۆژی یەکشەممە هەردوو ڕۆژنامەوانەکە سەردانیان کردوون، بڕیارەکانیان پێشێل کردووەو تیایاندا هیچ ئامێرێکی ئاگرکوژاندنەوە بەدی نەکراون.

یەکێك لە شتە سەرسوڕهێنەرەکان کە لە یانەی بادی گاردندا ڕوویداوە، ئەوە بوو ئێمە سەرقاڵی گفتوگۆکردن بووین لەگەڵ کارمەندێکی ئەو یانەیەدا، لەناکاو پیاوێك خۆی کرد بە ژوورەوەدا و هاواری دەکرد کە ئۆتۆمبێلەکەی گڕی گرتووە، بەڵام هیچ ئامێرێکی ئاگر کوژاندنەوە لە یانەکەدا نەبوو، هەر ئەمەش کارمەندەکەی ناچار کرد شووشەیەکی پڕ ئاو بداتە پیاوەکە، ئەویش بەتاسێکەوە بردی و خۆی کرد بە دەرەوەی یانەکەدا".

## ٩-زیندوو کردنەوەی چیرۆکی هەواڵیی The Resurrected Story

هەندێك جار نهێنی و شاراوەیی باڵ بەسەر ساڵانێکی دووردرێژدا دەکێشێ، دواتر لە پڕێکدا ڕاستییەکی نوێ ئاشکرا دەبێ لەوانەیە ڕۆشناییەکی تازە بخاتە سەر ڕووداوێکی مێژوویی یان کەسایەتییەك.

لە کاتی نوسینی چیرۆکە هەواڵێکی لەو جۆرەشدا دەبێ ڕەچاوی ڕێسای بەستنەوەی بە ڕابردووەوە بکرێ، ئەگەرچیش زۆر کەم ڕێکدەکەوێ لە پێشەکیدا شوێنی هەموو ڕاستیە دۆزراوەکان یان ئەوانەی ژیانیان بە بەردا هێنراوەتەوە، ببێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر تاوانبارێك دەسگیر بکرێ کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە دەستی دادوەری ڕای کردبێ، ئەو کاتە چیرۆکی هەواڵیی لەوانەیە پوختەیەك دەربارەی تاوانەکەی بگرێتە خۆی، دوور نییە هەندێك وێنەشی لەگەڵ بێ کە لە کاتی ڕوودانی تاوانەکەدا کێشراون یان دروستکراون.

لە هەموو هۆڵێکی نووسینیشدا لیستێکی تایبەت بەو چیرۆکانە هەیە کە بە حاڵەتی (وەستاندنی شەڕ) وەسف دەکرێن و دوور نییە لە هەر ساتێکدا ئاشکرا ببن.

لەم نموونەیەی خوارەوەدا تێبینی چۆنێتی گرێدان بە ڕووداوە ڕابردووەکانەوە بکە، کە پێشتر ڕوویانداوە: "دە حاڵەتی تای تیفۆید، یەکێکیان بووەهۆی مردنی توشبووەکەی، ئەمەش بۆ ئاهەنگێکی شوکردن گێڕدرایەوە کە لە یەکی تشرینی دووەم لە کڵێسای روسیهیل ئەنجام درا، ئەمڕۆ دکتۆر ئادەمسۆنی سەرۆکی فەرمانگەی روسیهیلی تەندروستیی ئەمەی ڕاگەیاند".

"نۆرث مانشتەر –٤ی تەمموز– تۆم ریچارد دەستنووسێکی کۆنی لە کتێبخانەی جۆن ئۆرلی دۆزیەوە کە بەم دواییانە کڕیویەتی.

کتێبە دۆزراوەکە چەندین تێبینی دەربارەی پرۆسەی داهێنانی بیل ١٨٧٦ و گڵۆپی کارەبایی و جیاکردنەوەی ئەلەمنیۆم لە شتی ترو خشتەیەکی تایبەت بە لۆگاریتمەکانی میکانیکی و بۆردێکی ئاماژە کارەباییەکان دەگرێتە خۆی".

## سێیەم: دووبارە دارشتنەوەی Rewrite

سەردەمی پێشینەی ڕۆژنامەوانیی کە ڕۆژنامە ڕۆژانە گەورەکان هەوڵیان بۆ دەدا، بەبێ گەڕانەوە بەسەرچوو، تەنیا هەندێك حاڵەتی کەم نەبێ لە ژمارەیەك شاری گەورەدا. ڕۆژنامە ڕۆژانە پارێزگارەکانیش لە بواری هێنانەدی پێشینەی ڕۆژنامەوانیدا هیچ پێشبڕکێکەرێکیان لەبەردەم دا نەمایەوە، بگرە لەوەش زیاتر، هەواڵە ڕۆژانە جیهانییەکان لە بنەڕەتدا لەلایەن دوو ئاژانس (ئاسوشیتد پرێس و یونایتد پرێس ئەنتەرناشناڵ)ەوە کۆدەکرێنەوەو ئەوانیش بەپەلە بەسەر هەموو بەشداربووواندا بڵاویاندەکەنەوە، لەمە گرنگتریش، ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان وایان کردووە کە ڕۆژنامەکانیش ناچار بکەن ببنە بینەری یەکەمی هەواڵەکانیان ئەمڕۆ ماوەیەکی کەم دوای ڕوودانیان، ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دەستدەکەن بە فراوانکردن و ڕوونکردنەوەو شرۆڤەکردنی هەواڵەکان، بەڵام بە زۆری دوای تێپەڕبوونی چەند هەفتەو مانگ و ساڵێك زانیاریی تازە دەست دەکەون و دیدێکی تازە بەڕووداو دەبەخشن. ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆ لە هەوڵی دەستەبەرکردنی یەکەمین مافی بڵاوکردنەوەی ژیاننامەی ئەو کەسایەتیەنەدان کە دەتوانن ڕۆشنایییەکی تازە بخەنە سەر ڕووداوە کۆنەکان و لەگەڵ گۆڤارەکاندا کەوتوونەتە پێشبڕکێ.

### ١- سروشتی دووباره نووسینەوه Nature of Rewrite

ئێستا لە هۆڵەکانی نووسینی هەواڵەکاندا نازناوی –نووسەری دووباره نووسینەوه– دەدرێتە پاڵ ئەو کەسەی کاتی خۆی لە نووسینگەکەدا بە وەرگرتنی هەواڵ لە ڕێگەی تەلەفۆنەوه لە پەیامنێرانی ڕۆژنامەکەی بەسەر دەبات، بە مانای کۆنی زاراوەکە، بڕێکی زۆری هەواڵ هەن پێویستییان بە دووباره نووسینەوه هەیە، واتە لەگەڵ نەبوونی هیچ هەواڵێك (یان بوونی کۆششێکی کەم) بۆ دەستەبەرکردنی ڕاستی تازه لەسەرچاوەی چاپکراوی ترەوه.

ئەو جۆره سەرچاوانەش بڵاوکراوه ڕۆژنامەوانییەکان و ڕۆژنامە ناوخۆییەکان و ڕۆژنامە بازرگانییەکان و ڕاپۆرت و لێدوانە گشتی و تایبەتییەکان و ئەو بڵاوکراوانەش دەگرێتەوه کە گروپە تایبەتییەکان دەریاندەکەن.

هەندێك ڕۆژنامە ستوون بۆ ئەو هەواڵە کورتانە تەرخاندەکەن کە لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردن یان تەلەفۆنەوه دەست دەکەون، هەروەها ئەو چیرۆکە هەواڵییانەش کە لە چاپە بەراییەکانی خودی ئەو ڕۆژنامەیەدا بڵاوکراونەتەوه، لەوانەیە لە پێناوی دوا چاپەکانی پێویستیان بە دووباره داڕشتنەوه هەبێ، بە تایبەتیش کاتێك چەند ڕووداوێك دەسگیر دەبن، یان لەبەر چەند هۆکارێك کە پەیوەندییان بەڕووبەر یان ئاشکراییەوه هەبێ..... تاد.

بە شێوەیەکی گشتی، ئەو نووسەرەی ئەرکی دووباره داڕشتنەوەی پێ دەسپێردرێ، هەوڵی زیادکردنی زانیاریی تازه دەدات، وەك بڵێی لە کاتی داڕشتنی یەکەمدا لەبەردەستدا نەبوون. لە هەوڵی دۆزینەوەی گۆشەیەکی تازەشدا دەبێ نووسەر دووربێ لە قوربانیدان بە پێشەکییەکی باش و شاردنەوەی زانیاریی گرنگ.

دەرککردنیش بەوەی کە ڕادیۆ یان تەلەفزیۆن دەتوانێ سنوورێك بۆ نەمانی کاریگەری هەواڵ دابنێ، لەوانەیە ببێتە مایەی سەرهەڵدانی هەڵەیەکی لەو جۆرە، ئەمە ئەگەر کۆشش نەکرێ بۆ خۆ دوور خستنەوە لەم تێڕوانینە.

## ٢-دەستنیشانکردنی ڕووماڵێکی گرنگ Picking the Feature

نووسەری پسپۆڕ دەبێ پابەند بێ بە دووبارە داڕشتنەوەی ڕێسا گونجاوو ناسراوەکانی نووسینی هەواڵەکانەوە، ئەو ڕێسایانەی چەند شتێك دەگرنەوە لەوانە: پێشەکیی چیرۆکی هەواڵیی دەبێ خاڵ یان ڕەگەزی هەواڵیی گرنگ لە چیرۆکدا بگرێتە خۆی، زەحمەتی دووبارە داڕشتنەوەش ئەوکاتە دەردەکەوێ کە نووسەری پسپۆڕ دڵنیادەبێ لەوەی ئەو خاڵە گرنگە لە داڕشتنەوەی یەکەمی هەواڵدا بەباشی بایەخی پێدراوەو خراوەتە ڕوو، بۆیە چیرۆکە هەواڵیی یەکەم چەند هەژاربێ، ئەوەندەش کاری ئەو نووسەرە ئاسان دەبێ کەئەرکی دووبارە داڕشتنەوەی پێ سپێردراوە، لەو حاڵەتەشدا نووسەر لەسەریەتی کاری زیاتر بکات لەوەی سەرلەنوێ بابەتەکە ڕێکبخاتەوە یان تەنیا وشەکانی نێو پێشەکیەکە بگۆڕێ.

بۆیە نووسەری تایبەت بە دووبارە داڕشتنەوە، کاتێك ڕووداوی زیاتری لەوەی لە چیرۆکە ڕەسەنەکەدا هەن — لەبەردەستدا نەبێ، لەسەریەتی چەند پرسیارێك ئاراستەی خۆی بکات، لەوانە:

-ئایا نووسەری یەکەمی چیرۆکە هەواڵییەکە، خاڵی بنەڕەتیو سەرەکی نێو ڕووداوەکەی دەرخستووە یان لە شوێنێکی ناو چیرۆکەکەدا بزری کردووە؟

-ئایا خاڵێکی دیکەی گرنگی وەك ئەو خاڵە هەیە کە نووسەری یەکەم بەکاری هێناوەو دەکرێ لە دووبارە داڕشتنەوەدا بەکار بهێنرێ؟

-ئایا لە توانامدا هەیە سەرلەنوێ چیرۆکەکە دابڕێژمەوە، بە جۆرێك وەکو چیرۆکێکی بەدواداچوون بخوێنرێتەوە، لە ڕێگەی جەختکردن لەسەر دوا پێشهاتەکان

لە چیرۆکی یەکەمدا باسیان لێوە کراوە یان لە ڕێگەی پێشنیازی کاریگەریی چاوەڕوانکراوی داهاتووەوە؟

–ئایا دەتوانم پێشەکییەکی هەمەلایەن بنووسم بەجۆرێك ببێتە مایەی شیکردنەوەی ئەو ڕەگەزە هەواڵییە، لە ژێر ڕۆشنایی هەواڵێکی دیکەدا؟

–ئەمڕۆ هیچ هەواڵێکی دیکە هەیە بتوانم لەگەڵ ئەو چیرۆکەدا تێکەڵی بکەم؟

–لە حاڵەتی بوونی ئەو چیرۆکە هەواڵییانەی لەو ڕۆژنامانەدا بڵاو دەکرێنەوە کە لەدەرەوەی هەرێم دەردەچن، ئایا گۆشەیەکی ناوخۆیی وا هەیە کەشێ لە هەواڵەکەدا بایەخی زیاتری پێ بدرێ؟

أ–شاردنەوەی خاڵە گرنگەکە:

ئەگەر نووسەری چیرۆکی یەکەم هەڵەی کردبێ لە دیاریکردن و دەرخستنی خاڵە گرنگەکەدا، ئەوکاتە ئەرکی ئەو نووسەرە زۆر ئاسان دەبێ کە ئەرکی دووبارە داڕشتنەوەی پێ سپێردراوە. بۆ نموونە:

چیرۆکی یەکەم – داڕشتنی یەکەم:

"مەسەلەی گوێگرتن لە دەنگدەرانی کەرتی میلتۆن لە میانەی هەڵبژاردنە تایبەتییەکاندا دەربارەی پێشنیازی أ.ل هۆنتەر سەبارەت بە دەرکردنی کۆمەڵێك سەنەد بە بەهای ٤٠٠ هەزار دۆلار بۆ چاککردنەوەی شەقامەکان، کێشەی گرنگی کۆبوونەوەی دوێنێ ئێوارەی ئەنجومەنی شار بوو.

جویل ئولد بێرگ لیستێکی بەناوی ئەو شەقامانە پێشکەش کردو ڕایگەیاند پێویستی زۆریان بە نوێکردنەوە هەیە، هەروەها داوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی تایبەتی کرد، لەمەشدا أ. ئارنز دژی وەستاو جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە شار بە دەستی قەرزی گەورەوە دەناڵێنێ.

دوای مشتومڕێکیش کە سێ کاتژمێری خایاند، ئەنجومەن بە کۆی ٢١ دەنگ بەرامبەر ١٧ دەنگ ڕەزامەندی سەبارەت بە پێشنیازەکەی ئۆلدبێرگ پیشان دا کە

بریتیی بوو لە بانگەشەکردن بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی تایبەت لە ١٤ی ئەیلولی داهاتوودا".

داڕشتنەوەی چیرۆکەکە — داڕشتنەوەی دووەم:

"لەچواردەی ئەیلولی داهاتوودا، دەنگدەرانی کەرتی میلتۆن لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی تایبەتەوە بڕیار دەدەن ئاخۆ قەرزەکانی ئەنجومەنی شار بەبڕی ٤٠٠ هەزار دۆلار ڕوو لە زیادبوون دەکەن لە پێناوی جێبەجێکردنی بەرنامەی نوێکردنەوەی شەقامەکاندا".

ب- خاڵی لاوەکی Secondary Feature

لەم نموونەیەی خوارەوەدا بڕوانە چۆن ئەو نووسەرەی ئەرکی دووبارە داڕشتنەوەی پێ سپێردراوە، خاڵێکی لاوەکی گرنگی هاوشێوەی ئەو خاڵە سەرەکییەی دۆزیوەتەوە کە لە داڕاشتنی یەکەمدا دەرخراوە:

چیرۆکی یەکەم:

"ئەو زەرەرمەندیانەی لە ئەنجامی ئاگرکەوتنەوەی سەرلەبەیانی ئەمڕۆ لە کارگەی سەرەکی کۆمپانیای کیمیاوی لە شاری کالیمۆت کەوتنەوەو سێ کاتژمێر درێژەی کێشا، خۆیان لە ٧٥ — ١٠٠ هەزار دۆلار دا. کارگەی ناوبراو کە ترشی نیتریك بەرهەم دێنێ، سەر بە کۆمپانیای ویلسۆنە.

باوەڕ دەکرێ ئەو ڕووداوە دەرەنجامی ئەو ئاگرە بێ کە کاتژمێر ٢,٥ لەلایەن دوو کرێکارەوە بەدی کرا، لەوکاتەشدا هەر خۆیان لە باڵەخانەکەدابوون.

لە هەوڵێکیشدا بۆ ڕزگارکردنی بڕێکی ئەو ترشە لە چەند تانکیەکدا کە بەهاکەی ٥٠ هەزار دۆلار بووە، هەردوو کرێکار: ئابل یۆترو جاردبین سەری تانکیەکانیان داخستووە.

تا کاتی کردنەوەی تانکییەکانو دڵنیابوون لەوەی ئاخۆ ئاو چۆتە ناویانەوە مەحاڵە بتوانرێ بە وردی زەرەرو زیانەکان بخەمڵێنرێن. بەوپێیەش ترشی نیتریك زوو

گڕ دەگرێ، بۆیە لە درێژایی ململانێیاندا لەگەڵ ئاگرەکەدا، تیمەکانی ئاگر کوژێنەوەی هەردوو شاری هافوندو کالیمیت ڕووبەڕووی مەترسیەکی گەورە بوونەتەوە".

چیرۆکە دووبارە داڕێژراوەکە:

"دوێنێ پیاوانی ئاگرکوژێنەوەی هەردوو شاری هافوندو کالیمیث، قارەمانانە ڕووبەڕووی مەترسیەکانی گڕگرتنی چەند کۆگایەکی گەورەی ترشی نیتریکی زوو گڕگرتوو بوونەوە، کاتێك بەرەوڕووی ئەو ئاگرە بوونەوە کە کارگەی کیمیاویی سەرەکی کۆمپانیای لە شاری کالیمیت وێران کرد. زەرەروزیانەکانیشی بە ٧٥ — ١٠٠ هەزار دۆلار مەزەندە کران.

کارگەی سووتاو کە لقێکی کۆمپانیای ویلسۆنە بە تەواوی بۆ بەرهەمهێنانی ترشەکان تەرخان کراوە. بڕێکی زۆری ترشی نیتریك بە بەهای ٥٠ هەزار دۆلار لە تانکیەکاندا کۆکرابووەوە.

ئاگرەکە سێ کاتژمێر بەردەوام بوو. ئەمڕۆ بڕیارە تانکیەکان بکرێنەوە بۆ دیاریکردنی ئەوەی ئاخۆ ئاو چۆتە ناویان و ترشەکەی تێکداوە یان نا.

دوو کرێکار بەتەنیا لەکارگەکە بوون، لە کاتی کەوتنەوەی ئاگرەکەدا تانکیەکانیان داخستبوو".

پ- بەدواداچوون Following-up Feature

لە کاتی داڕشتنەوەی چیرۆکە هەواڵیی بەدواداچووندا، نووسەر ڕاست بووە لەپێشبینی کردنی کاریگەریی داهاتووی چاوەڕوانکراودا، بڕوانە ئەم چیرۆکە چۆن ڕەگەزی پێکەوەگرێدان دەگرێتەخۆی و چۆن دەکرێ وەك چیرۆکێکی بەدواداچوون بخوێنرێتەوە، ئەمەش سەرەڕای نەبوونی زانیاریی تازە تیایدا.

چیرۆکە بنەڕەتییەکە:

"دوای ئەوەی بەهۆی تەنافی جل هەڵخستنەوە هەر سێ کچەکەی خۆی خنکاند، شەوی ڕابردوو لە ماڵی خۆیدا لە -٤٢٣ شەقامی ریبا- خاتو غلیداهایدا خۆی خنکاند.

تەرمی هەر سێ کچەکە: رۆبێرتا-چوار ساڵ، روس- دوو ساڵ، هازیل-چوار مانگ لەلایەن خاتوو سیلڤیا بریمەنی دایکی هایداوە دۆزرابوونەوە، کاتێک بەمەبەستی سەردانی کچەکەی، کاتژمێر هەشتی سەر لەبەیانی گەیشتبووەجێ و تەرمەکانی لەسەر قەرەوێڵەکە دیبوو لە نزیکیانەوەش تەرمی دایکەکەیان کەوتبوو.

سەرخێزانی ئەو خانەوادەیەش ویلفرید هایدایە، ناوبراو دارتاشێکی بێکارەو پێشبینی دەکرێ لەوکاتانەدا لە ناوچەیەکی ڕۆژئاوای ناوەڕاست بووەو بەمەبەستی گەڕان بەدوای کارێکدا ویستوویەتی بچێتە تکساس.

گرنگترین بەڵگەش لەو لێکۆڵینەوەیەدا کە بڕیارە ئەم بەیانییە دەست پێبکات، ئەو تێبینییەیە کە خاتوو هایدا بۆ دایکی جێی هێشتووەو ئەمە دەقەکەیەتی:

"مایەی داخە ویلفرید منداڵی هەبێ، کە لەسەفەرکردنیشدا ناتوانێ تەنانەت کارتێکیشیان بۆ بنێرێ". ویلفرید سێ هەفتە لەمەوبەر سەفەری کردووە، دوا شتیش کە لە بارەیەوە زانراوە ئەوەیە کە لە سنسانی بووەو چاوەڕێش دەکرا دواتر ڕووبکاتە ئەندیانا پولیس و شیکاغۆو سبینگ فیلدو سانت لویس، بەرلەوەی بەرەو ڕۆژئاوای باشوور بکەوێتە ڕێ.

پۆلیس پێی وایە ئەم هەڵسوکەوتەی خاتوو هایدا لە ئەنجامی تەنیایی ڕوویداوە، بەهۆی دیارنەمانی هاوسەرەکەی و نەنووسینی نامە بۆی".

چیرۆکە دووبارە داڕێژراوەکە:

(لە شوێنێکی ڕۆژئاوای ناوەڕاستدا، ئەمڕۆ بەدوای چەند هەواڵێکی کارەساتئامێزدا چووم: باوکێك بەمەبەستی یارمەتیدان و ژیاندنی هاوسەرو سێ کچە بچووکەکەی، بەدوای کاردا دەگەڕێ.

باوكو هاوسەره لاوەكە، ويلفريدهايدا، دارتاشێكی بێ كارە، بەرپرسـانی پـۆليس بەدوايدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی پێی ڕابگەیەنن كـه غلیـدا هایـدا-ی خێزانەكـەی شـەوی ڕابردوو له ماڵی خۆیدا لـه ٤٢٣- شـەقامی ریبـا، هـەر سـێ كچـەكەی خنكانـدوەوەو دواتريش خۆی كوشتووه.

ئەم بەیانییە لەگەڵ كردنەوەی دۆسیەی لێكۆڵینەوەدا، پۆلیس گەیشته قەناعەتی ئەوەی خاتوو هایدا بەهۆی تەنیایی دووچاری بێئومێدی بۆتەوە. ناوبراو تێبینییەكی بۆ دایكی – خـاتو سیلڤیا بـریمن بـەجێ هێشـتووه تیایـدا هـاتووه: "مایـەی داخـەو ویلفرید منداڵی هەبێ بەڵام له كاتی سەفەركردنیدا نەتوانێ تەنانەت كارتێكیشیان بـۆ بنێرێ".

دووایین هـەواڵ سـەبارەت بـە بـاوكی گـەڕاو بـەدوای كـاردا سـێ هەفتـە لەمەوبـەر گەیشـتۆتە مـاڵ، لـەوێوە نووسـیبووی لـە ڕێگـەی ئەنـدیانا پـولیس و سـبینگ فیلـدو شیكاغۆو سانت لويسەوە بەرەو تكساس كەوتۆتەڕێ.

تەرمی منداڵە خنكێنراوەكان: ڕۆبرت (چوارساڵ)، ڕۆس (دوو ساڵ)، هازل (چـوار مانگ) لەلایـەن خـاتوو بریمنـەوە دۆزراونەتـەوە كاتێك بـە مەبەسـتی سـەردان ڕووی كردۆتە شوێنەكەو له نزیك ئەوانیشەوە تەرمی خـانوو هایـدا كـەوتبوو، وەك دیـاریش بوو تەنافی جل هەڵخستنی بۆ خنكاندنی كچەكانی و خۆشی بەكارهێنابوو).

ت- چیرۆكی هەمەلایەن Comprehensive Lead

ئەو نووسەرەی ئەركی دووبارە داڕشتنەوەی چیرۆكی هەواڵیی پـێ دەسپێردرێ، پێویستە ئاگاداری دوا هەواڵەكان بـێ، چـونكە ئەمـە گرنگییـەكی زۆری هەیـە. لـەم نموونەیـەی خـوارەوەدا نووسـەر بـە پشـت بەسـتن بـە هـزری خـۆی توانـای پێشكەشكردنی زانیـاریی زیـاتری هـەبووە، ئەگـەر كـاتیش هەبوایەو چیرۆكەكەش شایەنی ماندووبوونی زیاتر بوایە.

لەو بارەیەشەوە ڕۆژنامەوان دەتوانێ پشت بە کتێبخانەی ڕۆژنامە یاخود فەرمانگەی سەرچاوەکان ببەستێ بۆ ئەوەی زانیاریی زیاتری دەست بکەوێ.

چیرۆکە بنەڕەتییەکە:

(فیرجیل ماینەر ۱۷ساڵ)، کوڕی شارلتۆن ماینەر "۳۰٦ – شەقامی کوتز"، دوێنێ لە پێشبڕکێی خوێندنەوەی وتاری هەڕەمەکییەکاندا کە بۆ خوێندکارانی خوێندنگە دواناوەندیەکانی ویلایەت ڕێکخرابوو، پلەی یەکەمی وەدەستهێنا، شایەنی باسە لە پێشبڕکێکەدا ۱۱ وتاربێژی دیکە بەشداریبووبوون و لە هۆڵی شارەوانی بەڕێوەچوو.

لەجیاتی خوێندنگا خۆجێییەکان، فیرجیل باسی لە بابەتی (بێ لایەنی کرد)، بۆ هەر پێشبڕکێکەرێکیش ۳۰ خولەك بۆ خۆ ئامادەکردن و ۱۰ خولەکیش بۆ قسەکردن تەرخان کرابوو. ناوبژیوانانیش .....)

چیرۆکە دووبارە داڕێژراوەکە:

(بۆ جاری دووەم لە ماوەی پێنج ساڵدا، دواناوەندی میلتۆن پلەی یەکەم لە پێشبڕکێی وتارخوێندنەوەی هەڕەمەکیی ساڵانەی دواناوەندییەکاندا وەدەست دێنێ، ئەوەبوو دوێنێ ئێوارە ڕاگەیەنرا کە فیرجیل ماینەر لەو پێشبڕکێیەدا کە لە هۆڵی شارەوانی بەڕێوەچوو پلەی یەکەمی وەدەستهێناوە).

لەماوەی سێ ساڵی ڕابردوودا، لیلاند ویست، خوێندکار لە کۆلیژی بوستەر لەو پێشبڕکێیەدا سەرکەوت کە لە لینکولن ئەنجام درا، وەك ڕێکەوتێکی سەرنج ڕاکێش هەردوو خوێندکار سەبارەت بە یەك بابەت وتاریان خوێندەوە کە (بێ لایەنی) بوو.

فیرجیل تەمەنی ۱۷ ساڵەو کوڕی شارلتۆن ماینەر – ۳۸٦ شەقامی کوتزەو لە قۆناغی خوێندنی دواناوەندیدایە.

بە گوێرەی یاسای پێشبڕکێکە، هەریەکێ: ماوەی ٣٠ خولەکی پێ دەبەخشرێ بۆ خۆ ئامادە کردن، بۆ ئەوەی دواتر ١٠ خولەك وتارێك بخوێنێتەوە. لەو ڕێو ڕەسمەدا (١١وتاربێژ بەشداربوون، ناوبژیوانانیش......).

ج- چیرۆکە تێکهەڵکێشراوەکان Combined Story

ئەم چیرۆکە هەواڵییەی خوارەوە ئەوە دەردەخات کە چۆن ئەو نووسەرەی ئەرکی داڕشتنەوەی پێ سپێردراوە دەتوانێ دوو چیرۆکە هەواڵ تێکەڵ بکاتو بیانکات بەیەك چیرۆك.

چیرۆکە بنەڕەتییەکە:

(دوێنێ کاتژمێر ٦,٥ ی ئێوارە ئەدگار لویسی تەمەن ٣٣ ساڵ - ١٣٠١ شەقامی شێرمان - کە سەرقاڵی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلەکەی بوو، پەپوولەیەك خۆی بە دەموچاویدا کێشا، لە ئەنجامیشدا ناوبراو کۆنترۆڵی لەدەست داو خۆی بەشوێنێکی تایبەت بە ئاگر کوژاندنەوەدا کێشا، لە گۆشەی باکوری ڕوژئاوای دووڕیانی هەردوو شەقامی سمبسۆنو میتشیگان، دواتر لویس گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەی شارو بەسووکی بریندار بووبوو.

لە ئەنجامی ڕووداوێکی هاتووچۆدا کە کاتژمێر حەوتی ئێوارەی دوێنێ ڕوویدا، بەهۆی شکانی دوو پەراسووی، سیلفستر فینجەری تەمەن ٢٧ ساڵ - ١٤٢٨ شەقامی گروڤ، گوازرایەوە بۆ نەخۆشخانەی شار، فینجەر سەرقاڵی لادانی ئەو مێروانە بووە کە بە قاچیدا هەڵشاخابوون، دواتر لە گۆشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی دووڕیانی هەردوو شەقامی میتشیگانو سەنترال، ئۆتۆمبێلەکەی بەر عەمودێکی تەلەفۆن کەوتووە".

چیرۆکی تێکهەڵکێش:

"دوێنێ ئێوارە لە میلتۆن چەند زیندەوەرێك بوونە هۆی دوو ڕووداوی هاتوچۆ، ئەو مێروانەی بە قاچی شوفێرێکدا هەڵشاخابوون بوونە مایەی ڕووداوێکی بەریەك کەوتن، لە ئەنجامیشداو بە هۆی شکانی دوو پەراسوویەوە، شۆفێرەکە گوێزرایەوە نەخۆشخانە. لە ڕووداوی دووەمیشدا پەپوولەیەك بەر دەموچاوی شوفێرێك کەوتو بووە هۆی لەدەستدانی کۆنترۆڵی ئۆتۆمبێلەکە، ئەو کەسەش کە لە ڕووداوەکەدا بریندار بوو......".

ح- گۆشەی ناوخۆیی Local Angle

ئەو ڕۆژنامەوانەی ئەرکی دارشتنەوەی چیرۆکی پێ دەسپێردرێ‌و جگە لەوەی ڕۆژنامە دەرەکییەکان‌و ڕاپۆرتی فەرمی‌و بەڵگەنامەو بابەتی ئاژانسە ڕۆژنامەوانیەکان‌و شتی تری لەو بابەتە دەخوێنێتەوە، دەبێ بە دوای ڕەهەندی ناوخۆیی چیرۆکدا بگەڕێ، بۆ نموونە:

چیرۆکە بنەڕەتییەکە:

ڕۆژنامەی بیۆریا

بڕیارە ڕۆژی پێنج شەممەی داهاتوو لە کۆبوونەوەیەکدا کە نوێنەرانی هەشت بنکەی سەرەکی‌و ژمارەیەك شار بەشداری تیادا دەکەن، بانگێشت بۆ ئەندامێتی بەفراوان لە ڕێکخراوی لیوبارد ئورو بکرێ.

ئامانجی هەڵمەتەکەش بریتی دەبێ لە زیادکردنی ژمارەی بنکەکان بۆ ٢٥ بنکەو ژمارەی ئەندامانیش بۆ ٢٠٠٠ ئەندام، بەپێی لێدوانێکی س. کاینلاینی سەرکردەی خۆجێیش کە بانگەشەی بۆ سازکردنی ئەو کۆبوونەوەیە کرد، ئەمە دەبێ بەر لە یەکی تەمموز ئەنجام بدرێ.

ئەو شارو شاندانەش کە لە کۆبوونەوەی پێنج شەممەدا ئامادە دەبن ئەمانەن: واین، لویك، دانفیل، کریشنون، کایرو، ریچارد یانز، لوبل، وانستۆن، ماك نایل، ئورورا، لایمان، سپرینگ فیلد، ئیلفین، موس، بلومینگتن، کاین لاین"

ئەو چیرۆکەی داڕێژراوەتەوە: ڕۆژنامەی فریبۆرت "لویل وانستۆن — ٣٤ شەقامی بوشنیل بلاس— ی سەرۆکی خۆجێی ڕێکخراوی لیبارد ئورورا، ڕۆژی پێنج شەممەی داهاتوو بەشداری کۆبوونەوەیەك دەکات لە بیوریا، بە مەبەستی یارمەتیدان لە دانانی پلانێك بۆ هەڵمەتی ئەندامێتی بەرفراوان.

لەو کۆبوونەوەیەشدا کە کانی لاین—ی سەرکردەی خۆجێی ڕێکخراو لە بیوریا بانگەشەی بۆ کرد، نوێنەرانی هەشت لقی سەرەکی ڕێکخراو لە ویلایەت بەشدار دەبن. مەبەستی بنەڕەتیی هەڵمەتەکە زیادکردنی ژمارەی ئەندامانە بۆ ٢٠٠٠ کەس و ژمارەی لقەکانە بۆ ٢٥٠، ئەو شارانەش کە لە کۆبوونەوەی پێنج شەممەی داهاتوودا ئامادە دەبن بریتین لە .....".

# مانابەخشین بە هەواڵ
# Giving It Substance

**یەکەم: تەواوکردنی ڕاپۆرتی هەواڵیی**

**١-باگراوندی ڕووداوەکان**

**٢-ڕاپۆرتی شایەتحاڵەکان**

**٣-هەواڵە بەدواهاتووەکان**

**٤-بەخشینی مۆرکی ناوخۆیی**

**٥-لای تر**

**دووەم: شرۆڤەکارییەکان**

**١-هۆکارو پاڵنەرەکان**

**٢-گرنگیی**

**٣-شیکردنەوە**

**٤-بەراوردکارییەکان**

**٥-پێشبینییەکان**

**سێیەم:**

**١-پوختەکان**

**٢-ڕاپۆرتی گشتی**

**٣-گەڕان و پشکنینەکان**

**٤-کردەوە سەرنج ڕاکێشەکان**

**٥-هەڵوێستەکان**

ڕۆژنامەوانە پسپۆڕەکان، ئەوانەی خاوەنی کەسایەتییەکی بەرچاون، لە ماوەیەکی کەمدا دەبن بە شارەزای ناسراو، ئەوانە تەنیا بە نووسین بۆ ڕۆژنامە ناسراوەکان ناوەستن، بەڵکو بۆ گۆڤارو کتێبیش دەنووسن، چونکە ئاستی شارەزاییان ڕێگەیان پێدەدات مانا بە ڕووداوەکان ببەخشن، لەوەش زیاتر لە بوارەکانیاندا دەبن بەڕەخنەگرو لە توانایاندا دەبێ ڕێنمایی و هۆشداری ئاراستەی سەرکردە سیاسییەکان‌و سەرۆکی دەوڵەتانیش بکەن، لەوانەشە کاریگەرییەکی بەهێزیان هەبێ بۆ سەر ڕای گشتی.

سەرکەوتنی ڕۆژنامەوانی داهاتووش، ئەزموونی پێشوەخت دیاری دەکات. هیچ کەسێك نەخراوەتە لوتکەی ناسراوی هەزموون بەبێ ئەوەی بە تەواوی شارەزای کارەکەی نەبووبێ‌و دابونەریت‌و هەڵوێستەکانیش فێر نەبووبێ. ڕووماڵکردنی هەواڵیی ناوخۆش یەکەم‌و گونجاوترین دەرفەت بۆ پێشخستنی هەندێك سیفەتی سەرەکی دەرەخسێنێ لەوانە:

هەمەلایەنی، وردبینی، زیرەکی، شارەزایی‌و فرتوفێڵ‌و شتی تر.

هەرکەسێکیش لە ئایندەدا نیازی بە ناوبانگی‌و سامانی هەبێ، ئینجا چ وەك نووسەرێکی شرۆڤەکار (Interpretative Reporter) دەبێ لە تەواوی ئەو چوارچێوەیەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ کە بە هەواڵیی ڕاستەوخۆ (باوەڕپێکراو Straight News) ناوزەد دەکرێ‌و بتوانێ بەشێوازێکی بابەتیانە بینووسێ، جگە لەوە بایەخ بە هەموو شتێك بدات کە بە پێویست دەزانرێ‌و لێی بکۆڵێتەوە، دواتر شتێك ئەنجام بدات لەوە زیاتر بێ کە داوا کراوە، دەبێ بشزانین هەوڵ‌و تێکۆشان سەرچاوەو بناغەی سەرکەوتنن.

نووسەرێك کە ڕاستەوخۆ (First - hand) مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا دەکات کە هەواڵ دروست دەکەن، بێگومان وەکو شرۆڤەکار (Interpreter) و مێژوونووس (Chronicler) بناغە بۆ ئایندە دادەڕێژێ، لە ڕێگەی خۆڕاهێنان لەسەر سپاردنی هەر ئەرکێك پێی بۆ ئەوەی بەم جۆرە لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات:

– چی ڕوویداوە؟ واتە بەکردەیی و بە شێوەیەکی دروست چی ڕوویداوە – چیرۆکی تەواوی ڕووداوەکە نەوەك تەنیا دەرەنجامی زنجیرەیەك ڕووداو.

– لەبەرچی (یان چۆن) ڕوویدا؟ واتە ڕوونکردنەوەو شیکردنەوە چییە؟

– ئەوەی ڕوویداوە مانای چییە؟ واتە چۆن دەکرێ ڕووداوەکە شی بکرێتەوە؟

– داهاتوو چییە؟ لەژێر ڕۆشنایی هەواڵەکانی ئەمڕۆدا، چاوەڕێ دەکرێ سبەینێ چ ڕووبدات؟

– چ شتێك لە ژێرەوە هەیە؟ ئەو ئاراستەو ئایدۆلۆژیاو هەڵوێستانە چین کە لە پێناوی بەخشینی ماناو مەغزایەك بە هەواڵ، ڕۆژنامەوان بەهەندیان هەڵبگرێ؟

# یەکەم: تەواوکردنی ڕاپۆرتی هەواڵیی
# Completing the Account

## ١- باگراوندی ڕووداوەکان Factual Background

کە ڕووداوێکی گرنگو گەورە دەقەومێ، گەورەیی و زۆری زانیارییە بەردەستەکانو کەمی کاتو ڕووپێوەکان وا دەکەن چیرۆکە هەواڵییە سەرەتاییەکان کە ڕومالی ئەو ڕووداوە دەکەن کە لەسەر شێوازی هەواڵیی ڕاستەوخۆ بنو بەشێوازێکی تەقلیدیانە نووسرابنەوەو شرۆڤەکردنی ڕووداوەکەش بۆ چاپی داهاتوو یان ڕۆژی دواتر دوا بخرێ. ئەگەر نووسەر شارەزایی و تێگەیشتنی گونجاوی بۆ ڕووداوەکانی پێشوتر هەبێ کە پەیوەندییان بەو ڕووداوەوە هەیە، ئەو وەختە چیرۆکەکە گرنگی زیاتری دەبێو دەوڵەمەندیشی پێوە دیار دەبێ.

گومانیش نییە لەوەی ڕۆژنامەکان سەبارەت بە ئاستی سوودوەرگرتن لە ڕووداوەکە دەکەونە پێشبڕکێ، بۆیە ئەو ڕۆژنامەیەی زوو دەردەکرێ دەتوانێ پێش ئەوانی تر چیرۆکی یەکەم بلاو بکاتەوە، بەلام ڕۆژنامەی دیکەش دەبێ توانایان هەبێ، ڕاپۆرتی دەوڵەمەندو دوورودرێژتر ئامادە بکەن.

## ٢-ڕاپۆرتی شایەتحاڵەكان Eyewitness Accounts

وەك باوە، لە كاتی تەواوبوونی چیرۆكە هەواڵییە فەرمییەكاندا داوا لە قوربانیانی كارەساتەكە (پێكدادانی شەمەندەفەر، لافاو، ئاگر كەوتنەوە) دەكرێ كە باس لە ئەزموونە كەسییەكانیان بكەن. لە زۆربەی حاڵەتەكانیشدا ئەو ڕاپۆرتانە وەك ئەوەوان یەكێك شتێك بۆ یەكێكی دیكە بنووسێ، بەزۆریش دەربڕینی وەك (وەك چۆن بۆی گێڕاینەوە) یان (وەك وتی) بەكار دەهێنرێن.

خودی پەیامنێرانیش ڕاپۆرتی شایەتحاڵەكان دەربارەی ئەو دیمەنە گرنگانە دەنووسن كە تێبینیان كردووە، هەواڵی لەو جۆرەش دەبێ لە ڕاپۆرتە هەواڵییە ڕاستەوخۆكان فەرمیتر نەبن، بە زۆریش وێنەی قسەیی (صور كلامية)بۆ ڕووداوەكە دابین بكرێ.

وێنە –بە وێنە جووڵاوەكانیشەوە– نەیتوانیوە وەسفكردنی زمانەوانیی نووسراو كەمبایەخ بكات و بیگەنێتە ڕادەی لەناوچوون، لە ئاییندەشدا چاوەڕێ ناكرێ بتوانێ ئەمە بكات، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەو ڕاستییە دەردەخات كە وێنەگران هەموو كاتێك لەو ڕووداوە هەواڵیانە ئامادەبوونیان نیە كە تیایاندا پێویست دەكات وەڵامی پرسیارێكی وەك "ڕاستی ئەوەی ڕوویداوە چیە؟" بدەنەوەو ڕاپۆرتێكی هەواڵیی تەواویش دەربارەی ڕووداوەكە بخەنە ڕوو.

بەرلەوەی پەیامنێر بتوانێ بە چاكی ڕوونكردنەوە پێشكەش بكات و دەست بە شرۆڤەكردن بكات، دەبێ توانای تێبینی و چاودێریكردنی هەبێ. چاودێریكردن (تێبینی كردن observation)ی ورد مانای تێبینی كردنی ئەو شتانەیە كە چاودێری كەم ئەزموون و ڕانەهێنراو دەركیان پێ ناكات، ئەو وشە بیانییەش كە ژمارەیەك سیفەت دەگرێتەوە پێویست و بنەڕەتی نییە، چونكە بەلای خوێنەرەوە ئەوە باشترە كە نووسەر بە وشەی ناسراوو ئاسایی دەینووسێ و شرۆڤەی دەكات. بۆیە پێویستە نووسەر لە بەكارهێنانی سیفەتە جۆری (نوعی)یە نەناسراوەكانی وەك

(ڕێك) و (نەرم) خۆی دوور ڕابگرێ، جگە لەوە شێوازەکانی دەربڕین و ئاماژە مێژوویی و ئەدەبییەکان و هی تریش تێگەیشتنیان ئاسان بن.

لە کاتی هەڵبژاردنی ئەو چیرۆکانەی دەگێڕدرێنەوەو ئەو کەسایەتیانەش کە وەسف دەکرێن، دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە بایەخداربێت یان نمونەیی (ڕەسەن Typical) سەبارەت بە هەڵوێستێکی گشتیی، ئەگینا دوور نییە ڕەنگدانەوەیەکی شێوێنراوی لێ بکەوێتەوە، ئەو حاڵەتە نمونەییەش کە لەوانەیە ڕووبەڕووی شتێکی لەو جۆرە ببێتەوە گەلێك جۆری هەیە لەوانە: دارمانی تونێلێك یان ڕوودانی لافاو یاخود هەر کارەساتێکی لەو جۆرە، لەو جۆرە بارودۆخانەشدا بە زۆری پەیامنێر لە شوێنی ڕووداوەکە دەبێ و هاوشانی کرێکارانی فریاکەوتن دەبێت و هەوڵی وەسفکردنی کاردانەوەی قوربانیان و خەڵکانی دیکەش دەدات بە جۆرێك خوێنەر بتوانێ هەست بە ڕووداوەکە بکات. لێرەوە پەیامنێر دەبێ بزانێ گریانی تەنیا ئافرەتێك مانای دروستبوونی حاڵەتێکی هیسترییایی نییە، خوێنەریش پێویستە پشت بە ڕاستگۆیی پەیامنێر ببەستێ.

بوونی جیاوازی لە نێوان دیدو بۆچوونی ناسراوو باشترین پەیامنێریشدا مەسەلەیەکی حەتمیە.

کارل لند ستۆرم کە بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ سەرنووسەری ڕۆژنامەی Times بووەو لە هارتفۆرد دەرچووەو بە هاوکاری لەگەڵ چەند نووسەرێکی تردا کتێبێکی لە ژێر ناونیشانی (ڕۆژنامەی پەرپووتی ئەمریکی The Fading American News papers) دا نووسیوە، باسی لە مەترسی ڕێگەدان بە پەیامنێران کردووە لەوەی هەوڵ بدەن ببن بە شرۆڤەکار، نموونەیەکیشی دەربارەی بوونی جیاوازیەکی توند لە نێوان ئەو ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانیانەدا پێشکەش کردووە کە ڕووماڵی ئەو کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەیان کردووە کە دکتۆر ئۆتۆجۆن دوای ڕاکردنی لە ڕۆژئاوا بەرەو ئەڵمانیای ڕۆژهەلات لە ساڵی ١٩٥٤دا ئەنجامی دان، پەیامنێری ئاسۆشێتد پرێس نووسیویەتی:

(( سەرەتا بەتووڕییەوە قسەی کرد، دواتر بەپەلەو خۆی لەترسی ساتەیەکەمەکان ڕزگار کرد و ئاسایی بووەوە، ڕوومەتە سورەکانی دیمەنی نموونەیی بوون بۆ تەندروستی ئەڵمانی، بەخۆشحاڵییەکی زۆریشەوە گوێی لەدەنگە هێمنەکەی دەبوو، ئەمە وێڕای چۆنیەتی کاردانەوە بەرامبەر بەو هەست و سۆزەی کەلە قسەکانیدا بەدیدەکرا، وەڵام و تێبینی زۆر گونجاویشی خستنە ڕوو بەجۆرێك بوونەمایەی دەستخۆشیی و پێکەنین، بەڵام ئەو تێبینیانەی بەزمانی ئەڵمانی بایەخ و گرنگیان هەبوو و لەکاتی وەرگێڕانیاندا برێکی زۆری تامۆژێی خۆیان لەدەستدا. تەواوی دەستخۆشیکردنەکەش لەلایەن ڕۆژنامەگەریی شیوعیەوە نەبوو).

سەبارەت بەهەمان کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە پەیامنێری یونایتد پرێس نوسیویەتی:

(بەیاننامەی کۆنگرە ڕۆژنامەوانیی‌یەکەی خۆی بەتوڕەیی و بەپەلە خوێندەوە، بەشی زۆریشی لەسەر شێوازی ئەو دانپیادانانە بوو کەقوربانیانی پاکتاوکردن لەبەردەم دادگاکاندا دەیانخەنە ڕوو، بەڵگەیەکیشی سەبارەت بە شێوازەکانی شوشتنەوەی مێشك لەلایەن شیوعییەکانەوە پێشکەش کرد، دەموچاوێکی وشکی هەبوو و بەدرێژایی کۆنگرەکەش توڕیی پێیەوە دیار بوو و هیچ زەردەخەنەیەکیش نەیگرت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێك لە دید و بۆچوونەکانی بوونە مایەی خۆشحاڵی بەشێکی ڕۆژنامەوانان).

مەحاڵە بتوانیت بیانوو بۆ گرنگیی هەوڵی وەسفکردنی هەڵوێستی دکتۆر جۆن بهێنیتەوە دوای ئەو هەڵسوکەوتە سەرنج ڕاکێشەی نواندنی، هیچ تۆمارێکی تەواویش نیە کە هەموو دەربڕینەکانی دکتۆر جۆن ـی تێدا بێ و بەکەڵکی ئەوەبێ وەکو ئاماژەیەك بۆ هەڵسوکەوتەکەی بیخەیتە بەردەمی خوێنەران. وەك دیاریشە لایەنی کەم یەکێك لەو ڕۆژنامەوانانەی ئامادەی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە بوون، پەیامنێرێکی چالاك و لێزان نەبووە، ئەم نموونەیەش لەبەهاو پێویستی ڕیومالکردنی شرۆڤەکاریانەی هەواڵیی کەم ناکاتەوە بەقەدەر ئەوەی ئەو ڕاستیە دووپات

دەکاتەوە کە ڕۆژنامەوانان کاتێك بابەتێك (دەنووسن یان ڕوومـاڵی ڕووداوێـك دەکـەن دەبێ خاوەنی خوڕەوشتێکی بەرز بن.

## ٣- هەواڵە بەدواهاتووەکان (Sidebars)

کەشـتێکی گـرنگ ڕوودەدات ، بەمەبەسـتی تـەواوکردنی ڕاپـۆرتی سـەرەکیی پـەیامنێران بـەزۆریی هەواڵـە بـەدواهاتووەکان بـەکاردێنن (هەواڵـە بـەدواهاتووەکان ئەوانەن کەبەدوای هـەواڵیی سـەرەکیدا دێـن وپەیوەنـدیان پێیـەوە هەیـە)، هـەواڵیی بەدواهاتووش مامەڵە لەگەڵ هەموو لایەنەکانی چیرۆك — ڕووداو دا دەکات و دەکرێ تێکـەڵی ڕاپـۆرتی سـەرەکیی بکـرێ، بـەڵام مەترسـیش هەیـە ئەمـە ببێتـە مایـەی درێژدادڕی یـان قوربانیـدان بەهەنـدێك وردەکـاری، کاتێـك ئـەو باڵەخانەیـە تەقیـەوە کەنوسـینگەکانی شـیکاغۆ — لـوب دەگرێتـەخۆی لـەنێو هەواڵـە بەدواهاتووەکانـدا کەلەگەڵ چیرۆکی سەرەکیی بڵاوکرانەوە ئەمانەی خوارەوە هەبوون:

– پەلە کرا لەدابینکردنی ١٠٥,٠٠٠پێی چوارگۆشە لە شووشە بۆ قەرەبووکردنەوە ئەو پەنجەرانەی شکابوون.

– پشکنینی ڕێنمـایی و ڕێوشـوێنەکانی دزەنـەکردنی گـاز کـە پێشـبینی دەکـرێ هۆکاری تەقینەوەکە بووبێ.

– وەسفکردنی ئەوانەی لەبواری شوشەکاریدا کاردەکەن لەناوچەکەدا.

– ئەو سیستمەی پۆلیس بۆ وەرگرتنی کرێکارانی داناوە لەناوچەکەدا.

– ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی کرێکارانی پاککردنەوەی پەنجەرە شووشەییەکان، چونکە هیچیان نەماون پێویستیان بەپاککردنەوە هەبێ.

– ژمارەیەك ڕاپۆرتی شایەتحاڵەکان.

– ڕاکردنی ئەو کرێکارەی لەتاوەرەکە کاردەکات.

– ئەو ڕێنماییانەی پەیوەندییانەی بەچۆنیەتی چوون بۆ ناوچەکەوە هەیە.

- چالاکییەکانی خاچی سوور.
- لیستی باڵەخانەکانی دیکە کە پەنجەرەکانیان شکاون.

لەم هەواڵە بەدواهاتووانەدا خوێنەران وەڵامی چەندین پرسیاریان دەست دەکەوێ، ئەوانەی لەکاتی خوێندنەوەی چیرۆکی هەواڵیی سەرەکیدا دەپەڕنە مێشکیان. شێوازی ڕەچاوکراویش بریتیە لەخستنە ڕووی ئەو پرسیارەی کەچاوەڕێ دەکرێ لەمزری خوێنەردا هەبێ، دواتر پێشکەشکردنی زانیاریی پێویست بۆ پێکهێنانی و ئامادەکردنی وەڵام.

کاتێکیش هەواڵەکان پەیوەندییان بەڕووداوێکی دیار و ئاشکراوە هەبێ، چەند پەیامنێرێك ڕادەسپێردرێن بەوەی ڕووداوەکە لەهەموو گۆشەکانییەوە ڕوومالبکەن. بۆ نموونە، لەوانەیە پەیامنێرێکی ژن ڕاسپێردرێ بۆئەوەی لەنزیك هاوسەری ئەو کەسایەتییە ناسراوەوەو بێ کەبەمیوانی هاتووە، لەهەمان کاتدا لەوانەیە پەیامنێرێکی دیکە گرنگی بەجەماوەر بدات بۆئەوەی قەبارە و جۆرەکەی بزانێ و لەنێوانیشیاندا بەدوای کەسایەتی دیار و ڕووداوی نائاسییدا بگەڕێ. دوورنییە ئەرکی چاودێرێکردنی هەڵسوکەوتی پۆلیس و ئەفسەر و پیاوانی ئاسایشی نهێنی بەپەیامنێری سێیەم و ئەرکی ئەنجامدانی دیمانەی خێرا لەگەڵ میوان و خانەخوێکان بەپەیامنێری چوارەم بسپێردرێ. لەوانەیە بارودۆخەکە پێویستی بەپەیامنێرێکی دیکەش هەبێ کەپێویست ناکات لەشوێنی ڕووداوەکەدا بێ، بەڵکو ئەرکەکەی بریتی دەبێ لەبەراوردکردنی ئەو بۆنەیە لەگەڵ بۆنەی تری هاوشێوەدا کە لەڕابردوودا لێرە یان لەشوێنی تر بونیان هەبوو بێ. هەندێك لەو زانیارییانەش کەتیمی ڕوومالکردنی هەواڵیی دەستیان دەکەوێ، دەکرێ ئەو نووسەرەی چیرۆکی هەواڵیی سەرەکیی پەیوەندیدار بەڕووداوەکەوە دەنووسێت، بەکاریان بهێنێ، بەلام هەموو پەیامنێرێك بەشی نووسینی چیرۆکێکی هەواڵیی سەربەخۆ، زانیاریی پێویستی لادەمێنێ.

## ٤- بەخشینی مۆركی ناوخۆیی Localization

ئاسەوارەكانی هەندێك ڕووداوی هەواڵیی لەدوورەوە هەستیان پێ دەكرێ، بەبێ باسكردنی دەنگدانەوە و ئاسەوارە بەدواهاتووەكانیش، چیرۆكی ڕەسەن بەناتەواوی دەمێنێتەوە، بۆ نموونە، هەركاتێك سەرۆكی ئەمریكا یان هەر بەرپرسێكی گەورەی حكومەت، بەیاننامەیەكی گرنگ ڕابگەیەنن، بێگومان لە كاپیتەل هیل دەنگدانەوەی دەبێ و بەرپرسانی كۆنگریس دەست دەكەن بە لادان یان گۆڕینی شێوازە كۆنەكان و شێوازی تازەیان لەجێگادا دادەنێن. بازاڕە بازرگانییەكان لەوانەیە بكەونە ژێر كاریگەریی تەنیا پڕوپاگەندەیەك، بڕیاری دادگایی باڵاش لەوانەیە كاربكاتە سەر ئەركەكانی حكومەت و ڕێو شوێنە دادوەرییەكان لەویلایەتە گەورەكاندا.

لەهەموو ئەو حاڵەتانە و هی تری هاوشێوەشدا خوێنەر دەیەوێ بزانێ : كاریگەری ئەمە بۆسەر من چی دەبێ؟

ئەمەش ئەو دیدگایەیەكە دەبێ پەیامنێر بەمەبەستی نزیككردنەوەی ڕووداو و ڕووماڵكردنی بەكاری بهێنێ، بەو گیانەشەوە ڕۆژنامەی (Review) كەلە ئیڤانستۆن دەردەچێ ناوەندی خەرجییەكانی هەموو پیا و ژن و منداڵێكی بەژمارە لەشاری ئیلیانوس لەبودجەی تازەی فیدراڵی دیاریكردووە. لەهەنگاوێكی هاوشێوەشدا، دوای ئەوەی دادگای باڵای ئەمریكی پشتگیری لەیاسا شینەكان كرد كەلەهەندێك و یلایەتەكانی ڕۆژهەڵاتدا دەكران، نوسینگەی یونایتدپرێسی نێودەوڵەتی لەتوبیكا لیستێكی بەو یاسا هاوشێوانە دەركرد كەتائێستا لەكەنساس كاریان پێدەكرێ. ڕۆژنامەی (Baltimore sun) یش بۆئەوەی ڕوونی بكاتەوە چۆن بڕیاری دادگای باڵا كەپەیوەندی بەسانسۆر لەسەر وێنە جوڵاوەكانەوە هەیە كاردەكاتە سەر بالتیمۆر و میریلاند، چیرۆكێكی هاوشێوەی بەكارهێناوە.

كۆمەڵێك ڕۆژنامەی دیكەش بۆئەوەی بتوانن بەوردی ئەوكاتە دیاربكەن كەبەشی كۆمەكی ناوخۆیی خەڵوز و پۆڵاو هی تر دەكات، هەندێك پرۆسەی پشكنین و

لێکۆڵینەوەیان ئەنجام داوە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر مانگرتێنێکی بەردەوام ڕوویدات و کاریکاتە سەر سەرچاوەکانی وزە.

یاسای فیدرالی تازە چۆن کاردەکاتە سەر هەندێك گرووپی دیاریکراو، ئەمە پرسیارێکە هەمیشە لەلایەن ڕۆژنامەگەریی ناوخۆییەوە پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە.

ڕۆبرت لوین – نووسەری کاروباری کرێکاران نوسیویەتی:

(( کاریگەریی بەرزبوونەوەی نرخی تازەی پۆلا بۆ سەر ئەو کەلوپەلانە چی دەبێ کەدەیانکڕین؟ نرخی پۆلای بەکارهێنراو لەبۆریەکی ئاوداکە ٣٠ گالۆن دەگرێ ٢١ سەنت بەرز دەبێتەوە، ئەمە بەگوێرەی ژمێریاری کۆمپانیای ئەرلکۆ ستیل کەئەو زیادەیە لەنرخەکاندا پیادەدەکات.

هەروەها خەمڵاندنەکانی ئەرلکۆ ئەمەی خوارەوەش دەردەخەن. خەرجییەکانی پۆلای بەکارهێنراو لەکورەی گازی ماڵاندا بەڕێژەی ٣٢سەنت بەرزدەبێتەوە، ٢٣ سەنتیش لە جلشۆرەکان و ١٦ سەنت لەجەلاییەکانەوە ١٥ سەنت لە ئامێرەکانی وشککردنەوەی جلوبەرگ و سێ دۆلار لە ئۆتۆمبێلدا. ژمارەکانی ئەرلکۆ ئەوەش دەردەخەن کەبەرزبوونەوەی نرخی یەك تەن پۆلا بەڕێژەی دوو یان سێ دۆلار زۆرنییە و کاردانەوەی ئەوتۆی نابێ. پیشەسازی ئۆتۆمبییل و هی تریش کەبەکارهێنەری سەرەکیی ئەو بەرهەمەن، ڕۆژی چوارشەممە بڕیار لەسەر ئەو زیادەیە دەدەن)).

Chicago Daily News

### ٥- لای تر The other Side

ڕوومـاڵکردنی بێلایەنانـە (ڕووی وشـك و دوور لەهـەموو دەربڕینێـك Dedpan Reporting) ی ناوەڕۆکی ڕاپۆرت یان وتار یاخود شتی تری لـەوجۆرە، تەنانـەت ئەگـەر سەرچـاوەکەی ناسـراوو بـەناوبانگیش بـێ، بـەڵام دوورنیـە هەڵخەڵتێنـەر بـێ چونکە (هەمووە یان کرۆك)ی ڕاستیەکان بەخوێنـەر نابەخشـێ، کاتێـك سەرچـاوەی هەواڵ بەرپرس نەبێ، دوورنییە خزمەتێکی نابەجێ بەجەماوەری خوێنەر ببەخشێ.

کەکەسێکی گرنگی کۆمەڵایەتیی لەیەکێکی تر دەدات، ئەمـە لـەڕووی هەواڵییـەوە گرنگی هەیە، هەواڵیی لەوجۆرەش ناکرێ فەرامۆش بکرێ، بـەڵام بەهـەرحاڵ دەکرێ چوارچێوەیەکی گونجاوتری بۆدیـاربکرێ، ئەمـە ئەگـەر دەرفـەتی دەستـەبەرکردنی وەڵام یان هەندێك زانیارییەت لەکەس — قوربانیەکە بۆ ڕێکبکەوێ.

خوێنەران دەیانەوێ کاردانەوەی ئەو کەسانە بزانن کەکەوتوونەتـە ژێرکاریگـەریی ڕووداوەکانـەوە، هـەر ڕاپـۆرتێکیش حـەزو ئارەزووەکـانی خوێنـەر تێـر نـەکات، بەناتەواوی دەمێنێتەوە.

هـەموو کێشـەیەکی گشـتیی بێگومـان لایـەنگر و دژایەتیکـەری هەیـە، ڕۆژنامـەی خـاوەن خوڕەوشـتیش خـۆی بەمینبـەرێکی گشـتیی بـۆ دەربڕینـی بیروبۆچـوونە جۆراوجۆرەکان دەزانێ، پابەندبوونیش تەنیا بەرامبەر بەو کەسـە نـابێ کـە دەیـەوێ هـزر و بۆچـوونەکانی دەریـبڕێ، بـەڵکو لەبنەڕەتـدا بەرامبـەر بەخوێنـەران دەبـێ، بەجۆرێك شارەزاییەکی تەواویان هەبێ.

کەیاسـایەکی تـازە سـەبارەت بەهـەرزەکاران دەخرێتـە گفتوگـۆوە، ڕۆژنامـە لەسەریەتی بەدوای ئەوانەدا بگەڕێ کە لێکدانەوەی گونجاویـان دەربـارەی بابەتەکـە هەیە، ئەمەش تەنیا تاکتیکێك نییە بـۆ بەدواداچوون و پشـکنین کەبـەزۆری دەبێتـە مایەی دەسگیرکردنی بیروڕای نابـەجێ، بەقـەد ئـەوەی گەڕانێکـە بـەدوای باشـترینی بۆچـوونەکاندا. پـەیامنێری خـاوەن ئـەزموون چـۆن دەتـوانێ ڕاسـتیی بابەتیانـە

پێشكەش بكات بۆئەوەی والەچیرۆكی هەواڵیی بكات ببێتە چیرۆكێكی شرۆڤەكاری؟
چۆن كولی پەیامنێر لەرۆژنامەی (Journal)لەم بارەیەوە نموونەیەك دەخاتە ڕوو:
رۆژنامەوان ئەم، نموونەیەی بەهەڵاوێردراوی نەزانیوە بەڵكو گوتوویەتی ((بەپێچەوانەوە، ئەمە دروست ئەو هەواڵانەن كەرۆژانە ئێمە لەخستنەڕووی كێشە گشتیەكاندا دەیاندەین)) دواتر گوتوویەتی (( هەستدەكەین كێشەكانی حكومەتی ناوخۆیی دروست وەك گرفتەكانی حكومەتی نەتەوەیی وان، ساڵ بەساڵ ئاڵۆزتر دەبن. بۆ ئەوەی خوێنەران شارەزاتربكرێن، شرۆڤەكاریی بۆتە پێویستیەكی ڕەها. پێم وایە ڕووماڵكردنی شرۆڤەكارییانە بۆ كێشە گشتییەكان بریتیە لەبەكارهێنانی ئەو ڕووداو و بیروبۆچوونانەی سەرچاوەكانیان كەسانێكی شارەزان)).
ئەو چیرۆكە هەواڵییەی كولی نووسیویەتی لەگەڵ ئەو تێبینیانەی لەبارەیەوە خراونەتە ڕوو:
((لەپێناوی خەرجكردنی سێ ملیۆن دۆلار بۆ چاككردنی شەقام و شۆستەكان لەسەندوی قەرزەكان، پاش نیوەڕۆی پێنج شەممە ئەنجوومەنی شارەوانی لەمیلویك بڕیاری لەسەر بودجەی شاردا كەژمارەیەكی پێوانەیی شكاند و گەیشتە ١٤٢,٥ ملیۆن دۆلار)).
ئەو بودجەیەش كەلەگەڵ بودجەی ناوچە (كەرت)دا تێكەڵكراوە، پێویستی بەباجێك هەیە كەبڕەكەی ٥٨,٢ دۆلار دەبێ لەهەر هەزار دۆلارێكدا كەدەخەملێنرێ. ئەمەش مانای زیادكردنی ٣٥ دۆلارە لەباجی هەرخاوەن ماڵێك لەمیلویك ( تێبینی : وەك دیارە لەلای خوێنەر ژمارە گشتیەكە مانایەكی ئەوتۆی نیە تائەو كاتەی نەزانێ زیادركردنی باجی تازە لەسەر خودی خۆی چی لێ دەكەوێتەوە، هەر ئەوەش وای لێكردین ژمارەی ٣٥ دۆلار دەربخەین). بەم جۆرە هەمان پرۆگرام سەبارەت بەلایەن و ڕەگەزە هەمە جۆرەكانی چیرۆكی هەواڵیی بەردەوام دەبێ)).

## دووەم: شرۆڤەکارییەکان Interpretations

گومان نییە لەوەی ئەم برگەیە ڕاست نییە کەدەڵێ (ئەوەی نایزانێ ئازارت نادات)، بەپێچەوانەوە، لەسیستەمە دیموکراسیەکاندا زۆر گرنگە هەموو کەسێك ئاگاداری گەورەترین بڕی ڕووداو و ڕاستیەکان بێ، بۆئەوەی بتوانێ بڕیاری گونجاو دەربکات و کاربکاتە سەر کێشە گشتیەکان و بەشدارییان تیادا بکات. لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانیشدا، دەستەو کۆمەڵە ڕۆژنامەگەرییەکان ئاگادارکردنەوەی زۆریان دەربارەی ساختەکاریی و شێواندنی ئەو هەواڵانە بڵاوکردەوە کەنهێنی (ئەمری واقیع) بوو بەهۆکارێك بۆ زیادبوونیان. تەنانەت لە هەندێك حاڵەتدا دڵنیابوون لەڕاستیی و دروستی شتێك کەپەیوەندی بەهەندێك بڕیار و ڕێوشیوێنی سیاسیی گرنگەوە هەبوو، پێویستی بەچەند هەفتە و مانگێك دەبوو، لەکاتی پێکانی ئامانجەکەشدا کات بەسەر دەچوو، بواری ڕێگەگرتن لەزەرەروزیانەکان، نەدەما.

لەچاوپێکەوتنێکدا کەبەم دواییانە لەگەڵ جیمس روستو-ی نووسەری بەشی سیاسیی ڕۆژنامەی (New York Times)دا ئەنجامدراوە، هاتووە. ((.. ئایندەی ڕوومالکردنی هەواڵیی دەوەستێتەوە سەر گواستنەوەی (گێڕانەوەی Telking)ئەوەی لەجیهاندا ڕوودەدات، بەشێوەیەکی ئاشکرا و ماقول؛ جیهانیش ساڵ لەدوای ساڵ ئاڵۆزتر دەبێ.

نووسینی شرۆڤەکاریی (Explanatory) ئەو بوارەیە کە تیایدا دەتوانیت سەرکەوتن زامن بکەیت، ناشتوانیت ڕووداوەکان وەك خۆیان بگوازیتەوە بەڵام دەبێ ڕوونیانبکەیتەوە و شرۆڤەیان بکەیت. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ نرخی ئەم نووسینە شرۆڤەکارییەش بدەیت ، سەرەتا لەدرێژەی چیرۆکە هەواڵیەکاندا، چونکە ناتوانیت لەیەك کاتدا داوای چیرۆکی هەواڵیی شرۆڤەکاری و کورت بکەیت.

نووسینی شرۆڤەکاریی بریتیە لە بڕیاردان و ماندووبوون و دادگایەکی عەقڵیی، لەوانەشە ئەو بڕیارە کات ناکاتێك هەڵە بێت. جگە لەوە ئەم کارە کاتی زیاتری دەوێ، ئەگەر مرۆڤ لەئەنجامی کاری ڕۆژانەدا ماندووبێت، ئەو کاتە ئامادەنابێت ئێوارە چیرۆکێکی هەواڵیی شرۆڤەکاریی گونجاو بنووسێ.

ڕۆژنامەوانیی شرۆڤەکار بریتیە لەو زوومانەی کەتیایدا هەمو ئەوشتانە دەبینیت کەئاشکرا نین، بەڵکو شوێنپەنجەوردەکانت بۆ دەخوێنێتەوە، لەهەمان دانیشتندا جۆن هایتورو نووسەری بەشی دیبلۆماسیی ئاژانسی ئاسوشیتد پرێس گوتی: (( لەنووسینی ڕاستیەکاندا بەرپرسیاریەتێکی مەترسیدار دەگرینە ئەستۆ، لەو باوەڕەدام کەدەبێ ئاسۆشیتد پرێس هەمیشە جەخت لەسەر چەند شتێکی بنەڕەتیی ودیاریکراو بکاتەوە، ئەرکی سەرەکیی ئێمە بریتیە لەگەیاندنی ڕووداو بەخەڵك، بەڵام هەستێك هەیە بەوەی ئەم ئەرکە بەس نییە)).

لیستر مارکیل، سەرنووسەری یارمەتیدەر لەڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز یەکێك بووە لەوانەی هەر لەسەرەتاوە بەرگری لەڕوومالکردنی شرۆڤەکاریی کردووە و بانگەشەی بۆکردووە، ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەو برگانەی کەلەبابەتێکیدا لەژێر ناونیشانی (حاڵەتێك لەپێناوی شرۆڤەکردندا) نووسیویەتی:

((........شرۆڤەکاریی، وەك بۆی دەچم، بریتیە لەهەستی هەرەقووڵ بەهەواڵ، ڕووداوێکی دیاریکراو دەخاتە چوارچێوەیەکی بەرفراوانتری ڕووداوەکانەوە، شرۆڤەکردن ئەو ڕەنگ و کەشو هەوایەیە کەمرۆڤ بەڕووداو (ڕاستی Fact)ی

دەبەخشێ. بەکورتی، شرۆڤەکاریی چێوە و زنجیرەیە، جگە لەوە ماناو گرنگیی و مەغزایشە.

جیاوازیەکی گەورەش لەنێوان شرۆڤەکردن و بیروڕادا هەیە، جیاکردنەوەشیان لەیەکتر گرنگیەکی زۆری هەیە، سێ ڕەگەزیش پەیوەندییان بەم باسە وە هەیە: یەکەمیان هەواڵە، دووەم شرۆڤەکردن، سێیەم بیروڕایە.

بانموونەیەك وەربگرین:

ئەگەر بڵێی سیناتۆر ماك سنگ خەریکی لێکۆڵینەوەی پاتا غۆنیایە لەخوێندنگاکاندا، ئەمەش هەواڵە، بەڵام ئەگەر ڕوونی بکەیتەوە کەسیناتۆر سینگ لەبەرچی ئەم کارە دەکات؟، ئەو کاتە ئەمە دەبێتە شرۆڤەکردن. ئەگەر ئاماژەش بەوە بکەیت کە سیناتۆر سینگ شەرمەزارە، ئەمە بیروڕایە.

شیکردنەوە بریتیە لەحوکمێکی بابەتیانە (بیر و بۆچوون – دادگاییکردنێکی عەقلییە Objective Judgment) و لەسەر بناغەی زانیاریی پێشوەختە (Background Knowldege) دەربارەی ڕووداو و هەڵسەنگاندنی سەردەگرێ، لەسەروتاریشدا بڕیار شتێکی خودیە (Subjective) و لەوانەیە هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان بگرێتە خۆی بەڵام ڕەگەزێکی دیکەی جیاوازیش هەیە کەکاریگەری سۆزدارییە (Emotional Impact).

لەلاپەڕەی بیروڕاشدا کەتایبەت دەبێ بەبیروبۆچوون و سەروتارەکان، دەبێ بیروڕاکان لەسەر ئاستی ئاینی چوارچێوەدار بکرێن، ئەمە لەکاتێکدا شرۆڤەکردن بەشێکی بنەڕەتی هەواڵەکان پێکدێنێ، ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگە و ناکرێ لەوەزیاتر جەختی لەسەر بکرێتەوە.

هیچ جیاوازیەك لەنێوان شرۆڤەکردن(Interpretation) و باگراوند (Backgraond)دا بەدی ناکەم.

بەشێکیش لەشرۆڤەکردن بێگومان بریتی دەبێ لە خستنە ڕووی هەندێك شتی کۆن، ژمارەیەك لەسەرنووسەران (باگراوند) بەشێوازێکی جیاوازدەزانن لەگەڵ

شرۆڤەکردندا، بەڵام شرۆڤەکردن زیاترە لەتەنیا ڕەگەزێکی کورتکراوە کەلەکۆتایی چیرۆکێکی هەواڵیدا (Shirttail Material) زیاد دەکرێ، بگرە جگە لەوە بریتییە لەپێشکەشکردن و خستنە ڕووی ڕووداوە هەنووکەیی و کۆنەکان کەپەیوەندیی پتەویان بەباتەکەوە هەیە، لەلایەکی دیکەوە پشکنین و تاقیکردنەوە و وردبوونەوەیە لەو ڕووداوانە.

## ١- هۆکار و پاڵنەرەکان Causes and Motives

بەدرێژایی گەڕان بەدوای ڕووداوو ڕاستیە پەیوەندیدارەکان بەهەواڵەوە، پەیامنێری شرۆڤەکار بەردەوام دەبێ لەسەر ئاراستەکردنی پرسیاری (بۆچی)، ئەو دەزانێ بڵاوکراوە فەرمییەکان و لێدوانە ڕۆژنامەوانییەکان کە بەوردی و ئاگادارییەوە ئامادەکراون لەوانەیە ببنەمایەی شاردنەوەی هۆکار و پاڵنەرەکان کەپێش ئەنجامی کۆتایی ڕووداوی هەنووکەیی کەوتووە، بەمەش لەژێر ژێرخانی سەرەوە هەڵدەکۆڵێ و گەڕان دەست پێدەکات.

لەوانەیە هەندێك جار پێشبینیکردن دروستبێ، بۆ نموونە ئەگەر سەرۆکی شارەوانی بەئاشکرا لەگەڵ ئەنجوومەنی شارەوانییدا کەوتە دەمەقاڵێ، ئەو وەختە دەست لەکارکێشانەوەی نزیك وەخت نزیکدەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار ستوننووس و ئەوانەش کەپشت بەپروپاگەندە و دەربڕینی وەك ((خەڵکی نزیك لە ...)) دەبەستن دەکەونەهەڵەوە.

یان — بۆ نموونە — ئەگەر سەرۆك و ئەنجومەنی شارەوانی دوای کۆبوونەوەیەکی گرنگ ڕاپانگەیاند کەتوانیوایانە بگەنە ڕێکەچارەیەکی گونجاو بۆ ناکۆکییەکانی نێوانیان، ئەوکاتە تەنیا پەیامنێری بێ ئەزموون بەم ڕاگەیاندنە باوەڕدەکات. دەسگیرکردنی زانیاریی دروستیش لەسەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە لەوانەیە وائاسان نەبێ، ئەمە ئەگەر مەحاڵیش نەبێ، لەوانەیە ئەنجوومەنی شارەوانی هەڕەشەی

دەرکردنی بەیاننامەیەکی ئاشکرای کردبێ کەدەبێتە هۆی ئیحراجکردنی سەرۆکی شارەوانیی، دوور نییە ڕازیش بوو بێ کەسەبارەت بەمەسەلەیەکی دیاریکراو هاوکاریی بکات بەرامبەر بەپەیمانی پێشکەشکردنی پشتگیری سیاسیی لەئایندەدا. جگە لەوە بەدوور نازانرێ شارەوانی هەندێك لەیارمەتییەکانی بۆ ژمارەیەك ئەندامانی ئەنجوومەن بکێشێتەوە، ئەگەرەکان زۆرن و ڕۆژنامەوانی بەرپرسیش دەبێ ئاگاداربێ لەپشتبەستن بەپروپاگەندە و ئەگەر و وتەکان.

جارێکیان کۆمپانیایەکی گەورە کەخاوەنی چەندین کارگەیە لەچەند شارێکی جیاوازدا، رایگەیاند کەبەنیازی داخستنی کارگەیەکە لەشاری (أ)و کارەکانیشی بۆ شاری (ب)دەگوازرێتەوە. ڕاگەیاندنەکە جگە لە داوای لێبوردن و داخی بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیا، ستایشکردنی شاری (أ) یشی گرتبووە خۆی، بەڵام ڕونیشی کردبوەوە کەکۆمپانیا پێویستی بەکەمکردنەوەی خەرجییەکان و کارکردن لەشوێنی نزیك لەسەرچاوەکانی مادەی خاو و نەکڕینی ئامێری تازەی گرانبەها هەیە.

ئەمەش ئەگەرچی شتێکی گونجاوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیامنێری خاوەن ئەزموون بۆنی مشکی کردووە (Smelled a Rat)و دەستی کردووە بەگەڕان و بەپەلە بۆی دەرکەوت کەچەند مانگێك دەبێ کۆمپانیا گرێبەندی لەگەڵ یەکێتی خۆجێیی کرێکارانی شاری (ب)دا مۆرکردووە و لەسەر کرێی کەمتر لەشاری (أ) ڕێك کەوتوون. لەبەرامبەریشدا یەکێتی کرێکارانی شاری (ب) بەگرێبەندەکە ڕازی بوون، چونکە ئەمە دەرفەتی کارکردن بۆ چەند هەزار ئەندامێکی بێکاری ئەو یەکێتیە دابین دەکات. دواتر لێکۆڵینەوەکان دەریانخست کەیەکێتی کرێکارانی شاری (أ) ئەمەیان بەخیانەتکاری وەسف کردووە و راشیان گەیاندووەکە، ئەمە بەشێکە لەهەڵمەتێك کەهەندێك لەسەرکردەکانی یەکێتی کرێکارانی نەتەوەیی بەمەبەستی زیادکردنی هێز و توانای یەکێتیەکەیان دەستیان پێکردووە.

یەکێتی شاری (ب) جەختی لەسەر شوێنکەوتووانی کردەوە بەڵام ئەوانەی لەشاری (أ)ن سەربەگرووپێکی ڕکابەرکارن لەناو یەکێتی کرێکارانی نەتەوەییدا، ئەم ڕاستیانەش بۆ تێگەیشتنی گونجاو لەڕووداوێك گرنگی خۆیان هەیە، ڕۆژنامەوانیی ئازاد بە (سەگی پاسەوانیی Watch dog) لەسەر حکومەت ناونراوە، بۆیە جگە لە پێداچوونەوە و وردبینکردن لەهەموو ئەو شتانەی کاردەکەنە سەر بەرژەوەندیی گشتیی دەبێتە پاسەوانی بەرژەوەندییە گشتیەکانیش.

## ٢- گرنگیی (واتا، مەبەست، هێما- Significance)

ئاراستەکردنی پێشنیازێك بۆ لیژنەیەك لەوانەیە مانای پەلەکردن لەدانانی یاسایەك یان نەهێشتنی خودی ئەو پێشنیازە ببەخشێ. کۆکەرەوەی هەواڵیی بەتواناش دەبێ واتا و هێمای ئەم ئاراستەکردنە بزانێ، هەروەها لەسەریەتی ئەمە بەخوێنەرانی ڕابگەیەنێ، ئەو شتە هەڵسوکەوتی لقەکانی حکومەتیش دەگرێتەوە. خوێنەران توانایان هەیە لەمەبەستی مانۆڕە پەرلەمانی و دیبلۆماسییەکان بگەن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لەلایەن کەسێکی نزیك لەخۆیانەوە ئاگادار بکرێنەوە.

کەبۆماوەیەکی دوورو درێژ تاوانبارێك بەند دەکرێ، واباوە ئاماژە بەلایەنی کەمی ئەو ماوەیە دەکرێ کەتیایدا لەبەندیخانە دەمێنێتەوە بەر لەوەی ئازادبکرێ و پەیمانی گەڕانەوەشی بۆ بەندیخانە لێ وەربگیرێ، دوای کۆتایی هاتنی ماوەی تەرخانکراویش بۆ پێشکەشکردنی پێداوچوونەوە، دەبێ لەوە ئاگاداربین کەلەوانەیە ببێت یان هەرگیز نەبێت.

ئەگەر دیپلۆماتکارێك بەشداری ئاهەنگێکی فەرمی کرد و یەکێکی دیکەشی پشتگوێ خست، دوور نیە ئەمە ئاسەواری مانا‌داری لێ بکەوێتەوە و لەوانەشە وانەبێ. لەهەندێك حاڵەتیشدا ئاستەم نییە بەشێوەیەکی بابەتییانە ئەم ئاسەوارانە ڕوونبکرێنەوە، هەندێ جاری دیکەش لەوانەیە جۆرە پێشبینیکردنێك بەپێویست

بزانرێ بەڵام بەهەرحاڵ دەبێ حیساب بۆ ئاگاداریش بکرێ. لەوبارەیەوە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (Christians Science Monitor) نووسیویەتی:

(( بڵاوکردنەوەی بەپەلەی هەواڵەکان لەڕۆژنامەکاندا بەس نییە، ئەگەر چی ماوەیەکە زۆربەی ڕۆژنامەکان تەنها بەمە وازیان هێناوە. دەبێ هەواڵەکان ڕوون بکرێنەوە، شی بکرێنەوە، شرۆڤەبکرێن تەواو بکرێنو تێکەڵی هەواڵی دیکە بکرێن. چاودێر وشارەزایان لەڕادیۆشدا ئەم ئەرکە جێبەجێدەکەن بەڵام تائێستا خەڵك داوای وشەی چاپکراودەکەن، چونکە ناتوانن بەتەواوی پشت بەوە ببەستن کە گوێبیستی دەبن.

هەواڵە هەنوکەییەکانیش ڕوەو ئاڵۆزیی زیاتر دەچن، بۆیە نوسەری ڕۆژنامەکان دەبێ پلەی شیان و پسپۆڕیی و شارەزاییان ڕوو لەزیادبوون بکات، دەبێ لەبابەتی جۆراوجۆردا تایبەتمەندبن، ئێستا کارگەیشتۆتە ڕادەی ئەوەی کەناتوانرێ ڕوماڵی هەواڵە گەورەکانی جیهان بکرێ وەك ئەوەی لەڕووماڵکردنی ڕووداوێکی ساکار و ئاساییدا دەکرێ.

نیوسەدە دەبێ جۆزیف پۆلیتەرز دەرکی بەم ڕاستیەکردووە، ئەمەش کاتێك بەرنامەی خوێندنی باڵای بواری ڕۆژنامەگەریی بۆ قوتابخانەکەی خۆی دانا، ئەم ئاراستەیەش لەئایندەدا بەهێز و چڕو پڕتر دەبێ. ڕۆژنامەوانیی هاوچەرخیش دەبێ بزانێ چۆنیەتی کارکردنی بۆمبی ئەتۆمی بۆ خوێنەری ئاسایی ڕوونبکاتەوە.

### ٣- شیکردنەوە (Analysis)

دۆکۆمێنتە دورو درێژ و ئاڵۆزەکان — بە بڕیار و یاساکانیشەوە — دەبێ تاڕادەی تێگەیشتن شی بکرێنەوە، بەزۆریش ئەرکی ڕووماڵکردنێکی بابەتیانەی وەرسکار بریتی دەبێ لەڕوونکردنەوەی ئەم شتانەی ئەمڕۆ قەدەغەن یان ڕێگەیان پێدەدرێ یان ئەوەی پێویستە بکرێ و ئەوانەش کێن کەدەکەونە ژێر کاریگەری ئەم و ئەو

شێوازەوە. زۆرجاری واش هەیە کەسی شیکەرەوە ئەو درزو ئاسەوارانە ئاشکرا دەکات کەتەنانەت یاسادانەرانیش پەیان پێ نەبردووە. ئەو وتارانەی کەسانی گرنگ دەیانخوێننەوە، بەپەلە لەلایەن ڕۆژنامەوانانەوە، شی دەکرێنەوە دواتریش ئەرکەکە دەکەوێتە ئەستۆی شارەزاو لێکۆڵەرەوان. وتاربێژ جەختی لەسەر چی کردۆتەوە، ئەو جارانەی تیایدا وتاربێژ باسی لەمەسەلەیەکی دیاریکراوکردووە، چی لاداوە و چی دوورخستۆتەوە، ئەمانە چەند شتێکن دەبێ بەوردی تێبینی بکرێن. دادگاییکردنە گرنگەکانیش دەچنە نێو پرۆسەی بەبایەخزانینیی ئاماژە و دەربڕینەکانی دەموچاو و شێوەزار و دەنگ لەکاتی خوێندنەوەی وتار و شتی تردا، جگە لەمە کاردانەوەی جەماوەریش دەچێتە نێو ئەم چوارچێوەیەوە، ئەگەرچیش زەحمەت نیە تێبینی بڕی چەپڵەلێدان و بەردەوامبوونی بکرێ، بەڵام شتی وردی نادیاریش زۆرن، کەواتە چۆنیەتی کاردانەوە جەماوەریش بەشێکی ڕووماڵکردنەیە.

زۆرجار لەپێناوی شیکردنەوەی گونجاودا، ڕوونکردنەوە بەپێویست دەزانرێ، ئەمەش زیاتر لە تاوانەکاندا بەراست دەزانرێ.

گۆڕانکاری لە ڕێژەکانی دووبارەبوونەوەی نموونەی دیاریکراو لەپێشێلکردنی یاساکاندا لەوانەیە شتێکی وەرزی بێ، لەماوەی ڕووماڵکردنیشدا لەوانەیە جەماوەری نیشتەجێی ناوچەکان بگۆڕێ، فەرمانگەکانی پۆلیسیش دەزانن کەتوانی گۆڕینی شێوازەکانی ڕووماڵکردنیان هەیە، بۆ نموونە: وەسفکردن و تۆمارکردنی ئۆتۆمبیل بەوەی شوێن بزربوون لەجیاتی ئەوەی دزرابن.

## ٤- بەراوردکارییەکان Comparisons

وەك چۆن لەسەر ژمێرییەکانی پەیوەندیدار بە تاوانەکان لەحاڵەتی بودجە گشتیی و تایبەتییەکان و سەرکەوتنی وەرزشەوانان و ئەو دەنگانەی خەڵکانی کاندیدکراو بەدەستیان دێنن و لەپرسی دیکەدا بەدی دەکرێن، خوێنەر دەیەوێ بزانێ

چۆن بەراورد لەنێوان ئێستا و ڕابردوودا دەكرێ: ئاخۆ شتێك كەمتر یان زیاترە، بەرزتر یان نزمترە، باشتر یان خراپترە؟ دەبێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بدرێنەوە لەگەڵ بەهەند هەڵگرتنی هەموو فاكتەرە كاریگەرەكان، بۆئەوەی بەراوردكارییەكە ساختەكار و هەڵەخەڵەتێنەر دەرنەچێ. بۆ نموونە، ئەوكاتە بەراوردكاری هەڵخەڵەتێنەر دەبێ كەخەرجییەكان بەوە وەسف بكرێن كەلەگەڵ ماوەیەكی دیاریكراوی ڕابردوودا ڕوویان لەزیادبوون كردووە بەبێ ڕەچاوكردنی ئەو گۆڕانكارییانەی بەسەر نرخی دۆلار و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و پێداویستیەكانیان و شتی تردا هاتوون.

دەكرێ بەرنامەی سیاسیی حزبەكان لەگەڵ یەكتر و لەگەڵ بەرنامەكانی ساڵانی ڕابردوودا بەراوردبكرێن، لەكاتی ڕووبەڕووبوونەوەی كێشەیەكی ناوخۆیی قێزەونیشدا، ڕۆژنامە و لایەنە فەرمییەكانی تر نوێنەرانی خۆیان ڕەوانەی نێو كۆمەڵگای دیكە دەكەن بۆئەوەی توێژینەوە دەربارەی ئەو هەنگاوانە بكەن كەئەوان لەپێناوی چارەسەركردنی ئەوكێشەیەدا ناویانە. كەكارەساتێكی گەورەش ڕوودەدات، لەبواری ڕۆژنامەگەرییدا وابەوە بابەتی لاوەكی (Sidebars) ئامادە بكرێن و بەزۆری لەشێوەی خشتە یان وێنەی بەیانیدا دەبن و لەڕووی هێز و توندیەوە ئەو كارەساتە لەگەڵ هی تری هاوشێوەدا بەراورد دەكەن.

بەساڵاچووان حەزیان لەئەنجامدانی بەراوردكاریی مێژووییە، زیاتر بۆئەوەی هەست بكەن كە ڕووداوێكی هەنووكەیی هاوشێوە لەگەڵ ئەو ڕووداوەی چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕوویداوە هەیە و هاتۆتەوە بیریان و هەستیش دەكەن كەپێشتر لەباردوۆخێكی هاوشێوەدا ژیاون بەتایبەتیش كەتێبینی بڵاوبوونەوەی ئەو دیاردانە دەكەن كەویستراونین وەك زیادەڕۆیی لەكڕینی شتومەك بەقیست و بەرزبوونەوەی نرخی زەوییوزار و شتی تری لەوجۆرەدا.

گومان نییە لەوەی مێژوو زۆر وانەی گرنگ فێری مرۆڤ دەكات، بەڵام مێژوو خۆی دووبارە بكاتەوە، ئەمە شتێكە لەوانەیە هەرگیز ڕوونەدات. زۆر كردەوە و ڕێوشوێنی

كۆنیش هەن وازیان لێ هێنراوە بەڵام ئێستا دیسان بەپێویست دەزانرێن لەنێوانیاندا: كاتژمێری تەوقیتكراو بۆچاوەڕێكردنی ئۆتۆمبێل و ترافیك و شەقامە یەك سایدەكان و وەستاندنی ئۆتۆمبیل لەتەنیشتی شەقامەوە، ئەمانە چەند نموونەیەكن لەیەك بواردا.

زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و خاوەنداری ئۆتۆمبیل بارودۆخێكی دیكەیان هێناوەتە ئارا كە پایەی ئەم ڕێوشوێنانەیان گێڕاوەتەوە. لەنێو زۆر لەگرووپەكاندا بزوتنەوە چاكسازیخوازەكان سەرهەڵدەدەن و كپ دەبن، یەكێك لەهۆكارەكانی سەرنەكەوتنیان كپبوونەوەی لایەنگرانیانە دوای هێنانەدی ئامانجی یەكەم. مێژووش دەریخستووە كەبەئاگایی هەمیشەیی مەرجێكی گرنگی هێنانەدی دیموكراسییە.

## ٥- پێشبینییەكان (Forecasts)

نووسینی چیرۆكی هەواڵیی بەنەفەسی (سبەینێ) زۆرجار بەجۆرە شرۆڤەكردنێك دەزانرێ. پەیامنێر دەتوانێ بەپشت بەستن بەشیكردنەوەی خۆی دەربارەی چۆنیەتی كاری ئەنجومەنی شارەوانی، پێشبینی دەرفەتی نوێی كاركردن یان پڕۆژەی دروستكردن یان چالاكی ئەمنی و شتی تری لەوجۆرە بكات، هەروەها توانای بینینی ئەو گرفتانەی هەیە كەلەئەنجامی بڕیارێكی داداگادا ڕووبەڕووی چەند گرووپێكی دیاریكراو دەبنەوە.

دابەزاندنێكی گەورە لەنرخەكاندا كە لەلایەن دامەزراوێكەوە جاڕدەدرێ، دەبێتە مایەی بەرپابوونی شەڕی نرخ لەنێوان پێشبڕكێكەراندا. جەختكردن لەسەر پیادەكردنی ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بەوەكارخستنی منداڵانەوە هەیە، لەوانەیە كاریگەریەكی ڕاستەوخۆ و بەپەلەی بۆسەر لەكارلادانی ژمارەیەكی گەورەی هەرزەكاران هەبێ.

کاتێکیش مەسەلەکە پێویستی بەپێشبینیکردنی شتێك هەبێ کەلەکاریگەری راستەوخۆو خێرای ڕووداو دوورتربێ، وەك پێشبینکردنی ئەوەی هەرزەکارانی بێکار ڕوو لەتوندوتیژی دەکەن، ئەو کاتە ڕۆژنامەوان دەبێ پشت بەبڕیاری شارەزا و نموونەیەکی مێژوویی هاوشێوە ببەستێ و لەگەیشتن بە ئەنجامەکاندا پەلە نەکات.

مردنی کەسایەتییەکی ناسراو (لەوانەیە و لەوانە نییە) ببێتە هۆی هێنانەدی ئاشتیەك لەنێوان لایەنە ناکۆکەکان یان توندبوونی ململانێ لەسەر گرتنەوەی شوێن پێگەکەیدا. پەیامنێر دەتوانێ ئەگەرەکان بەوردی دەستنیشان بکات، بەڵام دەبێ ئەوەش لەیاد نەکات کەهەندێك سەرکردە و مامۆستا بەهۆی زیادەڕۆیی لەمتمانە بەخۆکردنەوە دووچاری لەدەستدانی متمانەی جەماوەرەکانیان بوونەتەوە.

## سێیەم: دابینکردنی شتی چاوەڕوانکراو

## (Providing Perspective)

هەواڵەکان تەنیا چەند ڕووداوێك ناگرنە خۆ کە بکرێ بەناوەڕۆکێکی ڕوون و دیاریکراو بنووسرێن و وەڵامی شەش پرسیارەکەش بگرنەوە، بەڵکو بیرۆکە و ئایدیۆلۆژیا و بۆچوونە هزریەکان و هەڵوێستە دەروونیەکان و شتی تریش هەواڵن.

زۆرزانیی نییە ئەگەر واڵێکبدرێتەوە کەجیهان باشتر دەبێ لەکاتێکدا زۆربەی خوێنەرانی ڕۆژنامە هۆشیاری زیاتریان بەرامبەر بەکێشە سیاسیی و کۆمەلایەتییو ئابوورییەکان هەبێ، ئەوانەی بەبێ بوونی بنەماکانی هەواڵێکی دیاریکراو بەزۆری لەبارەیانەوە دەنووسرێ. (بابەتی هزریی) بریتیە لەشێوازێکی کۆنی ڕۆژنامەوانیی بەلام لەڕابردوودا پەرەی سەندووە و ئەو بوارانەشی گرتۆتەوە کەلە ڕابردوودا زیاتر ئەرکی شارەزاو لێکۆڵەرەوان بووە.

ڕۆبرت گراست، یاریدەدەری سەرنووسەر لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمزدا نووسیویەتی: ((بەشێکی گەورەی ڕوومالکردنی هەواڵیی کۆن بۆچارەسەرکردنی سیما دەرەکییەکان — ڕوداوە ڕاستەوخۆ و هەنووکەییەکان — تەرخان کرابوون، زۆر بەکەمیش بەدوای هۆکارەکانی ئەو ڕووداوانەدا گەڕاوە.

ناسەقامگیری ڕەگەزیی و مانگرتن لەبەندیخانەو بارودۆخە ناهەموارەكان لەگەڕەكە هەژارەكاندا – تەنانەت خودی تاوانیش – پاشكۆی كۆمەلایەتیی و ڕەگی قووڵی لەدابونەریت و بارودۆخە ئابوورییەكانی ناوچە و كۆمەڵگادا هەیە، بەلام بوونیان هەیە و شایەنی ئاشكرا كردنن، واشی بۆ دەچم كەئەمە ئەركی ڕۆژنامە بێت. بەدەستگیركردنی ئەو زانستەش دەتوانرێ چارەسەر بۆ زۆر نەخۆشی بدۆزرێتەوە كە كاریگەرییان بۆ ئێمە هەیە)).

## ١- پوختەكان (Resumes)

گۆڤار و ڕۆژنامە هەفتەییەكان و ئەو گۆڤارانەش مانگانەن و بابەتی هەڵبژێردراو بلاودەكەنەوە، هەموویان لەسالانی وێكهاتنەوە (الأنكماش) سەریان كردە ئەوەی ئاخاوتن لەگەڵ كەسانێكی جیاوازو هەمە ڕەنگدا بكەن، ئەوانەی لەنێو ئەو بەزمەدا بەدوای تێگەیشتندا دەگەڕێن، دواتر وەكو پاشكۆ بۆ ڕووماڵكردنی ڕاستەوخۆ و خێرا بەردەوام بوون و سەرقاڵی پێشكەشكردنی پوختەی زنجیرەیەك ڕووداوی خێرابوون. هەندێك ڕووداو وەكو ڕووداوی گۆشەگیر چارەسەر دەكرێن بەلام پرۆسەی بەستنەوەیان لەگەڵ ڕووداوی دیكەی ڕابردوو و داهاتوودا ئەنجام دەدرێ.

بێجگە لە گۆڤارە هەواڵییە هەفتەییەكانیش، ڕۆژنامەكان بابەتی(پوختەكراو Wrap- up) پەیوەندیدار بەچیرۆكی هەواڵیی هەنووكەیی بلاودەكەنەوە كەخۆیان لە بابەتی كۆمەلایەتیی تەشریعی و كێشەی دادگاكان و هەڵمەتە سیاسییەكان و شتی تری هاوشێوەدا دەبیننەوە، لەچیرۆكی لەم جۆرەدا، پەیامنێری خاوەن ئەزموون بەدرێژایی چەند ڕۆژێك – بەزۆری بۆماوەی هەفتەیەك – خەریكی چارەسەركردنی ڕووداوەكان دەبێ و بابەت بۆ تەنیا یەك چیرۆكی هەواڵیی كۆدەكاتەوە، لێرەوە پرۆسەی بەجووڵەخستنی خەیاڵی خوێنەران و دیاریكردنی بنەماكانی پێكەوە بەستنەوە دەستپێدەكات. ماوەی هەفتەیەكیش بەسە بۆ

پێشکەشکردنی چەندین پوختەی چڕوپڕ دەربارەی پێشکەوتنی ڕووداو لەڕووی زەمەنییەوە. لەهەندێك حاڵەتی دیکەشدا بەپێویست دەزانرێ شرۆڤەکردن زیادبکرێ. لەم هەفتەیەدا لەوانەیە چاودێر بنووسێ بەهۆی ئەم زنجیرە ڕووداوەوە خەریکە ئامانجێك دەستەبەر دەکرێ، چاودێرێکی دیکەش لەوانەیە ڕوونیبکاتەوە کە ستراتیژیەتی بەرگریکردن ئاشکرا تر بووە دوای ئەوەی بەشێوەیەکی هەمە لایەنە گفتوگۆی لەبارەوە کراوە. بەرپرسێکی فەرمیش ئەگەر هەست بکات ڕۆژنامەوانێکی شارەزا چاودێری دەکات، ئەوا دوو هەنگاو بەرەو پێشەوە و یەکێکیش بۆ دواوە دەنێ، بەم جۆرە ئامانج ئەوەیە ڕووداوەکانی ماوەیەکی دیاریکراو لەچیرۆکێکی هەواڵیی هەمە لایەندا کورت بکرێنەوە. نووسەری تایبەتمەندیش بەنووسینی پوختە بەزۆری چاوێك بەڕووداوو زانیارییە کەڵەکەبوو و پەیوەندیارەکان بەهەموو پێشهاتێکدا دەخشێنێتەوە، تەنانەت ئەوانەی پێشتریش لە شێوەی ڕاپۆرتێکدا چارەی کردوون.

## ٢- ڕاپۆرتی گشتیی (Survey)

لەکاتی قەومانی چەند ڕووداوێکی هاوشێوەدا لەژمارەیەك شوێندا، دوورنییە ئەم شێوازە ڕۆژنامەوانییەی لەشوێنی ڕووداوەکەدا ئامادە دەبێت ڕوپێوێکی گشتیی ئامادەبکات بەمەبەستی ئاشکراکردنی ئەنجامی بارودۆخەکە و تەواوی ئەوەی ڕوویداوە.

لەوانەیە چەند هەوڵێك بۆ دارشتنی ژمارەیەك یاسای هاوشێوە لەچەند ویلایەتێکدا بدرێن و لەهەر یەکێك لەو هەوڵانەشدا ئەنجامی گرنگ بەدەستهێنرابن. ڕوودانی هەرجۆرە کارەساتێك لەشوێنێکی دیاریکراودا پێویستی بە ڕاپۆرتێکی گشتیی هەیە کەهەموو ئەو مەرجانە ئاشکرا بکات کە باوەڕ دەکرێ بووبن بەهۆکار، ڕۆژنامەکان ڕاپۆرتی ڕووپێویی هەمە لایەن ئامادە دەکەن لەپێناوی

دەستنیشانکردنی ڕێژەکانی مردن لەسەر ڕێگا نێودەوڵەتییە خێراکاندا یان بۆ دیاریکردنی دەرەنجامەکانی ڕاپرسییە گشتییەکان سەبارەت بەقەرزی خوێندنگاکان، یان بەکارهێنانی بەندکراوان لەپڕۆژە تایبەتیەکان یان هەڵوێستی بەندکراوان بەرامبەر بەسزای مردن یان ئاستی ئەو جیاوازییە ڕەگەزی و ئاینیەی لەکاتی نیشتەجێکردندا بەکار دەهێنرێ یان دەرفەتەکانی فێربوون و کارکردن و شتی تری لەوجۆرەدا.

هەندێك بابەت ئەگەرچی زۆر تازەش نین بەڵام لەوانەیە لەنوسینگەکانی لێکۆڵینەوەی گشتیی یان تایبەتی بەدەست هێنرابن. لەکاتی گەیشتنیشدا بە ئەنجامەکان لەهەرجۆرە بەڵگەیەکدا، دەبێ ڕۆژنامەگەریی و لێکۆڵەرەوە و چاودێرانی ڕای گشتیی نەکەونە هەڵەی نەگونجانی نموونەی ئامادەکراوەوە.

دروست نییە ڕۆژنامەوان بنووسێ ((ئەمڕۆ ڕای گشتیی لێرە بەم جۆرەیە و بەو جۆرەیە)) تەنیا دوای پرسیارکردن لەچەند کەسێکی شارەزا نەبێ، ئەگەر چی ئەمە شتێکە کەم ڕوودەدات. تەنانەت ئەو دیمانە بەکۆمەڵانەش کەڕۆژنامەوان لەناوچەیەکی دیاریکراودا ئەنجامیان دەدات، مەرج نیە نموونەیی و ڕەسەن بن. هیچ بوارێکیش نیە کەشارەزایان بتوانن لەبارەیەوە بەتەواوی ڕێك بکەون. پشت بەستن بەوتەی سەرکردەکان ڕۆژنامەوانییەکی باش و گونجاوە، بەڵام دەبێ پەیوەندیش بەکەمینەکانەوە بکرێ لەگەڵ دوورکەوتنەوە لەزیادەڕۆیی کردندا.

## ٣- پشکنینەکان (Investigations)

هەموو ڕۆژنامەیەك کەپێگەیەکی دیاریکراوی لەلای جەماوەرەکەی هەبێ، خۆی لەحاڵەتی داواکردنی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە و پشکنینی ئەم ڕوداو و ئەو ڕووداودا دەبینێتەوە، ئەمەش مانای ئاشکراکردنی ڕووداوەکان دەبەخشێ و دەشگوترێ بەرژەوەندی جەماوەر دەخوازێ کەئاشکرا بکرێن و ناسراوبن بەڵام کەسێك هەیە

هەوڵی شاردنەوەیان دەدات، ڕۆژنامەگەریی ئەمریکایش پڕیەتی لەنموونەی زۆر سەبارەت بەمەسەلەی لەو جۆرە و زۆریشییان بونە مایەی وەرگرتنی خەلاتی پۆلتیزەر و هی تریش، بەهۆی ئەو خزمەتانەی پێشکەشی جەماوەریان کردوون. لەوانەشە فەرامۆشکردنی فرۆشیارانی زانیاریی‌یە نهێنییەکان شتێکی گونجاو نەبێ، ئەگەر چی بێ متمانە و خاوەنی هەڵسوکەوتی سەرنج ڕاکێش و نامۆش بن.

لەوانەشە ئەو پۆلیسەی کە دراوسێکەی نازانێ چۆن توانیویەتی ئۆتۆمبێلێکی بەهاداربکڕێت، برە پارەیەکی زۆری بەمیرات بۆ مابێتەوە، لەلایەکی دیکەوە دوورنیە دەوڵەمەندبوونی ئەو پۆلیسە دەرگایەك بێ بۆ ئاشکرابوونی شتێك کەجگە لەو (پۆلیس)ە خەڵکی دیکەش بگرێتەوە.

پەیامنێری پشکنەر (Investigation Reporter) جگە لە هزرێکی زیندوو و شیاو بۆ گەڕان و لێکۆڵینەوە و شارەزایی لەوبوارەی تیایدا لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدات، پێویستی بەسیفەتی تایبەتی نییە، زۆرکەمیش ڕێکدەکەوێ پەیامنێری پشکنەر ڕۆڵی پۆلیسی نهێنی بگێڕێ و بەنهێنی چاودێری خەڵك بکات، بەپێچەوانەوە، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا ڕۆژنامەوانیی پشکنەر لێکۆڵینەوەکەی دەباتە تۆمارە گشتییەکان و لەوێ زانیاریی دەربارەی ئەو کەسایەتییانە وەردەگرێ کەگفتوگۆیان لەگەڵدا دەکات، لەڕۆژنامەگەریی چاپکراویشدا زیاتر ئەو زانیارییانە لەخۆیان دەدوێن.

شتێکی لەم جۆرە دەکرێ بۆ ئەو ئەرکە بگونجێ کە بە ئێدوارد کوین، نووسەری هەڕاڵیی لەڕۆژنامەی ((Wall Street Journal)) سپێردرا و لەبەرامبەردا بەهۆی ڕووماڵکردنی کێشە گشتییەکانەوە خەلاتی پۆلیتزەری وەرگرت. ڕۆژنامەکە ئەرکی کوین– ی بەم جۆرە کورتکردۆتەوە:

((ئێدواردکوین لەو چیرۆکەدا ئاشکرای کرد کارل شانکز کەئەوکاتە بەڕێوەبەری کۆمپانیای برۆد ناشناڵی ئەمریکی بوو، لەبارودۆخێکدابوو کە تیایدا بەهۆی پەیوەندییە کەسییەکانی لەگەڵ کۆمپانیای جۆرجیا باسیفیکدا، بانگەشەی بۆ

دابەزینی داهاتەکەی کرد، ئەو کاتە شانکزبەڕێوەبەری جۆرجیا باسیفیك بوو کەلەماوەی پێنج ساڵدا بڕی ٥٠ ملیۆن دۆلاری بەقەرز لەکۆمپانیای برود ناشناڵ وەرگرتبوو.

چیرۆکە هەواڵییەکە ئەوەشی ئاشکرا کرد کەچۆن شانکز ١٣ هەزار ئیکەری لەدارستانەکانی ئۆرگۆن کڕیوە و ڕاستەوخۆ بەهەمان نرخ بەکۆمپانیای جۆرجیا باسیفیکی فرۆشتۆتەوە، ئەمە جگە لەخەرجییەکانی کڕین و فرۆشتنەکە.

شانکز بەهۆی قەرزێك بەبڕی ٣,٩ ملیۆن دۆلار کۆمەکی ئەم مامەڵەیەی کردووە، بەو پێیەش سوودەکانی ئەم قەرزە دەبن بەدابەزاندنێکی باجیی، بۆیە ناوبراو توانی ٤٠٠ هەزار دۆلار لەو باجانە بشکێنێ کەبۆماوەی ٥ ساڵ بەرامبەر بەقەرزەکە بەسەریدا سەپێنرابوون.

ئەگەرچیش شانکز جەخت لەسەر نەبوونی هیچ شتێکی غەیرە ئەخلاقیی لەو مامەڵەیەدا دەکاتەوە، بەڵام دواتر سوودی کۆمەککردنی مامەڵەکەی لێ قەدەغەکراو ئەویش دەستلەکارکێشانەوەی خۆی لەکۆمپانیای برود ناشنال ڕاگەیاند و دووپاتی کردەوە کەهۆکاری ئەو هەنگاوەی (هەردوو ئەو مامەڵە زۆر ناسراوە)بوون کەلەگەڵ کۆمپانیای جۆرجیا باسیفیکدا ئەنجامی داون.

لەلایەکی دیکە، چیرۆکەکە ئەو مامەڵە کەسییانەشی ئاشکراکرد کە هەریەکە لەئۆین چتمانی بەڕێوەبەری کۆمپانیای جۆرجیا باسیفیك و جۆن برانیزی جێگری بەڕێوەبەر لەگەڵ کۆمپانیاکەدا ئەنجامیان دابوون. ماوەیەکی کەم دوای بڵاوبوونەوەی چیرۆکەکە، کۆمپانیای جۆرجیا باسیفیك رایگەیاند کە بەرهەمەکانی کۆمپانیای بلای وودی کڕیونەتەوە، ئەو کۆمپانیایەی براندیزو هەندێك لەئەندامانی خانەوادەکەی خاوەندارییی دەکەن. ڕۆژنامەی وۆڵ ستریت جۆرناڵیش هەندێك گرێبەندی دیکەی کۆمپانیای جۆرجیا باسیفیکدا بڵاوکردەوە، ئێستاش کۆمپانیای بلای وودی لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراو ڕووبەڕووی داواکاریەکی قەرزایی بۆتەوە کەلەلایەن خاوەن بشکەکانەوە (الاسهم) بەرزکراونەتەوە و پێیان وایە کەلەکاتی کڕینەوەی

بەرهەماکانی بلای ووددا، جۆرجیا باسیفیك زیاتر لەدوو ملیۆن دۆلاری بەبراندیز و هاوکارەکانی بەخشیوە.

ئێدوارکوین جگە لەئەنجامدانی چەند گفتوگۆیەك لەگەڵ شانکز لەنیوجرسی و چەند بەرپرسێکی کۆمپانیای جۆرجیا باسیفیك لەئۆرگۆندا، چەندین کاتژمێریشی لەپشکنینی تۆمارەکانی نیویۆرك و چەند بنکەیەکی دیکە لەکەرتی ئۆریگۆندا بەسەر برد، لەهەردوو قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەو رووماڵکردنی چیرۆکەکەشدا رای سکرین ـی بەرێوەبەری نووسینگەی رۆژنامە لە پۆرتلاند یارمەتی کوین ـیدا.

هەموو لێکۆڵینەوەکانیش ئەم جۆرە ئەنجامانەیان لێ ناکەوێتەوە، بگرە هەندێك جار پێچەوانە دەبنەوە. لەوجۆرە حاڵەتانەشدا بەرژەوەندیی گشتیی دەخوازێ ئەوە روون بکرێتەوە کە پروپاگەندە و تۆمەتبار کردنەکان راست نین. پەیامنێریش بۆئەوەی لەمیانەی لێکۆڵینەوەیەکی ئاساییدا خۆی دەرباز بکات، نابێ بەبێ رەخنەو شیکردنەوە هەموو ئەو زانیارییانە قبووڵ بکات کەلایەنە پەیوەندیدارەکان پێشکەشی دەکەن، بەڵکو دەبێ راستەوخۆ تێبینی شتەکان بکات زانیاریی و بۆچوونە پێچەوانەکانی نێو بەیاننامە و لێدوانەکان بپشکنێ، هاوکات دەبێ خۆی دوور لەئامادەبوون بۆ شەرکردن رابگرێ ، ئەمەش بۆئەوەی وا پیشان نەدات کەهەوڵی (تێوەگلاندنی) ئەو کەسە دەدات، هەروەها دەکرێ ئەمانەی خوارەوەش بخرێنە سەر ئەو رێنماییانەی ئاراستەی پەیامنێری پشکنەر دەکرێن: هەمەلایەن و بیرکراوە و هۆش فراوان و دادپەروەریە.

## ٤- کردەوە سەرنج راکێشەکان (Stunts)

زۆرجار پشکنین لەناوەوە باشترین شێواز دەبێ، ئەدگار ماین لەرۆژنامەی (Evening News) خەلاتی پۆلیتزەری بەرامبەر زنجیرەیەك بابەت پێ برا کەدوای سێ مانگ کارکردن دەربارەی ژیاننامەی فەرمانگەی (ئیرکاونتی)

خۆشگوزەرانی کۆمەلایەتیی ئامادەی کردبوون. تید سمارت – یش لە ڕۆژنامەی (Daily News) کەلەشیکاگۆ دەردەچیٚ چەندجار دەستخۆشی لیٚکرا بەرامبەر بەئاشکراکردنی ئەو بارودۆخانەی کەلەشیکاگۆ برۆدویل بلاوەیان کردبوو، لەکارەکەیدا خۆی وەك کەسیٚکی مەست و سەرخۆش پیٚشاندابوو، لیٚکۆلینەوەکانی ئیدوارد ولیامزیش لەڕۆژنامەی (Journal) بوونە هۆی دەستپیٚکردنی چەندین لیٚکۆلینەوە فەرمی، ولیامز وەك کەسیٚکی پەرتەوازە و سەرخۆش توانیبووی دە ڕۆژ لە بەندیخانەیەکی چاکسازیدا بەسەر ببات.

ژمارەیەك پەیامنیٚری دیکەش توانیویانە وەك پاسەوان و یاوەر لەبەندیخانە و نەخۆشخانەی تایبەت بەنەخۆشییەکانی عەقلٚ و دامودەزگای گشتیی دیکەدا کاربکەن. بسوونی شسویٚنە ناشەرعییەکانی (ڕەهنکردن)یش لەڕیٚگەی چەند پەیامنیٚریٚکەوە ئاشکراکران، ئەوان ئەرکی ناسینی ئە و کەسانەیان پیٚ سپیٚردرابوو کە ڕوودەکەنە ئەم شویٚنانە.

بەهۆی سکالای مامۆستایانیشەوە لەوەی هەلسوکەوتی خویٚندکاران وەك خۆی نەماوە، ئەو پەیامنیٚرانەی خاوەنی بەلگەنامەی پیٚویستن توانیان خۆیان بخزیٚننە نیٚو پیٚگەکانی فیٚرکردن یان لەهۆبەکاندا دابنیشن بۆئەوەی تیٚبینی ڕاستەوخۆیان دەستگیر بیٚ. دەرفەتەکانی ڕۆژنامەگەرییەکی (نهیٚنی) لەو جۆرە سنووری نییە.

لەزۆر حالەتیشدا کەسیٚکی فەرمی شیاو و گونجاوی وەك دادوەر یان پسپۆڕی کۆمەلایەتیی ئەم ئەرکە سەرنج ڕاکیٚشە جیٚبەجیٚدەکات، ئەمەش زیاتر لەپیٚناوی بەخشینی مۆرکی شەرعییەتە بەم هەلوسکەوتە. هەندیٚك جاریش لەپیٚناوی دەستەبەرکردنی ئەو ڕەخنانەندان کەئاڕاستەی کەسی بەرتەلەکەوتوو دەکریٚن. بیٚگومان بەرپرسیاریەتیٚکی گەورە کەخۆی لەبەدەستەوەنەداندا دەبینیٚتەوە، لەبەرژەوەندیی چیرۆکی سەرنج ڕاکیٚشدا وەبەرنەهیٚنریٚ. پەیامنیٚر و ڕۆژنامەش لەهەلویٚستیٚکی لاوازدا دەمیٚننەوە ئەگەر بنەماکانی خوڕەوشتی ڕۆژنامەوانیی نەپاریٚزن.

## ٥- هەڵوێست و خواستەکان Situations And Trends

دوای ئـەوەی سەرنووسـەر بابـەتێك لـە گۆڤـارێكی نەتـەوەیی‌دا دەخوێنێتـەوە، بیرۆكەیەكی لەلا دروست دەبێ، پاشـان پـەیامنێرێك ڕادەسپێرێ بـەوەی زانیـاریی‌ی سـەبارەت بەئاسـتی بڵاوبوونـەوەی دیـاردەی ئەنجامـدانی دووكـار لەناوچـەكەدا كۆبكاتەوە.

هەندێك سەرنووسەر هەوڵیانداوە بكەن بەوەڵامی هەنـدێك پرسیاری وەك : (( لـە توانامانـدا هەیـە چـی بكـەین بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی زهنیـەتی دواكەوتووانـە لەشارەكەماندا؟)) و ((چی بكرێ سەبارەت بەلادانی كچانی هـەرزەكار؟)) و (( ئـاخۆ هیچ سەوزە فرۆشی دیكەی بێ لایـەن مـاوە ؟)) و ((چـی بەسـەر ژیـانی ئاسـاییماندا دێ؟)).

زۆرجـار ئـەو جـۆرە ئەركانـە دەبنـە مایـەی نووسـینی چـەند بابـەتێكی گـرنگ كەپەیوەنـدییان بەكـەس یـان هەنـدێك گرووپـی نەناسـراوەوە دەبـێ، دەرەنجـامی كۆتاییش ئەوەیە كە زیاتر شارەزای لایەنەكانی ژیانی ئەم گرووپە دەبێت.

بـەبێ وەرگرتنـی ئامادەییـەكی تـەواویش نـابێ پـەیامنێر هـەوڵی جێبـەجێكردنی ئـەركی لـەم جـۆرە بـدات، ئامادەییەكـەش تـەنیا چاوخشـاندنەوە نییـە بەئەرشـیفی ڕۆژنامەدا، بەڵكو خوێندنەوەی ئەو كتێب و بابەتانـەی كەلـە گۆڤـار و بڵاوكراوەكـانی تردا بڵاوكرانەتەوە، بۆئـەوەی پـەیامنێر بەچاكی شـارەزای هـەموو لایەنـەكانی ئـەم هەڵوێستە بێ كەلەكاتی جێبەجێكردنی ئەركی كۆكردنەوەی زانیارییەكاندا دەیخاتە هزری خۆیەوە.

كـاتێكیش پـەیامنێر ڕووبـەڕووی كەسـێك دەبێتـەوە كەهـەڵگری بیروبۆچـوونێكی جیاوازە لەگەڵ ئەوانـەی پـەیامنێر بەڕاسـتیان دەزانـێ، بێگومـان لەسـەریەتی خـۆی

لەشەڕە قسە دوورخاتەوە و لەجیاتی ئەمە داوا لەسەرچاوەی زانیارییەکانی بکات کەبەپێی تێگەیشتنی خۆی قسە لەسەر بیروڕای دیکە بکات.

پەیامنێری بەتوانا و هۆشیاریش دەبێ بگاتە ئەو ئەنجامەی کەئەوەی لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکا تەنیا دیاردەیەکی خۆجێیی نییە بەڵکو بەشێکە لەئاراستەیەکی گشتیی بەرفراوان. بۆ نموونە، جوتیارانی نیشتەجێی دەوروبەری شار لەوانەیە زەویەکانیان بەبێ کێڵان و چاندن بهێڵنەوە و چاوەڕێ بکەن بەوانەی بفرۆشن کەلەبواری پێشخستنی شارەکاندا کاردەکەن.

هەندێك کێشەی وەك: مشتومڕی ڕەگەز پەرستیانە لەبواری زەویوزار و مانگرتن و پشتگیریکردن و هەڵسوکەوتی گەنجان لەخوێندنگاکان و یارییە تازەکان و جلوبەرگ و مۆسیقا و شتی تری لەوبابەتەدا، ئەوانەن کەدەکرێ خاوەنی بواری نەتەوەیی یان نێودەوڵەتی بن. ڕووماڵکردنی ناوخۆییش دوورنییە جەخت لەسەر مۆرکی ناوخۆیی دیاردەکە بکاتەوە، بەڵام ڕووماڵکردنەکە تەواو نابێ ئەگەر ئاماژە بەلایەنە فراوانترەکان نەکرێ.

ئوراسپاید، سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ ڕۆژنامەی (Courier Journal) زامن کرد کاتێك لەو پێکدادانانەی کۆلیەو کەلەنوێ باندە پێشبڕکێکەرەکانی تیمەکانی تۆپی بالە لە نێوەندەکانی خوێندکارانی دواناوەندییەکاندا ڕوویاندا، ئەمەی خوارەوە چەند برگەیەکن لەبابەتی یەکەمی سپاید، دەریدەخەن ناوبراو چۆن ئەم ئەرکەی بەجێ گەیاندووە و چۆن وەك پەیامنێرێکی ئاگادار و پسپۆر نووسیویەتی، بەو پێیەی سپاید پێشتر بەرلەوەی ڕووبکاتە بواری ڕۆژنامەوانیی وەك پسپۆرێکی کۆمەڵایەتیی کاری کردووە.

### وەرزشەوانان

زیادە ڕۆیی لەجەختکردنەو لەسەر وەرزشەوانان یەکێکە لەو دەرەنجامانەی کەتازەنین.یاریەکی تۆپی بالە لەخوێندنگایەکی دواناوەندیدا بوو بە ڕێوڕەسمێکی

سۆزدارییانە، کەتاڕادەیەکی زۆر لەڕێو ڕەسمێکی سیحری دەچێ. جەماوەرێکی زۆر لەنێو چەند هۆڵێکی بچووکدا کۆکراونەتەوە، بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ورەش دەهۆڵ دەکوترێن و چەندین کچی جوان و بەتەمەن بچوکیش ئامادەن. گیانی وەرزشی بەئاشکرا بەدی دەکرێ، وەك سڵاو لەیەککردن بەر لەدەستپێکردنی یاری، بەڵام پێشێلکردنی ئەو هەستە ئاسانە، تەنانەت ئەگەر لەبەر هۆکارێکی کەمیش بێ.

هاندەران باسی تیمە ناوخۆییەکەیان دەکەن. ڕاستی ئەوەش کەجەماوەر بێلایەن نییە، وادەکات مرۆڤ چاوەڕێی پێشبڕکێیەکی نانوەرانە نەکات.

## وروژاندنی هەست و سۆزەکان

ترۆپکی سۆزداریی، لەسەر ئاستی خوێندنگا و بەر لە دەستەپێکردنی یاری لەڕێگەی (کۆمەڵەی چالاکییەکان)ەوە دەستەبەر دەکرێ، مامۆستایانیش ئەمە بە (شەڕێکی پێویست) دەزانن.

مامۆستایەکی زانستە دەروونییەکان دەڵێت: ئەو ئەنجوومەنانە بریتین لە (لێکۆڵینەوەیەکی تەواو لەبواری زانستی دەروونیی جەماوەریی)دا.

پرسیاری بنەڕەتیش ئەوەیە: لەکوێ و کەی واز لەگیانی خوێندنگا دەهێنرێ و هیستریا دەست پێدەکات؟ ماوەیەکی درێژە چەمکی وەرزشی لەخوێندنگا دواناوەندییەکاندا لەدەستدراوە و پێویستی سەرکەوتن شوێنی گرتۆتەوە. ڕاهێنەران پلان دادەڕێژن و سیستمی گونجاویش بۆ زامنکردنی سەرکەوتنی تیم بەرهەم دێنن. دواتر ڕاهێنەر دەبێتە قوربانیی بۆ هەڵسەنگاندنی تەلەفزیۆنەکان و ئاراستەی بەرافراوانکردن و، قوڵکردنی شکست پێهێنانی بەرامبەریش سەرهەڵدەدا لەپێناوی مسۆگەر کردنی دەستخۆشی و پایەیەکی بەرزتردا.

چاکەی دۆڕاندنمان بەتەواوی لەدەستداوە، کچانی خوێندنگاکان دەگرین و کاتێك تیمەکەیان دەدۆڕێ وەك بڵێی کارەساتێك ڕوویداوە، باوکانیش گلەیی لەئاستی

شیاویی ڕاهێنەران دەکەن، بەڵام دەربڕینی ناڕەزایی سەبارەت بەزیادەڕۆیی کردن لەدەرخستنی وەرزشەوانانندا بەس نییە، لەبەرچی ئەم زیادەڕۆییە دەکرێ؟

هەندێك کەس بە ئەنجامی ڕاستەوخۆی شارستانیەتی دەزانن. کۆچکردنی بەکۆمەڵی ئەم دواییانە بۆ شارەکان و هەوڵدان بۆ نیشتەجێبوون لەدەوروبەردا، کۆمەڵگایەکیان بەرهەم هێناوە کەبەدەست گۆشەگیریی لەناو جەماوەردا دەناڵێنێ (A Lonely -in-the-ground Society) جگە لەوە خوێندگایەکی گەورەیان دروست کردووە کە زۆر کەس بەهۆکاری سەرەکیی چەندین کێشەی دەزانن.

## خوێندنگایەکی گەورە

خوێندنگایەکی دواناوەندی لە دەوروبەری شاردا کە ٢٥٠٠ خوێندکار دەگرێتە خۆی، دروست وەك کۆلێژێکی دوێنێ وایە. ئێرل دنکان، بەڕێوەبەری دواناوەندی ڕۆکەر (٢٦٠٠ خوێندکار) باسی هەندێك لەو کێشانە دەکات:

((لەدواناوەندییەکدا کە ژمارەی خوێندکارانی ٢٦٠٠ کەسە، تەنیا ١٢ خوێندکار دەتوانن لەتیمی تۆپی بالەدا یاری بکەن. بێگومان ژمارەیەکی زۆری خوێندکاران دەخوازن یاری بکەن. لەساڵی دەرچوونیشدا لەنێو ٣٥٠خوێندکاردا تەنیا پێنجیان بۆ نووسینگەکان هەڵدەبژێردرێن، بزانە ژمارەی ئەوانە چەندە کە دوور دەخرێنەوە)). ئەمە حاڵەتی ونبوونە لەخوێندنگا دواناوەندییە گەورەکاندا.

هەفتەی ڕابردوو خوێندکارێك لەخوێندنگایەکی گەورەی دەوروبەری شاردا بەکۆمەڵێك نمرەی کەمەوە گەڕاوەتەوەو ماڵەوە، بەدایکی گوتووە ((لەوەرزشدا باش نیم ... و ئەندامی تیمی خوێندنگا نیم و ناتوانم شتێك لەڕۆژنامەی خوێندنگادا بڵاوبکەمەوە، بۆیە هەموو شتێکم لەدەستداوە)).

زۆربەی گەنجان ئەگەر شتێك نەدۆزنەوە بەشداری تیادا بکەن، ئەوا وەك یەدەگ بەشداری دەکەن، وەك چۆن پسپۆرانی زانستە دەروونییەکان دەڵێن: خوێندنگا شوێنێکە خوێندکاران دەتوانن ئینتمایان بۆی هەبێ، شوێنێکە ناسنامەیان پێ دەبەخشێ، بۆیە دەبنە هاندەری توندڕەوو لایەنگری و دەمارگیر.

## لافاو

بەڵام بەشداری نەکردن نابێتە هۆی تێرکردن، بۆیە جگە لەلایەنگرتنی بەهێز دەرفەتێکی گەورە بۆ چالاکی عەقڵی نامێنێتەوە، لەوانەشە ئەمە توندوتیژی لێ بکەوێتەوە، ئەگەرچی ئەوان ئەم هەڵسوکەوتە یان بەبەرگریکردن لەشەرەفی خوێندنگا یان تۆڵە سەندنەوە لەدۆڕاندنی یاریەك لێکدەدەنەوە.

لەخوێندنگا گەورەکانیشدا نائارامی بەشێوازێکی جیاواز لەوەی ئەنجرومەنی چالاکییەکان بەکاری دێنن، بەدی دەکرێ و تیایاندا شێوازە گونجاوەکان پشتگوێ دەخرێن.

دنکان ــی بەڕێوەبەر دەڵێ : کاتێك تەنیا یەك هۆڵی وەرزشی بۆ تیمە سەرەکییەکان تەرخاندەکرێ، هیچ شوێنێکی دیکە بۆ یاریکردنی گەنجان نامێنێتەوە، بۆ وەدیهێنانی زۆرترین سوودیش لەو هۆڵە، هەوڵی ڕێکخستنی کاتەکانی یاریکردن دەدەین.

لەکاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا سەیرێکی ئەو خوێندنگایانە بکە، چەند ڕیزێکی دوورودرێژی خوێندکاران لە کافیتریاکاندا بەدی دەکەین، نەتوانینی پێشکەشکردنی خواردن (بەیەکجار) بەخوێندکاران، مانای ئەوەیە کە دەبێ ئەم ئەرکە بەچەند ـ ـاڕێك جێبەجێ بکرێ. خواردنی نانی نیوەڕۆ پێویستی بە ٢٠ خولەك هەیە، بەڵام خوێندکار کەبڕە خواردنەکەی وەردەگرێ پێویستی بە ١٠ خولەك هەیە تا دەیخوا، بۆی

ـ ناچار ددبێ لەترسی دواکەوتن لەوانەی داهاتوو، خواردنەکەی بەپەلە بخوا.

## جیاوازییەکە گەورەیە

ئەو بارودۆخە هەنووکەییە لەگەڵ ڕابردوودا بەراورد بکە، ئەوکاتەی خوێندکاران خواردنیان لەگەڵ خۆیاندا دەهێنا و بەخۆشیەوە دەیانخوارد و کاتژمێرەکانی نانی نیوەڕۆشیان بەدانیشتن لەژێر سێبەری داروبە یاریکردنەوە بەسەردەبرد.

ئەمەش مانای وایە خوێندکارانی ئەمڕۆ ڕۆژانە حەوت کاتژمێر خوێندنیان بەسەردا دەسپێنرێ لەگەڵ کاتێکی کەمی پشووداندا، زۆر کەمیش ڕێکدەکەوێ لەچوارچێوەی سەرپەرشتیکردن دەربازیان ببێ، ئێستا تەنانەت خەلۆەتیش بۆتە یاری چاودێریکردن. لەهەندێك خوێندنگاشدا خوێندکاران بەرامبەر بە هەڵسوکەوتکردن لەتۆتەتانی نانخواردندا نمرەیان پێ دەدرێ، پاشان ئەرك (وەزیفە) دەست پێدەکات، ئەگەر چی هەموو کاتێك ئەرك هەبووە بەلام بەلای خوێندکارانەوە مامۆستاکانیان لەمیانەی ئەو ئەرکانەدا کەپێیان دەسپێرن، هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو درزە دەدەن کەلەبواری موشەکسازییدا لەگەڵ ڕووسیادا هەیە، لەبەرامبەریشدا خوێندکاران نەوەك لەڕێگای فێربوونەوە بەلکو تەنیا بە جێبەجێکردنی ئەرکەکە وەلام دەدەنەوە.

جێبەجێکردنی وەزیفەش مانای مانەوەیە بۆ کاتێکی زیاتر لەژێر سەرپەرشتی و چاودێریکردندا، ئەم جارەیان لەلایەن دایك و باوکێکی نیگەرانەوە کەچاویان لەڕاپۆرت و نمرەی باشە بۆ منداڵەکانیان. لێرەوە دەردەکەوێ: خوێندکارانی ئەمڕۆ لە هەمو کاتێك زیاتر بەدەستی نائارمییەکی توندو بەهێزترەوە دەناڵێنن، دەرفەتی کەمتریشیان هەیە بۆ نەهێشتنی ئەو نائارامییە.

## پێڕست